ناوی کتێب: هەقایەتی بەغدایی

تۆمارکردن و نووسینەوەی: ئەب ئەنستاس ماری کەرمەلی

ئامادەکردن و داڕشتنەوەی بە عەرەبی ستاندارد: د.داود سلوم

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: عەزیز گەردی

دەرهێنانی هونەری ناوەوەو بەرگ : خەلیل هیدایە مام شێخ ( ٤٢٦٣ ٤٩٢ )

چاپی: یەکەم ٢٠١٢

شوێنی چاپ : چاپخانەی ڕۆژهەڵات-هەولێر ( ٤٦٣٩٥٣١ )

نرخ: (٦٠٠٠ ) دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردن( ١٢٢٣) ساڵی ٢٠١١

## لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاوێر هەولێر / ژمارە ( ٧٩ )

**تێبینی:**

هەقایەتەکانی ئەم کتێبە، لە عەرەبییەکەدا تەنیا ژمارەیان بۆ دانراوە (١،٢،٣...،)، ناویان بۆ دانەندراوە. وەرگێڕی کوردی، بە پێی ناوەڕۆکی هەقایەتەکان، ناوی بۆ داناون.

# ناوەڕۆک

# ١ـ سوڵتان نەسیم

هەبوو نەبوو...

ئافرەتێك هەبوو، نە سکی دەبوو نە منداڵ. گوتی: ئەگەر سکم بوو و خوا منداڵێکی پێ بەخشیم، جلی لای (بێخەم)ێك دەدوورم. خوا کردی منداڵێکی بە سکی کەوت. بە دوای (بێخەم)ێکدا گەڕا بۆ ئەوەی جلی منداڵەکەی لە لا بدووریّ. گەڕا تا دۆزییەوە. چووە ماڵیان. دانیشت بۆ ئەوەی جلەکە بدووریّ سەیری ئەم لاو ئەو لای خۆی کرد، دیتی گورزە شواڕێك لەناو تەشتە ئاوێك داندراوە. کابرایەك هات ژنەی (بێخەم)ی بەستەوەو بە شواڕان وەریگەڕایێ. ڕۆژێ، سێ جار لێیدەدا: بەیانی سەد داری لێدەداو نیوڕانێ سەد داری لێدەداو ئێوارێ سەد داری لێدەدا.

ژنەکە گوتی: من بۆ جل دوورین هاتم کەچی چیم بە چاوی خۆم دی! بە ژنەکەی گوت:

– پێیان گوتم تۆ (بێخەم)ی. پێم بڵێ هەقایەتی تۆ چییە؟

ژنەی خانەخوێ پێی گوت:

ـ گوێ بگرە پووری! ڕۆژێ، لەگەڵ مێردەکەمدا لە ژوورەوە دانیشتبووین، ترێی ڕەشمان لە ناو سینی سپی دەخوارد. پێم گوت:

– پیاویژگە، سەیرکە ئەم دوو ڕەنگە: سپیو ڕەش، چەند جوان لێك دێن!!

پێی گوتم:

– مانای وایە تۆ ئەشقی قوولەڕەشێك بووی!

لەو ڕۆژەوە، هەموو ڕۆژێ سێ سەد دارم لێدەداو منیش نە بە دایکم دەڵێمو نە بە هیچ کەس. نهێنییەکەم لە ناو سینگی خۆم پاراستووە. هەموو ڕۆژێ کە لێم دەدا، پێم دەڵێ: ئایا هیچ سواری ئازای وەکوو من هەیە؟. منیش دەڵێم: نەخێر، نییە. کاتێ، ئافرەتەکە گوێی لەم هەقایەتە بوو، بە ژنەی خانەخوێی گوت:

ئەگەر ئەو جارە هاتە لاتو گوتی: ئایا هیچ سواری ئازای وەکوو من هەیە؟ پێی بڵێ: بەڵێ هەیە! ئەگەر گوتی کێیە؟! بڵێ سوڵتان (نەسیم)ە!

کابرا ڕۆژاوا هاتەوە، دەستی بە لێدانی ژنەکەی کرد. کە لە لێدانی بووەوە پێی گوت:

ئایا هیچ سواری وەکوو من ئازا هەیە؟

ژنەکە گوتی:

. بەڵێ!

گوتی:

کێیە؟

گوتی:

– سولتان نەسیمە!!

کە کابرا ئەمەی گوێ لێبوو، گوتی:

حورمێ، هەستە کەلو پەلی پێویستیی سەفەرم بۆ ئامادە کە. ژنە کەلو پەلی پێویستیی سەفەری بۆ ئامادە کرد. کابرا هەڵی گرتو ڕۆیشت. لە هەورازان هەڵکشاو لە نشێوان داکشا تا گەیشتە ئەو شوێنەی سوڵتان نەسیمی لێ بوو. پرسیاری سوڵتان نەسیمی کرد، نیشانیان دا. چوو لایدایەماڵیو شەو لە کنی مایەوە. بەیانی، سوڵتان نەسیم چووە ناو تەویلەو چاوی بە ئەسپەکاندا گێڕاو بانگی کرد:

میر غەزەب! وەرە لە سەری مەیتەر بدە.

میر غەزەب لەسەری مەیتەری دا.

ڕۆژی دووەم، سولْتان نەسیم دیسان بەیانی چووە ناو تەویلەو سەیری ئەسپەکانی کردو بانگی کرد:

. میر غەزەب! وەرە لە سەری مەیتەر بدە.

ڕۆژی سێیەمیش لە سەری مەیتەرێکی تری دا.

میوانەکەش هەموو ڕۆژێ تەماشای دەکردو ئەو ڕووداوەی بە چاری خۆی دەدی.

ڕۆژی سێیەم، کابرا بە سولْتان نەسیمی گوت:

. جەنابی سولْتان، دلْم شەقی برد! ئەوە مەسەلە چییە؟! تۆ هەموو ڕۆژێ لە سەری یەکێ دەدەی؟

سولْتان نەسیم پێی گوت:

. جوانوویەکم هەیە باش خزمەتی ناکەن. هەموو ڕۆژێ شەکەتو ماندووی دەکەن.

کە میوانەکە ئەمەی بیست، بە سولْتان نەسیمی گوت:

. ئەمشەو، من دەبمە مەیتەر.

کابرا جلی ئیشی کردە بەرو چووە تەویلە. کە عیشا داهات، دیتی ئافرەتێك هاتو قیژاندی:

. مەیتەر وەرە!

کابرا گوتی:

. بەلْێ هاتم!

ژنەکە پێی گوت:

. جوانووەکەم بۆ زین کە بۆ ئەوەی سواری بم.

کابرا جوانووەکەی زین کردو خۆیشی سواری جوانوویەکی دی بوو. بە دوو قۆلْی ڕۆیشتن. ژنە لە نواوەو کابرا لە دواوە. گەیشتنە چۆلْو بیابان. ژنەکە بە کابرای گوت:

. جوانووەکە لێرە ببەستەوە. من هەتا ئەوێ دەچم، هەر ئێستا دێمەوە.

کاتێ کە ژنەکە ڕۆیشت، کابرا بێ ئەوەی وا بکا ژنە هەست پێ بکا، دوو بە دووی چوو. ژنە هەر ڕۆیشت...ڕۆیشت تا گەیشتە ئەشکەوتێك. چووە ژوورەوە. کابراش بە دوایدا چوو، تەماشای کرد داخۆ چ دەکا. دیتی چل دێو چاوەڕێی ژنەکەیان دەکرد. کە چاویان پێ کەوت، گوتیان:

. ئەوە بۆ دواکەوتی؟

ژنەکە گوتی:

. ئیشێکم هاتە پێش.

تا بەیانی خەریکی گەمەو سوحبەتو ڕابواردن بوون. بەیانی پێش ئەوەی ژنەکە بێتە دەرەوە، مەیتەر هاتە دەرەوە. چووە ئەو شوێنەی کە ژنە پێی گوتبوو لێرە بوەستە. کە ژنەکە هاتەوە، بە کابرای گوت:

. مەیتەر!

کابرا گوتی:

. بەڵێ

ژنەکە گوتی:

. هەستە سواری جوانووەکەت بە بچینەوە ماڵێ.

کابرا هەستا. ژنە سواری جوانووەکە بوو و ئەویش سواری جوانووی خۆی بوو. هاتن تا گەیشتنەوە ماڵێ. ژنەکە چووە ژووری خۆیو مەیتەریش چووە تەویلە. ماینەکە ئەوەندەی غاردابوو، کابرای شلو شەکەت کردبوو! هەر سەری لەسەر سەرین دانا، خەوی لێکەوت! بەیانی، سوڵتان وەکوو هەموو ڕۆژێ هاتو لە ئەسپەکان ورد بووەوە. دیتی دوو جوانووەکە شەکەتن. بانگی کرد:

. کێ مەیتەرە؟

پێیان گوت:

. ئەو میوانەی ئەو ڕۆژە هاتە لات.

ئەوان لەو قسانەدابوون، مەیتەر بە خەبەر هات. سەری لە ڕووداوی ئەو شەوە سوڕمابوو. سوڵتان بانگی کردو پێی گوت:

. ئەی فلان، بۆچی باش خزمەتی ئەسپەکانت نەکردووە؟

کابرا، کە ئەمەی بیست، بە سوڵتانی گوت:
. سوڵتان، هەقایەتێکم بۆ تۆ پێیە. تۆ هەموو ڕۆژێ لە سەری یەکێك دەدەی، کەچی ژنەکەی خۆتە ئاوها و ئاوها دەکا.
هەقایەتەکەی لەسەری هەتا بنی بۆ سوڵتان گێڕایەوەو پێی گوت:
ئەگەر باوەڕ ناکەی، سبەی شەو جلی مەیتەری لەبەر بکەو خۆت بکە مەیتەر، شتەکە بە چاوی خۆت دەبینی.
سوڵتان ئەو ڕۆژە زۆر دڵتەنگ و پەشۆکاو بوو. عیشا داهات. سوڵتان هەستا جلی مەیتەری کردە بەرو چوو لە ناو تەوێلە دانیشت و چاوەڕێی کرد.
یەکسەر ژنەکەی هات و بانگی کرد:
. مەیتەر، هەستە ئەو دوو جوانووە ماینە زین کە.
سوڵتان زوو دوو جوانووە ماینەکەی زین کرد. ژنەکە سواری جوانوویەك بوو و سوڵتانیش سواری جوانووەکەی تر بوو. ڕۆیشتن تا گەیشتنە ئەو شوێنەی ئەسپیان لێ دەبەستەوە. وەکوو میوانەکە بۆی باس کردبوو. ژنەکە پێی گوت:
. تۆ لێرە دانیشە، من ئێستا دێمەوە.
کاتێ ژنەکە ڕۆیشت، سوڵتان بە پەنادزە بە دوایدا چوو تا ژنەکە گەیشتە ئەو شوێنەی مەبەستی بوو و چووە ناو ئەشکەوتەکە. سوڵتان بە دوایدا چووە ژوورەوە، دیتی چل دێو چاوەڕێی ژنەکەیان دەکرد. کە دێوەکان چاویان بە ژنەکە کەوت گوتیان:
. ئەوە بۆ گیرۆ بووی؟
ژنەکە پێی گوتن:
. ئیشم هەبوو.
دەستیان بە گەمەو سوحبەت و ڕابواردن کرد. کە وەختی مەلابانگدانی بەیانی داهات، ژنەکە ویستی بچێتە دەرەوە، سوڵتان دە پێشدا چووە دەرەوەو گەڕایەوە لای دوو جوانووەکە. ژنەکە هاتەوە بە مەیتەری گوت:
. مەیتەر، هەستە با بڕۆین.

مەیتەر هەستا سوار بوو. ژنەکەش سوار بوو. ڕۆیشتن. لە نیوەی ڕێگادا سوڵتان بە ژنەکەی گوت:

. خانم، تۆ دە پێشدا بڕۆ، منیش هەر ئێستا دەتگەمێ، کیسە توورتنەکەم لە شوێنی بەستنەوەی جوانووەکان لە بیر کردووە.

ژنەکە گوتی:

. باشە، بڕۆ!

سوڵتان چووە ئەشکەوتی دێوەکان. دیتی هەموویان نووستوون و شمشێرێکیان لە تەنیشتە. دەستی دایە شمشێرەکەو سەری هەموو دێوەکانی بڕی و سەرەکانی لە گەڵ خۆی هێنایەوەو گەیشتەوە ژنەکەی. ڕۆیشتن تا گەیشتنەوە ماڵێ. ژنەکە چووە ژووری خۆی بۆ ئەوەی بخەوێ. سوڵتانیش جووانووەکانی بردە تەویلەکەو بەستنییەوەو چوو، لە ژووری خۆی نا، لە ژوورێکی تر نووست. لەولاوەش کاتێ ژنەکە نووست، خەونێکی ناخۆشی دی و بە تۆقاوی لە خەو ڕاپەڕی. خەونەکەی بۆ دایکی گێڕایەوەو گوتی:

. دایکە، سوڵتان نەسیمم لە خەودا دی. بەرگی مەیتەری لەبەر بوو. لەگەڵ من هات و هەر چل دێوی سەر بڕی. سەرەکانی لەگەڵ خۆی هێنایەوە. (دیارە دایکی بە مەسەلەکەی دەزانی و ڕێی لێ نەدەگرت). کاتێ دایکی ئەمەی بیست، پێی گوت:

. نا، کچم، وا نییە! ئەوە خەونە، خەون ڕاست نییە.

ژنەکە نووستەوەو هەمان خەونی بینییەوە. هەستا بە دایکی گوت:

. دایکە، ئەگەر پێم باوەڕ ناکەی، بڕۆ بزانە سوڵتان چی لە بن سەری دایە؟

ژنە خۆی هەستا و چوو، سەیری بن سەری مێردەکەی کرد. دیتی چل سەر لە ناو کیسەدان. ژنە گەڕایەوە بە دایکی گوت:

ـ دایکە، سبەینە دابێ سوڵتان دەمکوژێ! ئێستا دەچمە لای ویردێکی لێ دەخوێنم و دەیکەم بە کەر.

دایکی گوتی:

ـ نا..کچم! مێردی خۆتە! سوڵتانە! دەترسم هەست بە شەرمەزاریو سووکایەتی بکا.

ژنەکە گوتی:

. دایکە، وەختە دڵم بتەقیٚ! تا بەیانی خۆم پیٚ ڕاناگیریٚ! ویردێکی لەسەر دەخوێنم دەیکەم بە لەقلەق.

ژنەکە چووە لای سوڵتان، دەستی دایە دارێک، ویردێکی لەسەر سوڵتان خوێندو دارێکی لێداو پێی گوت: ببە بە لەقلەق!

سوڵتانی گۆڕیو کردی بە لەقلەق! لەقلەقەکە فڕی چووە ناو لەقلەقەکانی کەناری دەریا. کاتیٚ لەقلەقەکان دیتیان ئەمە لەقلەقێکی غەوارەیە، بە دەنووکان تێی وڕووکان هەموو پەڕو تووکیان دەرهێنا.

دوای کەمیٚ، سیٚ کۆتر هاتن، گوتیان: ئۆی ئەوە سوڵتان نەسیمە! هۆ! سوڵتان نەسیم، ئەگەر خەوتووی، خەوەکەت خەوی بەدبەختییە. ئەگەر بە ئاگاشی، نیشانەی بەختەوەرییە! پێت دەڵێین: سیٚ کچ دێن، لە نزیک تۆوە لەسەر کەناری دەریا دادەنیشن. دەیانەویٚ سەری خۆیان بشۆنو هەر یەکە بەوەی تر دەڵیٚ: من پێشی تۆ سەری خۆم دەشۆم. سوڵتان نەسیم، ئەوە پێت دەڵێین: ئەگەر بە خەبەریو تێدەگەی، کە چاوت بە کچەکان کەوت.، هەستە ئاو بە سەری هەر سێکیان داکە. ئەوانیش ویردت لەسەر دەخوێننو دەتخەنەوە سەر شکلی جارانت.

کۆترەکان لە قسەکان بوونەوە. لە شەقەی باڵیان داو ڕۆیشتن. دوای نەختیٚ سیٚ کچ هاتن. لەسەر کەناری دەریا دانیشتنو لە بەینی خۆیانەوە کردیانە کێشە. هەر کەسە دەیگوت: ئاو بە من داکەن. سوڵتان هەستا ئاوی بە هەموویان داکرد. کە خۆیان شووشت، بە سوڵتان نەسیمیان گوت:

. سوڵتان نەسیم، چۆن پاداشتت بدەینەوە؟ وا باشە بتخەینەوە سار شکلی جارانت.

لەسەریان خوێندو خستیانەوە سەر شکلی بنیادەمان.

سوڵتان نەسیم کە بووەوە بە مرۆڤ، یەکسەر چووەوە ماڵیٚ. دەستی دایە دارێکو دارێکی لە ژنەکەی داو کردی بە کۆترو لە ناو ڕکەوی ناو لە

خواردن‌و خواردنەوە بێ بەشی کردو جارچییەکی ناردە بازاڕ جاڕی دا: چی ژنی شار هەیە هەموویان بکوژن و ئەوەی دووگیانە ورگی بدڕن!
کە سوڵتان ئەو فەرمانەی دەرکرد، ئەوەی ژن‌و ئەوەی دووگیان بوو، نەیانهێشت. پیرەمێردێك کچێکی هەبوو، چووە لای سوڵتان‌و پێی گوت:
- جەنابی سوڵتان، چۆن دەبێ تۆ بێ ژن بی؟! وەرە ژنێکت بۆ دێنم.
سوڵتان گوتی:
- لە دونیادا هیچ ژنم ناوێ.
پیرەمێرد پێی گوت:
- ژنێکی دووگیان هەیە، دەیهێنین با لای خۆت بێ! ئەگەر کچی بوو، ئەوە نسیبی تۆیە. بە دەستی خۆت پەروەردەی بکەو کە گەورە بوو پێڕاگەیشت، لە خۆتی مارە بکەو بیهێنە!
ژنەکەیان بردە ماڵی سوڵتان‌و لەوێ بە جێیان هێشت. دوای چەند ڕۆژێك، ژنەکە کچێکی بوو. لە ژێر دایکی دەریانهێناو بردیان لە ناو حەفت ژووری لە ناو یەك‌و حەفت ژێر زەمین دایاننا بۆ ئەوەی کەس نەیبینێ‌و کەسیش ئەو نەبینێ.
ڕۆژێ لە ڕۆژان کە کچە پێڕاگەیشت سوڵتان زەماوەندی لەگەڵ کرد.
ژنەکە سکی بوو و سێ کوڕی هێنا. ژنەکە هیچ ڕێگاو ئاسمان‌و خۆری نەدیبوو. ڕۆژێ، لە مینای پەنجەرەیەکی بچووکەوە ڕووناکی بینی، بە کارەکەرەکەی گوت: ئەمە چییە؟!
کارەکەرەکە گوتی:
- ئەمە ڕووناکییە خانمەکەم! لە دەرەوەی ئێرە، دونیا هەیە، خۆر هەیە، خەڵك هەیە.
کە ڕۆژئاوا بوو، مێردی هاتەوە، داوای لە مێردی کرد، گوتی:
- دەمەوێ بچمە دەرەوەو دونیا ببینم!
سوڵتان گوتی:
- (إنا لله و إنا إليه راجعون)! ئافرەت، کە سبەینە داهات بڕۆ بۆ خۆت پیاسەیەك بە ناو باخدا بکە.

کە سبەینە داهات، ژنەکە چووە دەرەوە. دوو تیپە سەربازی لە گەڵ چوو. ژنەکە تا چوار سەعات سەربازەکانی لەگەڵدابوو، ئەو حەلە پێی گوتن: ئێوە بگەڕێنەوە، من لەگەڵ سوڵتان نەسیم دەبم.
ئێواریّ، سەربازەکان گەڕانەوە. مایەوە ژنەکەو سوڵتان نەسیم و منداڵەکانیان لە ناو خاک و خوڵ گەمەیان دەکرد. لە ناکاو منداڵەکان دیتیان بەردێک جوولایەوە. بەردەکەیان بڵند کرد دیتیان لەغەمە. چل دێوی تێدایە. هاوار دەکەن:
ئاخ!! سوڵتان نەسیم!! هەشتا دێو بووین ماینەوە چل! کوا ئەوەی سوڵتانمان بخاتە بەردەست، بزانە چی لێدەکەین؟
پاش نەختێ، سێوێکیان هێنا لە بەینی خۆیانەوە دابەشیان کرد بۆ چل پارچە. ژنی سوڵتان نەسیم بە سوڵتانی گوت:
. ئەگەر پارچە سێوێکم بۆ نەهێنی، پێیان دەڵێم تۆ لێرەی. سوڵتان نەسیم کە ئەمەی بیست، چووە لای دێوەکان و بە فێڵ پارچە سێوێکی لێوەرگرتن و هێنای دایە ژنەکەی. ئینجا دێوەکان نووشتەیەکیان دەرهێنا و گوتیان:
. ئای سوڵتان نەسیم، لە کوێی بۆ ئەوەی بتخۆین؟!
ژنەکەی سوڵتان بە سوڵتانی گوت:
. ئەی سوڵتان، ئەگەر پارچەیەکم لەو نووشتەیە بۆ نەهێنی، هاوار دەکەم و دەڵێم:
. سوڵتان نەسیم ئەوەتا لێرەیە!
سوڵتان گوتی:
ـ پارچە نووشتەت بۆ لە کویّ بێنم؟! بڕۆ پێیان بڵێ! (إنا لله و إنا إليه راجعون)! تۆ لەوەتی لە سکی دایکتدای، من بە خێوت دەکەم! وەمدەزانی دەبی بە ژنێکی چاک!
ژنەکە هاواری کرد:
. وەرن، ئەوەتا سوڵتان نەسیم لێرەیە!
کاتێ دەڵەدێوەکان ئەمەیان بیست، هاتنە دەرەوە سوڵتان نەسیمیان گرت و بە زنجیر بەستیانەوە و ڕایانکێشایە ناو لەغەمەکە. ژنەکەشیان برد.

منداڵەکان لە دەوری سوڵتان دەگریان و ژنەکەش لە گەڵ چل دێوەکە ڕایدەبوارد.

نیوەشەو، دەڵە دێوەکان نووستن. سوڵتان نەسیم بە منداڵەکانی گوت:

. ڕۆڵەکانم، دەتوانن ئەم کۆت و زنجیرەم لێ بکەنەوە؟

پێیان گوت:

. بەڵێ باوکە!

زنجیرەکەیان پچڕاند و سوڵتانیان کردەوە. سوڵتان کە ئازاد بوو، شمشێرێك لەوێ هەڵواسرابوو، دەستی دایە شمشێرەکەو هەر چل دێوی کوشت. کە ئەوانی تەواو کرد، گەڕایەوە لای ژنەکەی و بە خەبەری هێنا. کاتێ ژنەکە بە ئاگا هات و دیتی دەڵە دێوەکان کوژراون، زانی سوڵتان کوشتوونی. بە سوڵتانی گوت:

. سوڵتان، مەمکوژە! من ژنی تۆم. سوڵتان پێی گوت:

- باشە ئەی نەتدەزانی من مێردی تۆم و باوکی منداڵەکانتم! تۆ هێشتا لە سکی دایکتدابووی من پەروەردەم کردی. کەچی خیانەتت لەگەڵ کردم. ئەم قسانە دادت نادا!

شیرێکی لە سەری داو کوشتی.

ئینجا بەردەکەی لەسەر لەغەمەکە دانایەوە. دەستی منداڵەکانی گرت و گەڕایەوە ماڵێ. دوای ئەوە، وازی لە سوڵتانێتی هێنا. بوو بە دەروێش و بە دونیادا کەوتە گەڕان.

لای ئێوە بووین و هاتینەوە!

* * *

## ٢ـ ئاخ !

هەبوو نەبوو....

سوڵتانێك هەبوو، سێ کچی هەبوو. سوڵتان ویستی بە سەفەر بچێ. کچە گەورەکەی پێی گوت:

ـ باوکە، لەگەڵ دەستی خۆت دیارییەکم بۆ بێنە.

کچی ناوەنجی گوتی:

(کراسی زەری)یەکم  بە دیاری بۆ بێنە.

کچە گچکەکەیش گوتی:

ـ باوکە، دارخورمایەکم بۆ بێنە هێشووی مرواری پێوە بێ. ئەگەر بۆم نەهێنیێ، کەشتیت لە ناوەندی دەریادا دەوەستێ.

سوڵتان پێی گوتن:

ـ باشە!

سوڵتان بە پشتو پەنای خوا بۆی دەرچوو. کاتێ ویستی بگەڕێتەوە، دیاری بۆ کچی گەورەو کچی ناوەنجی کڕی، بەڵام لە بیری چوو دارخورمای بە

هێشووە مرواری بۆ کچی گچکە بکڕێ. کاتێ کەشتییەکەیان گەیشتە ناوەڕاستی دەریا، کەشتییەکە چەقی. کە کەشتییەکە چەقی باوکی کچەکان زانی لە بیری کردووە دارخورمای بە هێشووە مرواری بۆ کچە گچکەکەی بێنێ. بیری کردەوەو لە ناخی دڵەوە گوتی:

ـ ئاخ!! خوایە! ئێستا لەو کاتەو لە ناو ئەم دەریایەدا دارخورما لە کوێ بێنم؟!.

کە گوتی (ئاخ)! دەریا شەقی بردو کۆیلەیەك لە ناو شەپۆڵی دەریا هاتە دەرەوە. پێی گوت:

ـ فەرموو چت دەوێ؟! من (ئاخ)م هەر چیت دەوێ بخوازە!

سوڵتان پێی گوت:

ـ کچە گچکەکەم داوای لێکردووم دارخورمایەکی بە هێشووە مرواری بۆ بێنم و لە بیرم کردووە بۆی بکڕم.

کۆیلەکە پێی گوت:

ـ ئەگەر من دارخورمایەکی بە هێشووی مرواریت بۆ بێنم کچەکەتم بە هاوسەریی دەدەیتێ؟!

سوڵتان گوتی:

ـ ئا... ئامادەم!

کۆیلەکە دارخورماکەی هێناو دایە سوڵتان. کەشتییەکە جوولاو کەوتەوە ڕێ. سوڵتان گەیشتەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆی و دیارییەکانی دایە کچەکان. دارخورماکەیشی پێشکەشی کچە گچکەکەی کرد. کچە دارخورماکەی وەرگرت و لەسەر بان چاندی. هەموو ڕۆژێ تەماشای دەکردو چاوەڕێی دەکرد. دوای چەند ڕۆژێك کچەکە لەسەر بان دانیشتبوو. هەر هێندەی زانی (ئاخ) لە کنی پەیدا بوو و پێی گوت:

ـ هەستە بڕۆ لای باوکت. پێی بڵێ:

ـ فلانە کۆیلە هاتووە دەڵێ: کوا ئەو پەیمانەی من و تۆ لە ناو دەریادا بەستمان؟ بزانە چت پێدەڵێ؟!

کچەکە چووە خوارێ بۆ لای باوکی و پێی گوت:

. باوکە (ئاخ)ی کۆیلە هاتووە دەڵێ: کوا ئەو پەیمانەی من و تۆ لە ناو دەریادا بەستمان؟!
باوکی پێی گوت:
. من لەسەر پەیمانی خۆمم! پێی بڵێ بێتە خوارێ قسە بکەین!
کۆیلەکە چووە خوارێ. باوکی کچەی بینی و پێی گوت:
. کوا پەیمانەکەت؟
سوڵتان گوتی:
. کچەکە وا لای دارخورماکەیە. بڕۆ بیبە!
کۆیلەکە کچەکەو دارخورماکەی خستە سەر شانی و فڕی. کچەکەی بردە کەناری دەریا و لەوێ لەناو خانوویەکی دانا. کچەکە، لەو شوێنەدا، لە خۆی و لە کۆیلەکە بەو لاوە، هیچ کەسی نەدەدی. کۆیلەکە چێشتی لێدەنا و بە یەکەوە شیویان دەخوارد. کچەکە بە درێژایی شەو خەوی لێ نەدەکەوت. بە(ئاخ)ی گوت: شەو خەوم لێ ناکەوێ. (ئاخ )سێوێکی دایێ و پێی گوت:
. شەو ئەم سێوە بۆن کە، خەوت لێدەکەوێ.
کچەکە مانگێك بەم جۆرە مایەوە. مانگێکی تریشی بەسەرداچوو. ئینجا لە دڵی خۆیدا گوتی:
. ئەمڕۆ ئێوارێ، سێوەکە بۆن ناکەم. با خەوم لێ نەکەوێ. بزانم کێ دێتە لام و شەو چ ڕوودەدات؟
نیوەشەو، هەر بە خەبەر بوو. دیتی گەنجێك هاتە لای و لە تەکییەوە ڕاکشا. کچەکە سەیری کرد دیتی گەنجەکە حەفت قوفلی لەسەر سنگی بوو کلیلی قوفلەکانیشی بە قژی سەرییەوە هەڵواسرابوو. کچەکە دەستی دایە کلیلەکان و یەك یەك قوفلەکانی کردەوە. قوفلی یەکەمی کردەوە. دیتی دارتاشێکی تێدایە لانکێك دروست دەکات. کچەکە لە دارتاشەکەی پرسی:
ئەوە چ دەکەی؟
دارتاشەکە گوتی:
. لانکێك بۆ کوڕی شای ئەجندان دروست دەکەم.

کچەکە لە سەری قوفل دایەوەو هاتە دەرەوە. قوفلی دووەمی کردەوە دیتی بەرگدروویەکی تێدایە دۆشەکێك دەدووریٚ.

کچەکە پێی گوت:

. ئەوە چ دروست دەکەی؟

بەرگدرووەکە گوتی:

. دۆشەکێك بۆ کوڕی شای ئەجندان دەدوورم.

کچەکە لە سەری قوفل دایەوەو هاتە دەرەوە. قوفلی سێیەمی کردەوە دیتی زێڕینگرێك گوارەو زەنگولۆکە دادەڕێژیٚ.

کچەکە لێی پرسی:

. ئەوە چ دروست دەکەی؟

زێڕینگر گوتی:

. چەكو خشڵ بۆ کوڕی شای ئەجندان دادەڕێژم.

کچەکە لە سەری قوفڵ دایەوەو هاتە دەرەوە. کە ویستی قوفڵی چوارەم بکاتەوە گەنجەکە لە خەو ڕابوو. توند دەستی کچۆڵەکەی گرت و پێی گوت:

. ئەوە چ دەکەی ئافرەت؟ مادەم نهێنی منت هەڵمالی، من تۆم ناویٚ. ئینجا بانگی کرد:

– (ئاخ)، هۆ(ئاخ)!

(ئاخ) گوتی:

. بەڵیٚ!

کابرا گوتی:

. ئەم ژنە ببە، سەری بڕەو فنجانێکم پڕ لە خوێنەکەی بۆ بێنە بیخۆمەوە.

(ئاخ) کچەکەی برد. بەڵام دڵی نەهات سەری ببڕیٚ. فڕێی دایە بەردەرگای ماڵی خوشکە گەورەی گەنجەکەو باڵندەیەکی گرت و سەری بڕی و خوێنەکەی لە فنجانێك کردو بۆ کابرای هێناو پێی گوت:

. سەرم بڕی و ئەمەش خوێنەکەی!

کچەکە لەبەر دەگای ماڵی خوشکە گەورەی پاشا دانیشت. کاتێك قەرەواشی ماڵەوە هاتە دەرێ بۆ ئەوەی ئێسك‌و پرووسکی پاش جەم فڕێ بداو ژنی پاشای لەبەر دەرگا بینی گەڕایەوە گوتی:

. خانم، ژنێك لە بەردەرگای ماڵەوە دانیشتووە هەر لە براژنت دەکا.

خانم پێی گوت:

. بانگی کە با بیبینم!

قەرەواشەکە چوو بانگی کچەکەی کرد.

خانم کچەکەی بینی و گوتی:

. کۆراییت دایێ تۆ چۆن زاتت کرد نهێنی برام ئاشکرا بکەی؟ هەستە بڕۆ دەرەوە.

دەری کرد. کچەکە چووە ماڵی دشی ناوەنجی. قەرەواشەکەیان هاتە دەرەوە ئێسك‌و پڕوسکی پاش جەم فڕێ بدا. چاوی پێ کەوت گەڕایەوەو گوتی:

. خانم، ژنێك لە بەردەرگا دانیشتووە هەر لە ژنی پاشای برات دەکات.

خانم گوتی:

. بانگی کە!

قەرەواشەکە چوو بانگی کرد.

کاتێ خانم کچەکەی بینی گوتی:

. تۆ چۆن نهێنی برای منت ئاشکرا کرد؟ هەستە بڕۆ دەرەوە.

دەریکرد. کچەکە چووە ماڵی دشی گچکەی. قەرەواشی ماڵێ هاتە دەرەوە بۆ ئەوەی ئێسك‌و پڕوسکی پاش جەم فڕێ بدات. چاوی پێکەوت‌و چووە ژوورەوەو گوتی:

خانم، ئافرەتێك لەبەردەرگایە زۆر لە ژنی پاشای برات دەکات.

خانم. گوتی:

. بڕۆ بانگی کە!

چوو بانگی کرد. کچەکە چووە ژوورەوە. خانم چاوی پێکەوت‌و گوتی:

. بە خێر بێی! بە خێر بێی! وەرە دانیشە! سۆمای چاوم. خانم هەستا جێی بۆ ڕاخست. ژوورێکی لە سەلال دایێ. کچەکە دووگیان بوو. مندالی بوو.

کوڕێکی بوو زۆر لە باوکی دەکرد حەفت قوفلی بە کلیلەوە لەسەر سنگی بوو. پووری منداڵەکە جلی کردە بەر منداڵەکەو لەسەر بێژینگی دانا.

پاشای باوکی منداڵەکە عادەتی بوو هەموو هەفتان سەردانی خوشکەکانی دەکرد. کە چووە لای خوشکی گەورەی. خوشکی گەورەی پێی گوت:

- برام، ژنەکەت هاتە لام دەرمکرد!

پاشا کە ئەمەی بیست، چووە لای خوشکی ناوەنجی. خوشکی گەورەی چی پێ گوتبوو، ئەویش هەمان شتی پێ گوت. لای ئەویش ڕۆیشتو چووە لای خوشکی گچکەی. کە چووە ژوورەوە، خوشکی پێی گوت:

- برام، چ خێرێکی خوای بوو!! بۆچی ژنی خۆت دەردەکەی؟ ئەی ئێمەش پێشتر وامان نەکرد بۆچی مێردەکانمان دەریان نەکردین؟ برام، بڕۆ دڵی چاك بکەوە. پاشا، کە ئەمەی بیست، بێ دەنگ بوو. ئینجا پێکەنی. کە خوشکی دیتی برای پێدەکەنی، گوتی:

- هەستە لە گەڵم بچینە بچینە سەلال بۆ ژوورەکەی. برای لەگەڵ خۆی بردە سەلال. کە کابرا چوو دیتی ژنەکەی وا لەوێیە. خوشکی، منداڵەکەی لە ژنەکە وەرگرتو لە باوەشی برای ناو لەگەڵ ژنەکەی پێکی هێنایەوە. پاشا ژنی خۆی بردەوە ماڵێ. زۆر بە خۆشیو شادی ژیان.

لای ئێوە بووینو هاتینەوە.

* * *

## ٣ـ ئەشقی هێلکە

هەبوو نەبوو

بازرگانێك هەبوو، ژنێکی هەبوو. نە سکی دەبوو نە منداڵ. ژنەکە نەزری لە خۆی گرت گوتی:

. ئەگەر سکم بوو و خوا منداڵێکی دامێ، دوو جۆگا لێ دەم: یەکێ پڕ ڕۆن دەکەمو یەکێ پڕ هەنگوین دەکەم بۆ هەژاران. دوای چەندمانگێك، خوا کوڕێکی دایێ. کوڕەکە گەورە بوو. تەمەنی بوو بە حەوت ساڵی. دایکی هەموو شەوێ یەکێکی لە خەودا دەدی. نەزرەکەی بە بیر دەهێنایەوە. ئاخیری ژنەکە بە مێردەکەی گوت:

. هەموو شەوێ یەکێ دێتە خەونم نەزرەکەم بیر دەخاتەوە. پیاوەکە، هەستە، ها، ئەم پارەیە بگرەو بڕۆ بای ئەوەندە هەنگوینو ڕۆن بکڕە. کابرا پارەکەی وەرگرتو ڕۆنو هەنگوینەکەی کڕیو هێنایەوە. خەڵکەکە هەرچی هات بۆ خۆی بردی. پیرەژنێك هەبوو هیچ هیرباری نەبوو. یەك قەپێلکە هێکەی هەبوو. کردی بە دوو کەرت. نیوەی پڕ هەنگوین کردو نیوەی پڕ ڕۆن کرد. کوڕەکە هات (ئەوەی نەزری بۆ کرا بوو) شەپێکی لە دستی پیرەژنەکە دا. پیرەژن قەپێلکە هێلکەکەی لە دست بەربووەوو شکاو ڕۆنو هەنگوینەکە ڕژا. پیرەژن پێی گوت:

ـ ئەوە بۆ وات كرد ياخوا خوا لەبەر زگی دايكت هەڵگرێ. ياخوا گرفتاری (ئەشقی هێلكە) ببی!

كوڕەكە، ئەمەی بيست چووەلای دايكی و پێی گوت:

– دايكە، (ئەشقی هێلكە) چييە؟!

دايكی گوتی:

– كوڕم، تۆ هێشتا بچووكی! تۆو شتی وايان نەگوتووە! دەترسم شتێكت بە سەر بێ.

كوڕەكە گوتی:

– دەبێ بچم بە دوای (ئەشقی هێلكە)دا بگەڕێم.

كە دايكە زانی كوڕەكە بە هيچ شتێ واز ناهێنێ، نانی بۆكردو ئاوی بۆ دانا. ئەويش سواری ئەسپ بوو و بڕۆ....ڕۆيشت... ڕۆيشت تا گەيشتە سێڕيانێك ديتی پيرەمێردێك لە سێڕيانەكە دانيشتووە. پرسياری لێ كرد گوتی:

– ئاپۆ، ئەم سێ ڕێيە بۆ كوێ دەچن؟

پيرەمێرد وەڵامی دايەوە:

– ئەمە ڕێگای هاتە، ئەمە ڕيگای بەراتە، ئەمەبش ڕێگای (سەد دێو)ە، ڕێگای هات و نەهاتە.

كوڕەكە پێی گوت:

– ئاپۆ، دەمەوێ پرسيارێكت لێ بكەم.

پيرەمێردەكە گوتی:

ـ فەرموو بڵێ:

گوتی:

ـ ئايا تۆ (ئەشقی هێلكە)ت بيستووە؟

پيرەمێرد گوتی:

ـ ئۆی!! دەڵێن باپيرم دەيگێڕايەوەو دەيگوت: (ئەشقی هێلكە ) لە بنی دونيايە.

کاتێ کوڕەکە ئەمەی بیست هەستا چووە ڕێی هات و نەهات. هەر ڕۆیشت ڕۆیشت... لە هەورازان هەڵکشا و لە نشێوان داکشا، گوێی لە دەستاڕێك بوو ئیشی دەکرد. بە دوای دەنگی دەستاڕەکەدا چوو. دیتی دەڵە دێوێك دانیشتووە دەستاڕ لێ دەکا. پەلاماری دەڵە دێوەکەی داو هەردوو مەمکی گرت و دەمی پێوەنا و مژتی. چەنگە ئاردێکیشی هەڵلووشی. دەڵە دێوەکە پێی گوت:

ـ ئاخ کوڕم! ئەگەر مەمکت نەمژیبام و ئاردت نەخواردبام، هەر ئێستا دەمخواردی.

ئینجا دەڵە دێوەکە گوتی:

دانیشە! پێم بڵێ چت دەوێ؟ تۆ تازە بوویتە کوڕی من. زارت بکەوە و هەرچی دەتەوێ بیخوازە.

کوڕەکە گوتی:

ـ دایکە، ئایا تۆ (ئەشقی هێلکە)ت بیستووە؟

دەڵە دێوەکە گوتی:

کوڕم، من خۆم نەمبیستووە، بەلام بڕۆ لای خوشکەکەی ترم. ها، ئەم داوە قژەیش بگرە. لەناو قوتوویەکی بنێ. لە هەر کوێ یەکێ غەدری لێکردی، هەڵیکڕوزێنە یەکسەر دەگەمە لات. کوڕەکە لە کن دەڵە دێوەکە ڕۆیشت. لە هەورازان هەڵکشا و لەنشیشوان داکشا. ڕۆیشت تا گەیشتە لای خوشکی ناونجی دەڵە دێوەکە. پەلاماری داو مەمکی گرت مژتی و چەنگە ئاردێکی هەللوشی. دەڵە دێوەکە پێی گوت:

ـ نەجاتت بوو!! ئەمر کە چت دەوێ؟

کوڕەکە گوتی:

دایکە، ئایا تۆ (ئەشقی هێلکە)ت بیستووە؟

دەڵە دێوەکە گوتی:

بیستوومە بەلام زۆری لە بارەوە نازانم. بڕۆ لای خوشکی گچکەم. ئەو ڕێنماییت دەکا. کوڕەکە بە پێیان کەوتە ڕێ و ڕۆیشت. گەیشتە لای خوشکی

گچکە دیتی خەریکە دەستاڕ لێ دەکا. پەلاماری داو شیری مەمکی خواردو ئاردی دەستاڕەکەی هەڵلوشی. دەڵە دێوەکە پێی گوت:

– ئەگەر شیری مەمکی منت نەخواردایەو ئاردی منت هەڵنەلوشیایە، هەر ئێستا دەمخواردی. پێم بڵێ بۆچی هاتووی؟ چت گەرەکە؟ بڵێ.

کوڕەکە پێی گوت:

. (ئەشقی هێلکە)م دەوێ!

دەڵە دێوەکە پێی گوت:

– جا تۆ چۆن دەگەیتە (ئەشقی هێلکە)؟

کوڕەکە گوتی:

– دایکە، بە تەمای خواو بە تەمای تۆ هاتووم.

دەڵە دێوەکە پێی گوت:

ـ وەرە ڕێنماییت بکەم بۆ لای (ئەشقی هێلکە ). هۆقە پەمۆیەکی پەڕەکراو بکڕەو بڕۆ تا دەگەیتە دەرگایەك. لەسەرێ تا خوارێ زەنگوڵی پێدا هەڵواسراوە. پەمۆ لەناو زەنگوڵەکان بنێ‌و دەرگاکە بکەوە. شێرێك دەبینی بەسراوەتەوە. گیای لەبەر ڕووکراوەو گایەك دەبینی بەسراوەتەوەو گۆشتی مەڕی لە پێشە. گۆشتەکە هەڵگرەو لە پێش شێرەکەی دانێ‌و گیاکە هەڵگرەو لەبەر گاکەی ڕووکە. لەوێ بڕۆ دەگەیتە دوو جۆگا. یەکێ بەری گیراوەو ئەوەی تر بەردراوەتەوە. ئەوەی بەری گیرایە بەریدەوە. ئەوەی بەردراوەتەوە بەری بگرە. بە ناو خانووەکەدا بڕۆ. چل دێو دەبینی. لەسەر پلیکانە خەوتوون. ئەگەر چاویان زەق بوو، بزانە خەوتوون‌و بڕۆ سەلال. ئەگەر چاویان قووچاو بوو بزانە واگان‌و بگەڕێوە، مەچووە سەلال. کە چوویتە سەلال دەبینی هەمووی شمشێرو خەنجەری لێ چەقاندراوە. کە چوویتە سەرەوە بەلای ڕاستەدا بڕۆ. هێدی هێدی بڕۆ. تەقچکەیەکی لێیە. سێ هێلکەی لەسەرە. دەست درێژ کە. خێرا سێ هێلکەکە بێنەو ڕاکە. ئەمە ئەو مرازەیە کە تۆ بە دوایدا وێڵی.

کوڕەکە کە گوێی لەو ڕێنماییەی دەڵە دێوەکە بوو، چوو هەندێ پەمۆی کڕی‌و ملی ڕێی گرت‌و ڕۆیشت تا گەیشتە دەرگاکە. زەنگوڵەکانی پڕ لۆکە

کرد. دەرگای کردەوەو چووە ناو کۆشکەکە. شێرو گاکەی بینی. گیای لە پێش شێرەکە هەڵگرتو لەبەر گاکەی ڕووکرد. گۆشتەکەشی لەبەر گایەکە هەڵگرتو لە پێش شێرەکەی دانا. لەوێ ڕۆیشت. دوو جۆگای بینی. یەکێ بەری گیرابوو، بەریدایەوە. ئەوەی تر بەردرابووەوە، بەری گرت. لەوێوە ڕۆیشت چووە لای پلیکانە. چل دێوی دی ڕاکشابوون بەڵام چاویان زەق بوو، زانی خەوتوون. بە پلیکانەکەدا سەرکەوت. چووە لای دەستەڕاست. دەستی گەیاندە تەقچکەکەو سێ هێلکەکەی هێناو هاتە خوارەوە. بەرەو دەرگا پێی بە غارەوە نا. دەڵە دێوەکان هەستیان پێکرد. ڕاویان ناو هاواریان کرد: ئەی جۆگا، بیگرە. جۆگا بەردراوەکە گوتی:

- نایگیرم با بڕوا خوای لەگەڵ. من بە درێژایی ژیانم بەردرابوومەوە، ئەو بەری گرتم. جۆگا بەرگیراوەکەش گوتی: با بڕوا خوای لەگەڵ! من بە درێژایی تەمەنم، بەرم گیرابوو، ئەو بەری دامەوە. ئینجا دێوەکان هاوار یان کرد:

- ئەی گا، ئەی شێر، بیگرن. شێرەکە گوتی:

- با بڕوا خوای لەگەڵ! من لە هەموو ژیانی خۆم تامی گۆشتم نەکردبوو. تۆ گیات دەدامێ. ئەو گۆشتی دامێ. گاکەش گوتی

- منیش لە هەموو ژیانی خۆمدا گیام نەخواردووە. تۆ گۆشتت لەبەر دادەنام. ئەو گیای بۆ هێنام. با بڕوا خوای لەگەڵ!

ئەوسا دێوەکان بانگی دەرگاکەیان کرد. ئەی دەرگا، بیگرە. دەرگا گوتی:

- من بەدرێژای ژیانم داخرابووم، ئەو کردمیەوە. با بڕوا خوای لەگەڵ!

کوڕەکە بەغار هات تا گەیشتەوە لای دەڵە دێوەکە. ئەو دەڵە دێوەی بۆ لای (ئەشقی هێلکە) ڕێنمایی کردبوو. کە دەڵە دێوەکە چاوی پێ کەوت گوتی:

- کوڕم، هێنات؟

کوڕەکە گوتی

بەڵێ!

دەڵە دێوەکە پێی گوت:

- ئاگادار بە! بڕۆ لای خوشکی ناوەجیمان.

ئینجا چەند تاڵە قژێکی خۆی دایەو گوتی:

. ئەگەر کەس غەدری لێکردی، تاڵە قژێك هەڵکڕوزێنە یەکسەر دەگەمە لات.
کوڕەکە تاڵە قژەکانی وەرگرت و ڕۆیشت تا گەیشتە لای دەڵە دێوی ناوەنجی.
دێوەکە پێی گوت:
. بە خێر بێیتەوە کوڕم، ئەوەی دەتەویست پەیدات کرد؟
کوڕەکە گوتی:
. بەڵێ دایکە.
دەڵە دێوەکە پێی گوت:
. بڕۆ لای خوشکەکەی دیکەمان.
ئینجا هەندێ تاڵە قژی خۆی دایێ. بۆ ئەوەی ئەگەر کەوتە تەنگانە، تاڵێك هەڵکروزێنێ و دەڵە دێوەکە بگاتە فریای. کوڕەکە لەوێ ڕۆیشت تا گەیشتە لای دەڵە دێوی یەکەم. دەڵە دێوەکە، کاتێ چاوی پیکەوت، پێی گوت:
. ئەوەی دەتەویست بە دەستت هێنا؟
کوڕەکە گوتی:
. بەڵێ، دایە.
ئیتر ماڵاوایی لێکرد. ملی ڕێی خۆی گرت و ڕۆیشت. تا گەیشتەوە ماڵێ. لە ڕێگادا، لە دڵی خۆیدا گوتی: با بزانم ئەم هێلکانە چییان تێدایە! یەکێکیان دەشکێنم بزانم چی تێدایە. هێلکەیەکی شکاند. کە شکاندی کچێکی لێ هاتە دەرەوە ئەوەندە جوان بوو باسی ناکرێ. گەورەیی بۆ ئەو خوایەی دروستی کردووە. کچەکە بە دەنگ هات و گوتی:
. برسیم...تێنوم!
کوڕەکە گوتی:
. ها، ئەمە خواردن و ئەمەیش ئاو!
کچەکە گوتی:
. گۆشت مامزو ئاوم دەوێ.
کوڕەکە گوتی:
. گۆشتی مامزم نییە.

کچەکە، کە ئەمەی بیست، لەبەر دەستی ڕایکردو فڕی. کوڕەکە دوو سەعاتی تر ڕۆیشت. دیسان لە دڵی خۆیدا گوتی: بە خوای هێلکەیەکی تریش دەشکێنم. کە شکاندی، کچێکی وەکوو کچی یەکەمی لێ هاتە دەرەوە. کچەکە پێی گوت:

- برسیم! تێنووم!

کوڕەکە پێی گوت: چت دەوێ؟

کچەکە گوتی:

- گۆشت مامزو ئاو.

کوڕەکە پێی گوت:

گۆشت مامزم لا نییە.

کاتێ کچەکە گوێی لێبوو کوڕەکە گۆشت مامزی نییە، هەڵاتو فڕی. کە ئەویش فڕی، کوڕەکە گوتی: بەخوا ئەو هێلکەی ماوە نایشکێنم تا دەچم مامزێك ڕاو دەکەمو دەیهێنم. ڕۆیشت مامزێکی دی مامزەکەی گرتو هێنای سەری بڕیو برژاندیو لە ناو قاپێکی دانا. بادییە ئاوێکیشی هێناو لە تەنیشت قاپەکەی دانا. ئەوسا هێلکەکەی شکاند. ئەویش کچێکی وەکوو دوو کچەکەی پێشووی لێ هاتە دەرێ. کچەکە گوتی:

برسیم. تێنووم

کوڕەکە پێی گوت:

- چت دەوێ.

کچەکە گوتی: گۆشت مامزو ئاو!

کوڕەکە پێی گوت:

- ها، بگرە! ئەمە گۆشت مامزو ئەمەیش ئاو!

کچەکە تا تێرو پڕ بوو گۆشت مامزی خواردو ئاوی بەسەردا خواردەوە. هێزو تاقەتی چووە بەرو بە کوڕەکەی گوت:

- ئەی کوڕی خەڵك، تۆ ئێستا وەکوو برای منی. دامپۆشەو بمبەوە ماڵی خۆتو لە خۆتم مارەم بکە. ئەوسا بمگوازەوە.

کوڕەکە کچەکەی بردەوە ماڵێ. لە دەرگای دا. دایکی کوڕەکە، لە دووری کوڕەکەی چاوی کوێر ببوو، کە کوڕەکە لە دەرگای دا، دایکی پرسی:

– کێیە لە دەرگا دەدات؟

کوڕە گوتی:

- دایکە، منم!

دایکە، کە گوێی لە دەنگی بوو، هەستا چوو دەرگای کردەوە. کە دەستی لە کوڕەکەیداو ماچی کردو بۆنی پێوە کردو چاوی چاك بووەوە. کوڕەکە لە تەك دایکییەوە دانیشتو هەموو سەربردەی خۆی بۆ گێڕایەوە. ئینجا بە دایکی گوت:

- دایکە، دەمەوێ ئەو کچە مارە بکەم.

دایکی رازی بوو. کوڕەکە کچەکەی لە خۆی مارەکردو گواستییەوەو چووە باوەشی. زۆر بە خۆشیو شادی ژیان.

والسلام!

* * *

## ٤ـ سەگی ڕەش

هەبوو نەبوو...

سوڵتانێك هەبوو، ژنێكی هەبوو نە سكی دەبوو نە منداڵ. ژن و مێرد هەموو ڕۆژێ لە خوا دەپاڕانەوە منداڵێكیان بداتێ. بەڵام بێهودە بوو. ڕۆژێكیان، سوڵتان بە ژنەكەی گوت:

. حورمێ، وەرە بچینە سەر چیا و لەو بڵندابیە لە خوا بپاڕێینەوە بەڵكو خوا دوعامان قبووڵ بكا.

ژنەكە گوتی:

. با بچین!

ڕۆیشتن چوونە سەر چیا و دەستیان پان كردەوە و لە خوا پاڕانەوە. كە دەستیان پان كردەوە، دیتیان سەگێكی ڕەش هات. لە نزیكیانەوە هەڵتووتا. ئەویش تەبای وان دەستی پان كردەوە و لەگەڵ ئەوان لە خوا پاڕایەوە. ژنەكە سەگەكەی دی دەپاڕێتەوە، گوتی:

. خوایە، ئەگەر كچێكم بدەیتێ. دەیدەمە ئەم سەگە.

سەگەكە كاتێ ئەم قسەی بیست، بە زمان هات و گوتی:

. ئەگەر مەسەلەكە وا بێ، ها، ئەم سێوە بگرە. بیكە دوو لەت: لەتێك خۆت بیخۆ و لە تێك مێردەكەت. سێوەكە بخۆن منداڵێكتان دەبێ. ئەگەر كچ بوو دەبێ بیدەن بە من. من دێم دەیبەم.

گوتیان:

. باشە! ئەگەر کچ بوو وەرە دەتدەینێ!

سێوەکەیان وەرگرت و کردیانە دوو لەت و یەکەو لەتیان خوارد و هاتنەوە ماڵێ. دوای چەند مانگێك، ژنەکە منداڵێکی بە سکی کەوت. سکەکەی دانا. کچ بوو. ڕۆژێکیان لە دەرگا درا. گوتیان:

کێیە؟!

ئەوەی بەر دەرگا گوتی:

. منم.

کە دەرگایان کردەوە دیتیان سەگە ڕەشەکەیە. پێیان گوت:

. چت دەوێ؟

گوتی:

. کچەکەم دەوێ!

پێیان گوت:

. هەقی خۆتە! خوا بە نسیبی تۆی کردووە. فەرموو بیبە!

سەگەکە پێی گوتن:

. با لێرە بێ! لای ئێوە دەچمە کنی!

کە باوکی کچە ئەمەی بیست، چووە بازاڕ جیازی کڕی و چی پێویست بوو بۆ کچەکەی ئامادەی کرد. سەگەکە هەموو ڕۆژێ کە کچەکە دەخەوت، خۆی دەکردە گەنجێکی حەقدە ساڵی و بێ ئەوەی کچەکە هەست پێبکا دەچوو لە گەڵی دەنووست و بەیانی زوو بە ئاگا دەهات و پێستەی سەگی دەکردەوە بەر. ڕۆژێکیان، کچەکە گوتی:

. دەمەوێ بزانم ئەو نهێنییە چییە؟ ئەمە هەموو ڕۆژێ دێ و لەگەڵم دەخەوێ و ناشیبینم. با بزانم ئەمە چ دەکا؟

ئەوە بوو پەنجەی خۆی بریندار کرد و خوێی پێوەرکرد بۆ ئەوەی خەوی لێ نەکەوێ. کە بوو بە نیوەشەو، بینی سەگەکە هاتە ژوورەوە. پێستی سەگی لەبەر خۆی داکەلاند، بوو بە گەنجێکی قۆزو لە تەنیشتی ڕاکشا. کچەکە پێی گوت:

. بۆچی ئەم پێستەت کردۆتە بەر؟

گەنجەکە گوتی:

. زەڕی بۆ کەس نییە! گوێت لێ نەبێ دۆتمام! تکاشت لێ دەکەم نهێنییەکەم ئاشکرا مەکە!

بۆ بەیانی، کچەکە چوو هەقایەتەکەی بۆ دایکی گێڕایەوەو پێی گوت:

. حاڵو مەسەلەو هەقایەتی منو سەگەکە ئاوهایە!

دایکی پێی گوت:

. ئەمشەو، کە هات پێستەکەی داکەند، پێستەکەی بشارەوەو بیسووتێنە.

کە شەو داهات، سەگەکە هات پێستەکەی داکەند. کچەکە بە دزی پێستەکەی بردو فڕێی دایە ناو تەندوور. بەیانی کاتێ، گەنجەکە بە ئاگا هات، دیتی پێستەکەی نەماوە. بە کچەکەی گوت:

. بۆچی نهێنی منت ئاشکرا کرد؟ ئێستا: خوا حافیز!

چووە دەرەوەو نەهاتەوە. کچەکە کەوتە بن بارەکی خەمان. دەستی بە گریان کرد. یەك ساڵی ڕەبەق گریا. بە دوای گەنجەکەدا دەگەڕاو نەیدەدۆزییەوە. بێزارو نائومێد بوو. حەمامێکی ژنانی دروست کردو ڕایگەیاند: خۆ شووشتن بە هەقایەت گێڕانەوەیە. هەر ژنێ بیەوێ بێ لەم حەمامە خۆی بشوا، دەبێ هەقایەتێك بگێڕێتەوە، پارەی لێوەرناگرین.

کچەکە ماوەیەکی بەم جۆرە بردە سەر. هەموو ڕۆژێ گوێی لە هەزار هەقایەت دەبوو. گوێی لێ دەبوو بەڵام گوێی پێنەدەدا. ژنەکان خۆیان دەشووشتو دەڕۆیشتن.

ڕۆژێکیان، پیرەژنێك باسی حەمامەکەی لە دراوسێکانی بیست کە خۆ شووشتنی تێدا بە هەقایەتێکە بۆ خاوەنی حەمامەکەی بگێڕیتەوە. پیرەژن لە دڵی خۆیدا گوتی:

. دەچم هەقایەتێك دەگێڕمەوەو خۆم لە حەمامەکە دەشۆم.

پیرەژن چووە حەمامەکەو بە خاوەنەکەی گوت:

. هەقایەتێکی کورتم لایە بۆت دەگێڕمەوە.

کچەکە گوتی:

- فەرموو بیگێڕەوە.
پیرەژنی ئاخیرخێر دەستی بە گێڕانەوەی هەقایەتەکەی کردو گوتی:
- (من ئافرەتێکم، مێردم نەماوە. بە تەشی ڕێسی و بێوەژن کۆشی بەڕێوە دەچم. ڕۆژێ، نیو هۆقە خوریم ڕست و ویستم ڕیسەکە بفرۆشم. زوو لە خەو هەستام. تریفەی مانگ تاریکی شەوی ڕاو دەنا. بە سەهوو چووم. وامزانی بەیانییە. لە ماڵەوە دەرچووم. ڕۆیشتم. لە ڕێگادا، مامزێکم دی. ویستم بیگرم، مامزەکە ڕایکردو منیش کەوتمە دوایەوە. گەیشتمە ئەشکەوتێك. بەردێکی گەورەی بە دەرگا وەنرابوو. بەردەکەم لادا و چوومە ژوورەوە. خانوویەك بوو دەتگوت کۆشك و سەرایە. دەوروبەری کۆشك و باخ و بێستان بوو. هەموو جۆرە فیقییەکی تێدا بوو. دیتم چەند مەنجەڵێك لەسەر ئاگر دەکولاًن. دەستم بۆ مەنجەڵێك برد ویستم شتێکی لێ هەڵێنجم و بیخۆم. دەنگێك هات و کەسیش دیار نەبوو. دەنگەکە گوتی:
- کەوگیر، لێیدە!
کەوگیر بە ناو لەپم کەوت !
هاتم نانێك بخۆم، گوێم لە دەنگێ بوو گوتی:
- تریان، لێیدە!
تریان لەناو لەپی دام! ویستم ئاو بخۆمەوە، دەنگێ هات و گوتی: ئەی بادی لێیدە.
بادی لە دەستی دام. منیش لەبەر ئێش و ژانی خۆم، دوو گەز لە دەرگای ژوورەوە نزیك کەوتمەوە. گوێم لە دەنگی مرۆڤێك بوو قورئانی دەخوێند. کە لە قورئان خوێندن بووەوە، دەسەسرێکی دەرهێنا لەسەر چاوی خۆی دانا و دەستی بە گریان و لاوانەوە کرد. دەیگوت:

ئەی ماڵ! ئەی ماڵ!
بگری بۆ خاوەن شەقشەقەو گوارەو دەسماڵ!

کە کابرا دەنگی گریانی هات، داروبەرد لە گەڵی گریان و کە لە گریان بووەوە، دەم وچاوی خۆی سرییەوەو لە ژوورەکەی هاتە دەرەوە. بۆنی بنیادەمی کردو هاواری کرد:

ـ ئەی بنیادەم، تۆ ئینسی، یان جنی؟ هەرچی هەی، وەرە دەرەوە مەترسە. ئەمانت هەیە!

کە وای گوت، هاتمە دەرەوە پێم گوت:

ـ گەنجۆ، تۆ وەکوو کوڕی منی. هەقایەتی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە:

(شەو هاتمە دەرەوە بۆ ئەوەی بچم ڕیسەکەم بفرۆشم. مامزێکم دی. راوم نا. هاتمە ئێرە. هاتمە ژوورەوەو مەنجەڵەکانم دی. ویستم شتێکیان لێ بخۆم. لە باتی خواردن لێدانم خوارد)

کابرا، ئەمەی بیست، بانگی کرد:

ـ خواردن و خواردنـەوەی بـۆ بێـنن. سـینییە خواردنێکیـان لـە پـێش دانـام. دەستم بە خواردن کرد. گەنجەکە پرسیاری لێکردم گوتی:

ـ پیرەژن ماڵتان لە کوێیە؟

گوتم:

ـ لە فلانە جێیە.

گوتی:

ـ چیت بیستووەو چ دەزانی لە دەنگوباسی دونیا؟

پێم گوت:

ـ کچێك هەیە مێردی بە سەگێك کردووە. هەقایەتەکەم لەسـەری هـەتا بنـی بـۆ گێڕایەوە. کابرا کـاتێ کـە ئەمـەی بیسـت، زانـی ئـەو ژنـەی باسـی دەکـەم ژنـی خۆیەتی. پێی گوتم: دایکە، دەبێ بچی ئەو کچەم بۆ بێنی.)

پیرەژن کە لە هەقایەتەکە بووەوە، رووی کردە کچەکەو گوتی:

کچم، ئەمەیە هەقایەتی من!

کچەکە، کـاتێ گـوێی لـە هەقایەتەکـە بـوو. پیرەژنـی ناسـی و پێـی گـوت: مـن ئەمەم دەویست!. ئینجا گوتی:

دەوڵەمەند بوون بە دەست خودایە، بەڵام من دەوڵەمەندت دەکەم. دەبێ جێ و رێی ئەو گەنجەم نیشان بدەی. وەرە بە یەکەوە دەچین.

پیرەژن گوتی:

ـ باشە، وەرە شەو لای من بخەوە بۆ ئەوەی بەیانی زوو دەربچین.

کچەکە چوو لە ماڵی پیرەژن خەوت. بەیانی بە یەکەوە دەرچوون. ئەو مامزەیان دی کە پێشتر پیرەژن دیبووی. کەوتنە دووی تا گەیشتنە ئەشکەوتەکە. بەردەکەیان لاداو چوونە ژوورەوە. کە چوونە ژوورەوە، چەند مەنجەڵێکیان بینی چێشتیان تێدا دەکوڵا. چوونە لای مەنجەڵەکان. کچەکە چووە پێش‌و دەستی دایە کەوگیر بۆ ئەوەی خواردن تیَ بکاو بیخوا. کە دەستی بە تێکردنی خواردن کرد، دەنگێك هات گوتی:

- کەوگیر، لێی دە.

کەوگیر گوتی:

- بۆ لێی بدەم؟ ئاغاژنی خۆمانە. چۆن لێی بدەم؟

بە ناو کۆشکەکەدا گەڕان. چوونە ئەم لا و ئەولا. لە پشت دارخورمایان بزربوون. گوێیان لە دەنگی قورئان خوێندن بوو. کە قورئانخوێن تەواو بوو، قورئانخوێنەکە دەستی بە گریان‌و نزگرە کرد. دەسەسڕی لە سەر چاوی دانابوو دەیگوت:

ئەی ماڵ! ئەی ماڵ!

بگری بۆ خاوەن شەقشەقەو گوارەو دەسماڵ!

ماڵ‌و درەختەکان هەموو دەستیان بە پێکەنین کرد. هەلهەلەیان لێدا. کابرا گوتی:

- بۆچی پێدەکەنن؟

وەڵامیان دایەوە:

- خانمی خۆمان لەلایە بۆچی بگرین؟

گوتی:

- کوا لە کوێیە؟!

کچە، کە ئەمەی بیست هاتە دەرەوەو خۆی ئاشکرا کردو ماچی کرد. ئەویش کە چاوی بە کچەکە کەوت، بە دیداری شادو گوشاد بوو. پێی گوت:

- فەرموو ڕووینە خواریَ! ماڵی خۆتە!

پیرەژن چووە دەرەوەو ڕۆیشت. گەنجەکەو کچەکە بە شادیو خۆشی ژیان.

لای ئێوە بووین‌و هاتینەوە.

## ٥ـ حەفت بەلەمی زێڕ

هەبوو نەبوو...

سولتانێك هەبوو، کچێکی ئازیزی بەردڵی خۆی هەبوو. لەناو حەوت ژووری یەك لەناو یەکی دانابوو. لەلەکەی تێشت و فراوین و شیوی بۆ دەبردو بێجگە لەو هیچ کەس چاوی پێنەدەکەوت.

ڕۆژێکیان، کچەکە بە باوکی گوت:

ـ باوکە، هەست دەکەم زۆر نەساخم. دەمەوێ لەم ژووره بچمە دەرەوە بۆ سەیران. بای باڵی خۆم بدەم و ماوەیەك بچمە ناو کۆشکی دەم ڕووبار.

باوکە چەند سەربازێکی بە پاسەوانی بەگەڵ دا. کچەکە کاتێ گەیشتە کۆشکەکە، حەفت بەلەمی زێڕی دی لەنگەرییان گرتبوو و لێکگرێدرابوون. بەلەمە گەورەکە کوڕێکی گەنجی تێدا بوو. کوڕەکەو کچەکە یەکتریان بینی. ڕۆژی پاشی کوڕەکە چەند پیاوێکی بۆ خوازبێنی نارده لای باوکی کچەکە!

باوکی کچەکە گوتی:

. بە شووی نادەم!

کوڕەکە دووبارە ناردییەوە داخوازی. داخوازیکەرەکە بە سوڵتانی گوتی:

ـ ڕاستە تۆ سوڵتانی بەڵام ئەم گەنجەیش کوڕە سوڵتانە. هەر مارەییەکی داوای دەکەی ئامادەیە بیدا.

باوکی کچەکە ڕازی بوو.

قسەیان کردو ڕێك کەوتن مارەییەکە ئەو حەفت بەلەمە زێڕە بێ کە لە بەندەرەکە ڕاگیرا بوون. دوای چەند ڕۆژێ. ئاهەنگی زەماوەندی کوڕەکەو کچەکەیان سازداو کوڕەکە چووە ماڵی کچەکە. کوڕەکە چل ڕۆژ بە زاوابەندی لە ماڵی خەزووری مایەوە. بەڵام نەچووە لای کچەکە. شەوێکیان کچەکە پێی گوت:

ـ کوڕی خەڵك! مەسەلە چییە؟! بۆ نایەیتە لام؟

کوڕەکە گوتی:

ـ من کوڕە سوڵتانم. تاقانەی باوکمم! دەمەوێ بتبەمەوە وڵاتی باوکم و کە چووینە ئەوێ لەوێ دێمە کنت!

بەیانی، کچەکە ئەمەی بۆ دایکی باس کرد. دایکیشی چوو بۆ باوکی کچەکەی باس کردو باوکەکە ڕازی بوو. باوکی کچەکە هەستا دوو تیپە سەربازی ئامادە کردو بە گەڵ کوڕو کچەکە دان. بەیانی، سوڵتان لە خەو هەستا ویستی سەر لە بەلەمەکان بدا دیتی نەماوەن. زانی قۆڵیان بڕیوە. گەنجەکەیش لە نیوەی ڕێگادا بە سەربازەکانی گوت:

ـ ئێوە بگەڕێنەوە. من پێویستیم بە ئێوە نییە!

سەربازەکان گەڕانەوەو کوڕەکەو کچەکە ڕۆیشتن. لە ناوەڕاستی بیاباندا گەیشتنە ئەشکەوتێك. کوڕەکە کچەکەی لە ناو ئەشکەوتەکە دانا. هەموو سبەینان دەچووە دەرەوەو ئێواران دەهاتەوە گۆشتی بنیادەمی دەهێنایەوە. بە کچەکەی دەگوت: هەستە چێشت لێنێ بۆ ئەوەی بیخۆین.

کچەکە، کاتێ زانی ئەمە بنیادەمخۆرە، پاش چەند ڕۆژێك بێزار بوو. گەنجەکە دێو بوو. ئێواران کە دەگەڕایەوە لای کچەکەو تیزی پێ دەکردو پێی پێدەکەنی و دەیترساند. ڕۆژێ، پێی گوت:

ـ لە چ بێزاری؟! دەتەوێ باوکت بنێرمە لات بۆ ئەوەی بیبینی؟!

کچەکە گوتی:

ـ کەیفی خۆتە!

دێوەکە چووە دەرەوە بۆ بەر دەرگای ئەشکەوتەکە. خۆی خستە سەر شکلی باوکی کچەکەو گەڕایەوە ژووری بۆ لای کچەکەو گوتی:

- ها، کچم چۆنی؟! مێردەکەت ڕەفتاری لەگەڵت چۆنە؟ تۆی بردۆتە کوێ؟ ئەوە هێناویێتی بۆ ئێرە؟
کچەکە گوتی:
. باوکە، مێردەکەم پیاوێکی باشە.
دێوەکە کاتێ ئەمەی بیست، چووە دەرەوە بۆ بەردەرگای ئەشکەوتەکەو خۆی خستەوە سەر شکلی جاران‌و هاتەوەو پێی گوت:
. باوکت هاتە لات؟
کچەکە گوتی
. بەڵێ هات.
کوڕەکە گوتی
. دەتەوێ دایکیشت بۆ ڕەوانە بکەم؟!
کچەکە گوتی
– کەیفی خۆتە.
دێوەکە چووە دەرەوە بۆ بەردەرگای ئەشکەوتەکەو خۆی خستە سەر شکڵی دایکی کچەکەو هاتەوە ژوورێ بۆ لای کچەکەو پێیگووت:
. ها، کچم...چۆنی؟ نەختێ لای کچەکە دانیشت‌و ئینجا چووە دەرەوەو لەبەر دەرگای ئەشکەوتەکە خۆی خستەوە سەر شکڵی جارانی‌و چووەوە ژوورێ بۆ لای کچەکەو پێی گوت:
. ها، دایکت هاتە لات؟!
کچەکە گوتی:
. بەڵێ هات.
ڕۆژی دووەم دێوەکە بە کچەکەی گوت:
. دەمەوێ داپیریشت بۆ ڕەوانە بکەم؟
کچەکە گوتی:
. کەیفی خۆتە!
دێوەکە خۆی خستە سەر شکڵی داپیری کچەکەو چووە ژوورێ بۆ لای کچەکەو پێی گوت:

. کچم، چۆنی؟ ئەمە چ حاڵێکە تۆ تێدای؟
کچەکە لەبەر دەردو خەمی خۆی دەستی بە گریان و زاری کردو بە داپیری گوت:
ـ داپیرە، بۆم دەرکەوتووە مێردەکەم بنیادەم نییە، دێوە! هەموو ڕۆژێ دەچێتە دەرەوە. کە دێتەوە گۆشتی بنیادەم دێنێ.
هەرچی لە دێوەکەی دیبوو بۆ داپیرەی گێڕایەوە. کە دێوەکە گوێی لەمە بوو، لەبەردەم کچەکەدا خۆی خستەوە سەر شکڵی دێوی جاران و پێی گوت:
ـ ئاخ لەمێژە بە دوای تۆدا دەگەڕام!! کەوتوویتە بەردەستم کەچی ئاوا لەبەردەمی خۆم قسەم پێ دەڵێی! بزانە چیت لێدەکەم!!
کچەکە کە گوێی لەم قسەیە بوو بوورایەوە. دێوەکە لە کورسی بەستییەوەو هەڵیواسی. ئینجا شیشەیەکی سوورکردەوەو داغی کردو پێی گوت:
. من دەچمە سەفەر. تا دێمەوە تۆ دەمری. کە هاتمەوە دەتخۆم.
بەم جۆرە کچەکەی جێی هێشت و ڕۆیشت. کە ئەو ڕۆیشت هێندەی پێنەچوو کاروانێك وێڵ ببوون، ڕێیان کەوتە لای ئەشکەوتەکە. گوێیان لە ناڵە ناڵی بنیادەمێك بوو. چوونە ناو ئەشکەوتەکە دیتیان کچێك بە پەت هەڵواسراوە. دایانگرتە خوارەوەو لێیان پرسی:
. تۆ کێی؟ کێ وای لێکردی؟
کچەکە لە سەرەتا تا کۆتایی هەموو سەربردەی خۆی بۆ گێڕانەوە. لەشیان شێلاو بە ئاردو ڕۆن هەنوویان. کچەکە پێی گوتن:
. بۆ خاتری خوا لەگەڵ خۆتانم ببەن. ئەگەر دێوەکە هات و پرسیاری منی کرد، ئێوەو خودا منی مەدەنە دەست.
کچەکەیان لەگەڵ خۆیان برد. (دە) سەعات ڕۆیشتن دیتیان پەڵە هەورێکی بچووکیان بە دواوەیە. بانگیان دەکا:
. ڕاوەستن نێچیری من نەبەن.
هات، ئەوەندەی لە کچەکە گەڕا نەیدۆزییەوەو گەڕایەوە. کاروانەکە ڕۆیشتن گەیشتنە شارو کچەکەیان لای پیرەژنێك دانا. کچەکە بە نان و زگ خزمەتی پیرەژنی دەکرد. دێوەکە هاتە ئەو شارەو خۆی کرد بە دێوەرە. بە ناو شاردا

گەڕا. کچەکە هاتە دەرەوە ویستی دەرزی لێ بکڕێ. دێوەکە دیتیو ناسییەوە. ئەویش دێوەکەی ناسییەوە. دێوەکە ویستی بیگرێ، کچەکە لەبەر دەستی هەڵات و چووەماڵی باوکی دیتی دایك و باوکی مردوون. براو پسمامی ماون. لێیان پرسی:

. چ حاڵە؟ لە چیای؟

کچەکە لە پرمەی گریانی داو سەربردەی خۆی لە سەرەتا هەتا کۆتایی بۆ گێڕانەوە. پێیان گوت:

. دێو چۆن دەوێرێ بێتە ئێرە؟ چ ئیشی هەیە دێ؟! بێتە ئێرە دەیکوژین!

پسمامی مارەی کردو گواستییەوە. دوای چەند ڕۆژێك دێوەکە هاتە خەونی. شەوێ دێوە خۆی گەیاندە ماڵیان. هەموو خەوتبوون. ڕۆحی هەموویانی کێشاو ڕۆحەکانی لە ناو شووشەیەك ناو لە سەر پەنجەرەی دانا. تەنیا کچەکەی لە خەودا هێشتەوە. ئینجا چوو مەنجەڵێکی گەورەی هێنا. پڕ ڕۆنی کردو قرچاندییەوە. ڕۆنەکە جۆشاو هەڵچوو. ئەوسا چووە سەلال بۆ لای کچەکەو بە خەبەری هێناو پێی گوت:

. هەستە واتدەزانی لە دەستم دەردەچی؟!

کچە، کە چاوی بە دێوە کەوت، بە حەپەساوی و تۆقاوی لە خەو ڕاپەڕی. لە ترسان لە جێی خۆی وشك بوو. دێوەکە کچەکەی بڵند کرد بۆ ئەوەی بیبا فڕێی بداتە ناو مەنجەڵە گەورەکە. لە ناوەڕاستی پلیکانەدا. کچەکە گوتی:

. خودایە بە تەمای تۆ!!

پاڵێکی بە دێوەکە نا. دێوەکە کەوتە ناو مەنجەڵەکە. قیڕەیەکی قایمی لێوەهات. کچەکە بە پلیکانەدا سەرکەوت بۆ ئەوەی مێردەکەی و کەس و کارەکەی بە خەبەر بێنێ. دیتی هەموویان مردوون. چووە سەر بان بۆ ئەوەی دوعاو نوێژ بکاو لە خوا بپاڕێتەوە. دەنگێ لەناو ماڵەوە هات گوتی:

. ڕۆحی خزم و کەس و کارت لە ناو شووشەیەکدایەو شووشەکە لەسەر لێوی پەنجەرەیە. شووشەکە بشکێنە، هەموو ڕۆحیان دەچێتەوە بەرو زیندوو دەبنەوە. کچەکە کاتێ گوێی لەو دەنگە بوو، تێگەیشت چی گوت. لەسەر بان هاتە خوارەوە چووە لای پەنجەرەکەو شووشەکەی هێناو شکاندی. هەموو

قیت بوونەوە دیتیان دێوەکە کەوتۆتە ناو مەنجەڵە گەورە پڕ ڕۆنەکەو تۆپیوە. سوپاسی خوایان کرد کە خۆیان و کچەکەیان ڕزگاریان بوو. تا مابوون بە شادی و گوشادی ژیان.

لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

*   *   *

## ٦ـ تەباشی زێڕ

هەبوو نەبوو....

ژن و مێردێك هەبوون، کچێکیان هەبوو تەمەنی شەش ساڵ بوو. ڕۆژێ، ژنەکە نەخۆش کەوت. نەخۆشییەکەی نزیکەی بیست ڕۆژ درێژەی کێشا. هەجەلی هاتبوو. وەسیەتی کردو ئەمانەتی خۆی تەسلیم کردەوەو گوتی:

ـ ئەم قوتووە بچووکە بۆ کچەکەمە بە ئەمانەت لەسەر تەقچکەی دابنێن. ئەگەر مردم تکاتان لێ دەکەم کەس نەیهێنێتە خوارەوەو نەیکاتەوە. تا کچەکەم گەورە دەبێ‌و دەستی دەگاتێ لەسەر تەقچکەکە دایگرێتە خوارێ، ئەوسا با خۆی بیکاتەوە.

ژنەکە مردو کفن‌و دفن کرا. کچەکە ناوی (تەباشی زێڕ) بوو. هەموو مانگێ باوکی دنەی دەدا هەوڵ بدا دەستی بگاتە تەقچکەکە بەڵام هێشتا بچووك بوو دەستی نەدەگەیشتێ.

پاش چەندین ساڵ، (تەباشی زێڕ) تەمەنی بوو بە بیست‌و هەشت ساڵی‌و هێشتا دەستی نەدەگەیشتە تەقچکەکە.

باوکە بڕیاری دا ژن بهێنێتەوە. ویستی بە ئارەزووی دڵی خۆی کچێك بخوازێ‌و بیهێنێ. کچێکی دەویست ئەوەندە جوان بێ لە جوانیدا مانەندی نەبێ! دوای چەند ڕۆژێ، باوکە بە کچەکەی گوت:

. کچم، وەرە سەرینێك لە بن پێت دانێ و قوتووی سەر ئەم تەقچکەیە بێنە خوارێ. بزانین چی تێدایە.

باوکە سەرینێکی هێناو لە بن پێی کچەکەی دانا. کچەکە دەستی گەیاندە قوتووەکەو هێنایە خوارێ و کردیانەوە. دیتیان خشڵ و زێڕی دایکی کچەکەی تێدایە. باوکە گوتی:

. ئەم شتانە بە خۆت وەکە. دایکت بۆ تۆی داناوە.

کچەکە خۆی بە خشڵ و زێڕەکە خەملاند بوو بە جوانترین کچی دونیا. جوانی وەکوو خۆی نەبووەو نابێ!! باوکی تەماشای کردو گوتی:

. کچم، مادەم تۆ ئەوەندە جوانی، بۆچی خۆم ماندوو بکەم و بە دوای ژنێکی تردا بگەڕێم بیخوازم، نەوەڵڵا هەر تۆ بکەم بە هاوسەری خۆم باشترە.

کچەکە بە باوکی گوت:

. باوکە، شتی وا چۆن دەبێ؟ تۆ باوکی منی و من کچی تۆم!

کابرا، کە ئەمەی بیست، چووە بازاڕ. نیوەڕۆ هاتەوە قاپقاپەیەکی زمڕووتبەندی هێنا وەکو تریفەی مانگ ئاوی چاوی دەبرد. بە کچەکەی گوت:

. (تەباشی زێڕ)، بڕۆ ئەم قاپقاپەیە ببە. بە پێی کچانی بجەڕبێنە. بە پێی هەر کچێکی کرد، ئەو کچەم بۆ داخوازی بکە.

کچەکە قاپقاپەکەی وەرگرت و ڕۆیشت. ئەم ماڵ گەڕا، ئەو ماڵ گەڕا. لە سەراپای شار، یەکێکی نەدۆزییەوە قاپقاپەکەی یەك بە پێ بێ. گەڕایەوە ماڵێ و بە باوکی گوت:

. باوکە، لە سەراپای شار کچێکم نەدیتەوە ئەم قاپقاپەیەی یەك بە پێ بێ!

کابرا، کە ئەمەی بیست، پێی گوت:

. خۆت لە پێی کە بزانە بۆ تۆ چۆنە؟!

کاتێ کچەکە قاپقاپەکەی لە پێ کرد، بە کاری خوای دەتگوت بۆ پێی ئەو بڕاوە. وەکوو ئەنگوستیلەی پەنجە پڕ بە پێی بوو.

کابرا کە ئەمەی بینی شادو گوشاد بوو گوتی:

- (تەباشی زێڕ)، مادەم قاپقاپەکە یەك بە پێی تۆ بوو، دەبێ تۆ ببی بە هاوسەرم. وەرە با مارەت بکەم.

کچەکە گوتی:

- باوکە، شتی وا حەرامە. نابێ!

باوکە پێی گوت:

- دەبێ و زیاتریش!

چوو مەلا بێنێ بۆ ئەوەی (تەباشی زێڕ) ی لێ مارە بکا. کە کچەکە دیتی هیچ چارەی نییە، گوتی: بە خوا بێتەوە دەینێرم (مۆمدان)ێکی زیوم بۆ بکڕێ. کە کابرا هاتەوە بە کچەکەی گوت

- ئێستا دەچمە دەرەوە. کە هاتمەوە لە گەڵت دەنووم. خۆت بڕازێنەوە!

کچەکە گوتی:

- باشە. چ دەڵێی وا دەکەم.

کە کابرا چووە دەرەوە، (تەباشی زێڕ) چل نانی هێنا لە ناو (مۆمدان)ەکەی دانا و بایی سەد ڕۆژ پێویستی هێنا و چووە ناو مۆمدانەکەو لەسەر خۆی کلیلی دا. کە عیشا داها، کابرا بە کەیفخۆشی هاتەوە ماڵێ. بەو هیوایەی بچێتە کن کچەکەی. لە دەرگای دا، کەس وەڵامی نەدایەوە. هەر لە دەرگای داو هاواری کرد: (تەباشی زێڕ)، دەرگا بکەوە!

هیچ وەڵام نەبوو. تا چوار سەعات هەر لە دەرگای داو هاواری کرد: (تەباشی زێڕ)، دەرگا بکەوە! لە قسەی خۆم پەشیمانم! کەس دەرگای لێ نەکردەوە.

دراوسێ بەسەر باندا چوونە حەوشەو دەرگایان کردەوە. دیتیان کەس لە ماڵێ نییە. هاواریان کرد: (تەباشی زێڕ) وەرە دەرەوە!

ئەم لا گەڕان ئەولا گەڕان نەیاندۆزییەوە. باوکە، بە دەم غەمو خەفەتەوە نووست. بەیانی دیسان ئەوەندەی لێی گەڕاو بانگی کرد، نەیدۆزییەوە.

کابرا چوو کوڵهەڵگرێکی هێنا قرۆشێکی دایێ و پێی گوت:

- ئەم (مۆمدان)ەم لەگەڵ هەڵگرە!

کوڵهەڵگرەکە (مۆمدان)ەکەی هەڵگرتو کابرا بردییەوە لای ئەو وەستایەی لێی کڕیبوو. کە وەستا چاوی پێکەوت، لە مەسەلەکە گەیشتو بە کابرای گوت:

- بۆچی هێناوتۆتەوە؟

کابرا گوتی:

- نامەوێ

وەستا گوتی:

قەیدی ناکا! ها، پارەکەت بدەمەوە!

وەستا (مۆمدان)ەکەی وەرگرتەوە. لە کوڵی هەمان کوڵهەڵگری کردو ڕۆیشت. چووە خزمەت کوڕی سوڵتانو هەقایەتەکەی بۆ گێڕایەوە. کوڕی سوڵتان گوتی:

- نرخی چەندە؟

گوتی:

- دوو سەد لیرەیە.

کوڕی سوڵتان گوتی:

- باشە!

وەستاکە جوولەکە بوو. بە کوڕی سوڵتانی گوت:

- ئەی کوڕی سوڵتان، ئاگادار بە ئەم مۆمدانە لە ژوورێك دانێو خواردنو خواردنەوەیشی بۆ دابنێ.

کوڕی سوڵتان (مۆمدان)ەکەی لە ژوورەوە داناو دایکی راسپارد، گوتی:

- دایکە، چۆن ئاگاداری من دەبی، ئاوها ئاگاداری ئەم (مۆمدان)ە بە!

دایکی گوتی:

- بە چاوان!!

کوڕەکە پێی گوت:

- دایکە، هەموو ڕۆژێ بەیانیو نیوەڕۆو ئێوارە خواردنی بۆ دابنێ. ئەگەر بچمە دەرەوەیش دڵم هەر لەلای ئەم (مۆمدان)ەیە.

دایکە، چوار ڕۆژ بوو خواردنی دادەنا. دەیدی خواردنەکە خوراوە. کوڕی سوڵتان دوازدە دۆتمامی هەبوو. دوو ڕۆژ پێش ئەوەی (مۆمدان)ەکە بکڕێ، بە تەما بوو یەکێك لە دۆتمامەکانی بخوازێ. کە (مۆمدان)ەکەی کڕی، وازی لەم بیرە هێنا. کاتێ دۆتمامەکان بە مەیان زانی، بیریان کردەوە دەبێ هۆی پاشگەزبوونەوەی پسمامەکەیان چی بێ؟

کوڕەکەیش هەموو ڕۆژێ دەچووە لای (مۆمدان)ەکەو تەماشای دەکرد. دەیدی ساغەو دەستی لێنەدراوە.

ڕۆژێکیان، کوڕە ڕووی کردە (مۆمدان)ەکەو گوتی:

ـ ئەگەر لە ناو (مۆمدان) نەیەیتە دەرەوە، خۆم دەکوژم.

کاتێ (تەباشی زێڕ) ئەمەی بیست، مۆمدانەکەی کردەوەو بە کوڕەکەی گوت:

ـ دامپۆشە، خوا داتپۆشێ!

لەو ساتەوە، کوڕەکە کچەکەی لە خۆی مارەکردو چووە کنیو کچەکە بوو بە ئازیزی بەردڵی. کچەکە ئەوەندە جوان بوو دەتگوت مانگە، دەتگوت ئاگری داگیرساوە.

کوڕەکە چووە لای دایکیو گوتی:

ـ دایکە، من ڕۆحم لە ناو ئەم (مۆمدان)ە دایە. ئەگەر خواردنی لێببڕی من دەمرم!

دایکە پێی گوت:

ـ کوڕم، بۆچی خواردنی لێ دەبڕم؟!

سوڵتان لە جەنگدا بوو. ڕۆژێ، لە دوای کوڕەکەی نارد بۆ ئەوەی لە گەڵیان بچێتە شەڕ.

کوڕەکە چووە لای دایکیو پێی گوت:

ـ دایکە، ئەمە کلیلی ژوورەکەمە با لای تۆ بێ. بەڵام بیشارەوە نەیدەیتە کەس! من لەگەڵ باوکم دەچمە شەڕ. زۆر وریای (مۆمدان)ەکە بە. ئەگەر دۆتمامەکانم هاتنو داوای کلیلی ژوورەوەیان کرد، مەیاندەرێ!

دایکە گوتی:

ـ چۆن کلیلیان دەدەمێ کوڕم !

کوڕەکە پێی گوت:

. ئاگاداری ئەوەیش بە ئەگەر (مۆمدان)ەکە خواردن نەخوا، مانای وایە من مردووم.

ئینجا دەستی دایکی ماچ کردو دەرچوو بۆ ئەوەی بچێتە شەڕ. کاتێ، کوڕە چووە شەڕ، دۆتمامەکانی گوتیان: پسمامەکەمان پاش ئەوەی ئەو (مۆمدان)ەی کڕی ئیتر ڕازی نەبوو زەماوەند لەگەڵ یەکێکمان بکات. دەبێ ئەو (مۆمدان)ە شتێکی تێدابێ. چوونە لای دایکی کوڕەکە، کە مامۆژنی خۆیان بوو و پیرەزاڵێکی بە ساڵا چوو بوو. دوویان تەندووریان جۆش داو ئەوانیدی دەورەیان لە پیرەژن دا. دانیشتن (کەزی)ی پیرەژنیان کردەوەو سەریان ڕۆنی و پێیان گوت:

. ئەوە بۆچی قژی خۆت نەشووشتووە؟ دیارە کەس نییە خزمەتت بێنا!

ئەویش گوتی:

. قەیدی نییە

کەزیی پیرەژنیان کردەوە. پیرەژن لەبەر دەستیان خەوی لێکەوت. بە فێڵ کلیلیان لە بەرکی دزیو دەرگای ژوورەوەیان کردەوە. (مۆمدان)ەکەیان دەرهێنا بردیان لەسەر تەندووریان دانا. (مۆمدان)ەکە گەرم داهاتو کچەکەی لە ناو داغ بوو. کچەکە دەرگای (مۆمدان)ەکەی کردەوەو هاتە دەرەوەو گوتی:

. توخوا سترم بکەن خوا سترتان بکا!

پێیان گوت:

. هەی جندەو حەشەری! ئەوە تۆ بووی لێنەگەڕای پسمامەکەمان زەماوەند لەگەڵ ئێمە بکا؟!

چەقۆیان هێنا هەموو لەشیان شەقار شەقار کردو خۆڵەمێشیان پڕوەرکردو حەسیرپێچیان کردو فڕێیان دایە سەر ڕێگا. خواو ڕاستان پیرەژنێك بەوێدا تێپەڕی. کچەکەی هەڵگرتەوەو بردی. پیرەژن دەستی بە تیمارکردنی کچەکە کرد. پیرەژن سەگێکی هەبوو. سەگەکە برینەکانی کچەکەی لستەوە. دوای بیست ڕۆژ کچەکە چاك بووەوە. هیچ بەلاّ و قەلاّی لێ نەما.

پیرەزالی دایکی کوڕەکە خەو بردبوویەوە، کە لە خەو هەستا دیتی ژوور کراوەتەوەو (مۆمدان)ەکە دەرگای والآیە. خواردنی هێنا لە تەنیشت (مۆمدان)ەکەی دانا. دوای نیوەڕۆ هات سەیری کرد دیتی خواردنەکە لە دەقە خۆیەتی. لە دڵی خۆیدا گوتی:

. ئەوە ئیشی دۆتمامەکانی کوڕەکەمە.

ئینجا گوتی:

ئێستا کوڕەکەم مردووە!

حەفت ڕۆژ تازیەی داناو گریا. کوڕی سوڵتان لە شەڕ هاتەوە. یەکسەر چووە ژوورەوەو بە دایکی گوت:

. دایکە، (مۆمدان)ەکە چۆنە؟

کە دایکە چاوی بە کوڕەکەی کەوت، لە خۆشییان قیژاندی:

. کوڕم، مۆمدانەکە وازی لە خواردن هێنا. بۆیە وامزانی تۆیش مردووی!

کوڕەکە، کاتێ ئەمەی بیست، چووە سەلال بۆ ژووری (مۆمدان)ەکەو دیتی (مۆمدان)ەکە کراوەتەوە. هاواری کرد:

. هۆ (تەباشی زێڕ)، هۆ! سۆمای چاوم!

کەس وەڵامی نەدایەوە. لە پرمەی گریانی داو بە دایکی گوت:

. توخوا دایکە، یەك پرسیارت لێ دەکەم ڕاستیم پێ بڵێ: دۆتمامەکانم هاتنە لات، یان نا؟

دایکە گوتی:

. بەڵێ کوڕم، هاتن کەزیییان کردمەوەو سەریان دۆزیم. لەبەردەستیان خەو بردمییەوە. بە فێڵ کلیلەکەیان دزیو کە بە ئاگا هاتم دیتم نەماونو ژوورەکە کراوەتەوە.

کوڕەکە گوتی:

. باشە!

کوڕی سوڵتان لە هەژمەتان نەخۆش کەوت. جاڕچیان بە ناو شار خست: (پێویستە هەمووتان بچنە ماڵی سوڵتان. دارو برنجو ڕۆن ببەنو شۆربا بۆ کوڕی سوڵتان لێ بنێن. کوڕی سوڵتان نەساخە!)

خەڵکەکە دەستیان بە شۆربا لێنان کرد. کە شۆربایان بۆ کوڕەکە دەبرد. کوڕەکە قاپە شۆرباکەی تێك وەردەداو ڕووی دەکردە ناو ئاوەڕۆی مدبەق. هەموو خەڵکەکە شۆربایان لێنا. تەنیا ئەو پیرەژنە ما کە (تەباشی زێڕ)ی لە لا بوو. کوڕی سوڵتان پرسی:

- ئایا هەموو عالەم شۆربایان لێناوەو کەس نەماوە؟

پێیان گوت:

- تەنیاماڵە پیرەژنێکی پیرو پەڕەپووت ماوە!

چوونە ماڵەکەو پێویستییەکانیان بۆ بردن. (تەباشی زێڕ) قاپە شۆربایەکی لێنا. ڕەش دەتگوت قیرە!! لە ناو قاپێکی کردو ئەڵقەی کوڕی سوڵتانی لەناو ناو بە پیرەژنی گوت:

- دایکە، ئەم قاپە شۆربایە ببە؟ بیدە دەست کوڕی سوڵتان. ئەو نەبێ نەیدەیتە دەست هیچ کەسی تر.

پیرەژن چووە بەردەرگای ماڵی سوڵتان. نۆکەران دیتیان، پێیان گوت:

- چت دەوێ؟

پیرەژن گوتی:

- شۆربام هێناوە دەمەوێ پێشکەشی کوڕی سوڵتانی بکەم.

کە دیتیان شۆرباکە ڕەشە، گوتیان: کوڕی سوڵتان شۆربای شیر ناخوا چۆن ئەم شۆربا ڕەشە دەخوا؟ بڕۆ ڕێی خۆت دایکە!

کوڕی سوڵتان لە ژوورەوە گوێی لە قسەکان بوو گوتی:

- بیهێنن!

کوڕەکە، شۆرباکەی تێکوەردا. ئەڵقەکەی دی. قاپەکەی گرت و هەموو شۆرباکەی فڕ کردو بە پیرەژنی گوت:

- پیرەژن (تەباشی زێڕ) لای تۆیە؟

پیرەژن گوتی:

- بەڵێ، لای منە خەمی لێ مەخۆ!

کوڕە کە ئەمەی بیست، هەستا لەگەڵ پیرەژنەکە چووە ماڵی. کە (تەباشی زێڕ) چاوی بە کوڕی سوڵتان کەوت، خۆی لە ژوورەوە شاردەوە. کوڕەکە پێی گوت:

. وەرە دەرەوە من کەمتەرخەمیم کردووە دەرهەق بە تۆ.

کچەکە هاتە دەرەوە. کوڕی سولتان کچەکەی ماچ کرد. هەردووکیان دەستیان بە گریان کرد. ئەوسا کوڕەکە کچەکەی هێنایەوە ماڵیّو لێی پرسی:

. دوٚتمامەکانم چییان لێکردی؟

کچەکە هەقایەتەکەی لە سەری هەتا بنی بۆ گێڕایەوە. کوڕەکە گوتی:

. دەبیّ تۆڵەی تۆیان لێبکەمەوە!

کچەکەی بردە ناو کۆشکو لە ژوورێکی دانا. جاڕچی نارد جاڕی دا:

ـ هەرکەسیّ کوڕی سوڵتانی خۆش دەویّ. دارو گزرە کۆکاتەوەو لە گەڵ نەفت بیهێنیّ.

ئەوسا فەرمانی دا دوٚتمامەکانیان هێنا. ژمارديان دوازدە کچ بوون. هەموویان سووتاندن.

کوڕەکە مایەوە خۆیو دایکیو (تەباشی زێڕ). هەموو بەو پەڕی خۆشیو شادی ژیان.

لای ئێوە بووینو هاتینەوە.

* * *

# ٧ـ كوڕە سوڵتانی توور بە کۆم

هەبوو نەبوو...

بەرگدروویەك هەبوو، سێ كچی هەبوو: گەورەو ناوەنجی و بچووك.

ڕۆژێ، كچەكان بۆ گەڕان چوونە دەرەوە. كوڕی سوڵتان چاوی پێكەوتن ئەشقی یەكێكیان بوو. كوڕی سوڵتان چەند پارچە مەرمەڕێكی بۆ بەرگدرووی باوكی كچەكان ناردو داوای لێكرد ئەو بەردە مەرمەڕانە ببڕێ و دەستە بەرگێكی بۆ لێ دروست بكات.

بەرگدرووەكە، كە ئەمەی بیست، هەر واقی وڕما. بە پەستو غەمباری گەڕایەوە ماڵێ. كچە گەورەكەی هاتە لایەوەو پێی گوت:

- باوكە، چ بووە؟ بۆ وا عادزی؟

كابرا گوتی:

- هیچ!

كچی ناوەنجی هاتو لێی پرسی:

- باوكە، ئەوە چ بووە؟ بۆ وا عادزی؟

باوكە پێی گوت:

. کوڕی سوڵتان چەند پارچە بەردێکی مەڕمەڕی بۆ ناردووم. داوا دەکا بۆی بیبڕم‌و بیدوورم‌و بۆی بکەم بە دەستە بەرگێك. کچم، تێماوم نازانم بەردی مەڕمەڕ چۆن هەڵدەبڕیٚ‌و چۆن دەدووریٚ؟

کچەکە گوتی:

. شتی وا چۆن دەبیٚ؟

ئینجا کچی بچووك هات‌و بە باوکی گوت:

. باوکە، ئەوە چ بووە؟ بۆ وا عادزی؟

کابرا هەقایەتی خۆی بۆ گێڕایەوە. کچەکە گوتی:

. خەمت نەبیٚ من لە پشتتم! بڕۆ ئاقاری. هەندیٚ وردکە بەرد کۆکەوە. لەناو دەسەسڕێکی بکەو بۆ کوڕی سوڵتانی ببە. کە کوڕی سوڵتان هات‌و لە کۆڕەکە دانیشت، پێی بڵیٚ:

. ئەی کوڕی سوڵتان، مەڕمەڕەکانم بڕیوە بەڵام پێویستم بە داوە. ئەمر بەم برادەرانە بکە ئەم وردکە بەردانە بکەن بە داو بۆ ئەوەی دەستە بەرگەکەی پیٚ بدوورم.

بەرگدروو کاتیٚ ئەمەی لە کچەکەی بیست، گوتی:

. بەخوا تەگبیرێکی باشە!

چووە دەرەوە هەندیٚ وردکە بەردی کۆکردەوەو ڕووی کردە ماڵی سوڵتان. هەندەی پێنەچوو کۆڕ بەسترا. کابرای بەرگدروو چووە ناو کۆڕەکەو سەلامی کردو بە کوڕی سوڵتانی گوت:

. ئەی کوڕی سوڵتان، مەڕمەڕەکانم بڕیوەو ئامادەیە بۆ دروون بەڵام پێویستم بە داو هەیە. ها، ئەم وردکە بەردانەم هێناوە، بە برادەران بڵیٚ بیکەن بە داو تا دەستە بەرگەکەی پیٚ بدوورم.

خەڵکەکە گوتیان:

. ئەوە تۆ چ دەڵێی؟! بەرد چۆن دەکریٚ بە داو!

کابرای بەرگدروو پێی گوتن:

. گەلۆ، ئەی بەردی مەڕمەڕ چۆن هەڵدەبڕیٚ‌و دەکریٚ بە دەستە بەرگ؟!

کوڕی سوڵتان بە کابرای بەرگدرووی گوت:

. وەرە پێم بڵێ کێ مەسەلەی ئەو داوەی فێرکردی؟
بەرگدروو پێی گوت:
. کچە گەورەکەم.
کوڕی سوڵتان گوتی:
. ڕاست ناکەی!
کابرا گوتی:
. خەڵك فێریان کردم!
کوڕی سوڵتان گوتی:
. ڕاست ناکەی! ڕاستی بڵێ!
بەرگدروو گوتی:
. کچە بچووکەکەم.

کە بەرگدروو بە کوڕی سوڵتانی گوت کچە بچووکەکەی فێری کردووە، کوڕی سوڵتان واقی وڕما. بەرگدروو مەڕمەڕەکەی دایەوە کوڕی سوڵتانو گەڕایەوەماڵێ. کچە بچووکەکەی بەرگدروو بۆ خوێندن دەچووە لای مەلاژن. هەموو سبەینان دەچووە مەکتەبو ئێواران دەهاتەوە. کە کوڕی سوڵتان بە مەی زانی، هەموو ڕۆژێ دەچوو لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەی دادەنیشتو کە کچەکە بە بن پەنجەرەکەدا تێدەپەڕی، پێی دەگوت:

. کچی بەرگدروو چ دەڵێی؟
کچەکە پێی دەگوت:

نۆكو نووکە باس
دەردو مەراقی خاس
تۆ چیت؟

ئەمەی دەگوتو دەڕۆیشت. کوڕی سوڵتان ئاگری ئەشقی تێبەر بوو، چووە لای مەلاژنو پێی گوت:

. مەلاژنن بۆ خاتری خوا ها، بگرە ئەوە سێ سەد لیرە! هەر ئەوەندەیە وا بکە ماچێك لەو کچە بکەم!
مەلاژ، پێی گوت:

برۆ هەندێ شیرنەمەنی بکڕە. خۆت بکە شیرنەمەنیفرۆش‌و وەرە بەر دەرگای مەکتەب. کە کچەکان هاتنە دەرەوە بۆ لات، پڕ دە کچەکەو ماچی کە!
کوڕی سوڵتان چوو کەرەستەی شیرنەمەنیفرۆشی کڕی‌و لەسەر سەری خۆی داناو هات بانگی ڕاهێشت:
. شیرنەمەنی! شیرنەمەنی!
کە کچە قوتابییەکان گوێیان لێ بوو، مەلاژن هەر یەکەو هەندێ پارەی دانێ بۆ ئەوەی شیرنەمەنی پێ بکڕن. پارەی دایە هەموو کچەکان. کچی بەرگدرووی بۆ ئاخیری هێشتەوە. ئەوسا پێی گوت:
. ها، ئەم پارەیە! بڕۆ شیرنەمەنیم بۆ بکڕە.
کوڕی سوڵتان بە کچەکەی گوت:
. نەختێ چاوەڕێ بکە.
کە شیرنەمەنی بە هەموو کچەکان فرۆشت‌و کچەکان چوونەوە ژووریێ‌و کچی بەرگدروو بە تەنێ مایەوە، کوڕی سوڵتان گرتی‌و ماچی کردو نقورچەیەکی لێداو هەموو شیرنەمەنییەکەی دایەو هەڵات.
کچەکە بە گریان گەڕایەوە لای مەلاژن. مەلاژن پێی گوت:
. گوێ مەدەرێ کچی خۆم! لەوانەیە دیبی تۆ بە کچەکەی خۆی دەچی بۆیە وایکردبێ.
دوای نیوەڕۆ، کە کچە قوتابییەکان بەربوون، کچی بەرگدروو بە پێیان بەرەو ماڵ گەڕایەوە. کوڕی سوڵتان لە پەنجەرەوە چاوی پێکەوت‌و پێی گوت:
. ها، کچی بەرگدروو، چ دەڵێی؟
کچەکە پێی گوت:

نۆك و نووكە باس
دەرد و مەراقی خاس!
تۆ هەقت چیە؟

کوڕی سوڵتان پێی گوت:
ـ ئای..! هەر تۆ نەبووی یەکەم جار گوتت: مامە خوا ڕزقت بدا ؟ یانی شیرنەمەنی!

کچەکە گوتی:
ئۆی! کەواتە ئەوە تۆ بووی واتکرد. قەیدی نییە با بۆ تۆ وا بێ!
پەنجەی خۆی گەستو بە پەستو غەمباری گەڕایەوە ماڵێو بە باوکی گوت:
. باوکە، دەمەوێ دەستە بەرگێکم بۆ لە پێستەی بزن دروست بکەی!
باوکە پێی گوت:
. ئاسانە بۆت دەکەم.
باوکە دەستە بەرگێکی بۆ کچەکەی لە پێستەی بزن دروست کرد. کچەکە ئێوارێ پێستەکەی کردەبەرو چووە بەر دەرگای ماڵی کوڕی سوڵتانو لە دەرگای دا. گوتیان:
. کێیە لە دەرگا دەدا؟
کچەکە گوتی:
. منم. فریشتەی مەرگم. دەرگا بکەنەوە.
کە دەرگایان کردەوە، کچەکە گوتی:
. کوا کوڕی سوڵتان؟ دەمەوێ ڕۆحی بکێشم.
کە گوێیان لێ بوو، ترسانو گوتیان:
- ئەی فریشتەی مەرگ، بۆچی ڕۆحی ئەو دەکێشی؟! ئەم هەموو کۆیلەو بەندانە لێرەن!! ڕۆحی ئەمانە بکێشە!
کچەکە ڕازی نەبوو. لە کوڕی سوڵتان بە ژوورێ کەوت. کوڕەکە نوستبوو. بە خەبەری هێنا. کاتێ کوڕەکە چاوی بە شکلی کچەکە کەوت، زەندەقی چوو. لە ترسان خۆی وەرگێڕاو کەوتە سەر روو. کچەکە سەلکە تووڕێکی لە گیرفانی دەرهێناو لە کۆمی ڕاکردو چووە دەرەوە.
کوڕی سوڵتان بەم جۆرە مایەوە. ڕاکشا بوو پەلی لە خۆی هاوێشتبوو. خەڵکەکە دەیانگوت:
. ئێستا دەمرێ، سبەی دەمرێ! هە بزانە مرد!
کە خزمو کەسو کاری بەم جۆرەیان بینی، کردیانە قەپو قیڕو گریان. کوڕەکەیش هەر دەینالاندو هاواری دەکرد.

بەیانی خەبەری نەخۆشی کوڕی سوڵتان بڵاوبووەوە. کاتێ کچەکە بیستی، گوتی:

. وەی بەسەزمان! دەترسم بمرێ!

هەستا مەندیلێکی لەسەری ناو خۆی کردە حەکیم. داردەستێکی بە دەستەوە گرت. دەگەڕاو بانگی ڕادەهێشت:

. حەکیم...حەکیم..!

چووە بەر دەرگای ماڵی سوڵتان. بانگیان کرد:

. وەرە حەکیم! تەماشای ئەم کوڕە بکە.

گوتی:

. باشە!

چووە ژوورەوە. پێی گوتن:

. دەرمانی لای منە. بەڵام ئێوە دەبێ هەموو بچنە دەرەوە. من و ئەو تەنیا جێ بێڵن.

کە ئەوان چوونە دەرەوە. کچەکە سەلکە توورەکەی لە کۆمی کوڕەکە هێنایە دەرەوە. کوڕەکە بە ئاگا هات. کە کچەکە دیتی کوڕەکە بە ئاگا هات، جێی هێشت و ڕۆیشت.

لە ماڵی کوڕی سوڵتان بوو بە شادیو شایلۆغان. کوڕەکە هەستایەوەو لەبەر پەنجەرە دانیشت. کچی بەرگدروو بەوێدا هات. کوڕەکە پێی گوت:

. ها، کچی بەرگدروو چ دەڵێی؟

کچەکە گوتی:

نۆکو نووکە باس

دەردو مەراقی خاس

کوڕەکە پێی گوت:

. لە بیرتە ئەو ڕۆژە پێت گوتم: مامە هەموو شیرینەمەنییەکەم بدەرێ؟!

کچەکەیش گوتی:

. لە بیرتە ئەو ڕۆژەی سەلکە توورێکم لە کۆمت ڕاکرد؟

کوڕەکە گوتی:

. ئۆی..! کەواتە ئەوە تۆ بووی؟!

پەنجەی خۆی گەستو زۆری ئەزیەت خوارد. چووە لای باوکی و پێی گوت:

. باوکە، دەمەوێ بۆم بنێریتە داخوازی کچی بەرگدروو!

باوکی پێی گوت:

. کوڕم شتی وا چۆن دەبێ؟ ئەو باوکی بەرگدرووە، تۆ باوکت سوڵتانە! چۆن ئەو کچە دێنی؟!

کوڕەکە گوتی:

. یان ئەو، یان کەسم ناوێ!

باوکی داخوازیکەری ناردنە لای بەرگدرووەکە. گوتیان:

. کوڕی سوڵتان کچی تۆی دەوێ.

بەرگدروو ڕازی بوو. گەڕایەوە ماڵێ قسەکەی بۆ کچەکانی گێڕایەوە. کچی گچکە گوتی:

. باوکە منی بدەرێ.

سوڵتان پارەی نارد مارەییان بڕیو پارەی قەلەنیان دا. باوکی کچەکە چووە بازاڕ. جیازیان کڕیو جلیان دووریو پێویستی بووکیان ئامادە کردو ناردیانە ماڵی سوڵتان.

کوڕی سوڵتان نیازی وا بوو شەو کاتێ کچەکەیان گواستەوە، کچەکە بکوژێ. کچی بەرگدروویش ئەمەی دەزانی. داوای دەفرە هەنگوینێکی لە باوکی کرد. ئەویش بۆی هێنا. کچەکە دەم وچاوی کچێکی لەسەر دەفرە هەنگوینەکە کێشاو ڕەنگی کرد. بە داو دەسرۆکێکی لە سەری پێچا. ماڵی سوڵتان هاتن بۆ ئەوەی بووک ببەن. ماڵی کچە کچەکەیان ڕازاندەوەو تاسو لووسیان داو دایانە بەربوودییەکانی ماڵی سوڵتانو ئەوانیش گواستیانەوە بۆ ماڵی سوڵتان. کچەکە دەفرە هەنگوینەکەی لەگەڵ خۆی برد. ڕۆژ ئاوا، کچەکەیان برد لە ژوورەوە دایان نا. کچەکە جلی خۆی لە بەر دەفرە هەنگوینەکە کردو لەسەر نوێنی داناو ئەو داوەی بە دەستەوە گرت کە سەری دەفرەکەی پێ بەستبوو، خۆیشی چووە ژێر چوارپاکە. کە داوەکەی ڕادەکێشا، سەری دەفرەکە دەهەژایەوە. کە عیشا داهات، کوڕی سوڵتانیان بردە ژوورەوەو لە

پاڵ کچەکەیان کرد. کوڕەکە یەکەم جار کە چووە ژوورەوە وایزانی دەفرەکە بووکە، ڕووی تێکردو گوتی:

– ئەی کچی بەرگدروو، چۆن ئەو پەندەت پێ کردمو سەلکە توورت لە کۆمم ڕاکرد؟

کچەکە لە بن چوارپاوە داوەکەی ڕاکێشاو دەفرەکە جوولایەوە. کوڕەکە دەست بە خەنجەر هەڵیکوتایە سەر دەفرەکەو دایە بەر خەنجەرانو شەقو پیلی کرد. هەنگوینەکە ڕژا. کوڕەکە هەنگوینەکەی لستەوە. تامی شیرین بوو. گوتی:

- ئۆی..! کچی بەرگدروو! تۆ کە خوێنت ئەوەندە شیرین بێ، دەبێ خۆت چۆن بی؟!

لە هەژمەتان لە پرمەی گریانی داو گوتی:

– مادەم کچی بەرگدرووم کوشت، بە خوا خۆیشم دەکوژم.

ویستی لە خۆی بدا، کچەکە لە ژێر چوارپا هاتە دەرەوە. دەستی گرتو گوتی:

- نەکەی! شتی وا نەکەی!!

کوڕەکە، کە دیتی کچەکە زیندووەو نەمردووە خەنی بوو. هەستایەوەو لەگەڵی نووست. بۆ بەیانی دایکی کوڕەکە هات. دیتی هەردووکیان لەسەر چوارپا خەوتوون. هەلهەلەی لێدا. کوڕەکەو کچەکە بە خۆشیو شادی بەخەبەر هاتن.

هەموو بە شادیو گوشادی ژیان.

لای ئێوە بوونو هاتینەوە.

* * *

## ٨ـ کوڕە کەچەڵی زاوای سوڵتان

هەبوو نەبوو...

سوڵتانێك هەبوو، سێ کچی هەبوو. کچەکان گەورە ببوون باوکیان هێشتا بە مێردی نەدابوون. کچەکان تەگبیریان کرد: هەستان سێ کاڵەکی گەییویان بۆ باوکیان نارد. بۆ ئەوەی تێبگا مەبەستیان چییە. کاڵەکەکانیان لەسەر سینیەك دانا و سەرپۆشێکیان بە سەر داداو بە دەستی کارەکەرێك بۆ سوڵتانیان نارد. کارەکەرەکە سینییەکەی برد لە بەردەم کۆڕی خەڵکدا لە پێش سوڵتانی دانا. سوڵتان سەرپۆشی لەسەر سینیەکە هەڵدایەوەو کاڵەکەکانی دی. ئەوانەی لە کۆڕەکە بوون بە سوڵتانیان گوت:

ـ کچەکانت دەیانەوێ بە شوویان بدەی!

سوڵتان گوتی:

ـ شتێکی ئاساییە. چی تیا بەستە نییە.

ئەوسا فەرمانی بە جاڕچی دا جاڕ بدا:

(بەیانی هەموو گەنجانی شار بێن. بە ژێر پەنجەرەی کچەکانی سوڵتاندا بڕۆن. هەر کچێ دڵی هەر کامە گەنجی گرت، هەنارێکی تێدەگرێ و کچە لە گەنجەکە مارە دەکەن).

خەڵکەکە خۆشی خۆشییان تێکەوت. هەموو گەنجەکان دەیانگوت:

. کچێ هەر پەسندم دەکاو هەنارم بۆ داوێ.

بە ڕێکەوت ڕۆژێ کچە گچکەی سوڵتان لەبەر پەنجەرەی خۆی دانیشتبوو کە بە سەر باخچەی کۆشکیدا دەڕوانی. باخەوانێکی کەچەڵیان هەبوو. کچەکە دیتی باخەوانەکە ورگی حەیوانی لەسەری خۆی کردەوە. دەستە جلێکی تازەی کردە بەرو دوو پۆکلە قژی بەردایەوە: یەکێ زێڕو یەکێ زیو. کە جلەکانی خۆی کردە بەر دەتگوت مانگە. کچەکە ئەشقی بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی:

. ئەگەر گەنجەکان بێرەدا تێپەڕین، تا ئەم کوڕە کەچەڵە نەیە، هەنارەکەم بۆ کەس ناوێم.

ڕۆژی دووەم، خەڵك کۆبوونەوە. کچەکان لە شانشینی کۆشك دانیشتن. خەڵکەکە بە بەر پەنجەرەدا تێپەڕین: کچە گەورەکە هەناری خۆی لە یەکێ لە دوو پسمامەکەی داو پسمامەکەی بۆ ئەو بوو. دوای نەختێ پسمامەکەی دیکە هات. کچی ناوەنجی هەناری خۆی لێداو ئەویش بوو بە هی ئەو کچە. مایەوە کچە بچووکەکە. ئەوەندەی خەڵك بەوێدا تێپەڕی، هەناری خۆی لەکەس نەگرت تا کەس نەما. سوڵتان گوتی:

. کەس ماوە نەهاتبێ؟

گوتیان:

. کەس نەماوە تەنیا باخەوانێکی کەچەڵی کۆتی گەنی ماوە.

سوڵتان گوتی:

. بانگی کەن.

بانگی باخەوانی کەچەڵیان کرد. کە باخەوان هات، کچەکە دەستی دایە هەنارەکەی و بۆی هاوێشت. باوکی زۆر خەفەتی لێ خوارد. تووڕە بوو و گوتی:

. تۆ کچە سوڵتانی مێرد بە کوڕە کەچەڵێك دەکەی؟ ئەتۆ شەرمت بە خۆ نییە؟

کچەکەی دەرکردو گوتی با بە خۆو بە مێردەوە لەناو مدبەق بژین. کچەکە بۆ خۆی چێشتی لێ دەناو دەیانخوارد.

سـولّتان لـەم ماوەیـەدا ئاهـەنگێکی(دە)ڕۆژی گێـڕا. شـێربازییان لـە پـێش دەکـردو تـەپڵ و کـەڕەنایان لێدەدا. لـە دوو هـەموو کەسـی گێڕابـووەوە. زۆر هەوەسـی بـە دوو برازاکـەی و دوو کچـەکەی دەهـات کـە بەخۆشـی و شـادی دەژیان.

کەچـەڵیش جلـی پۆشـتەی خـۆی کردەبـەرو بـێ ئـەوەی کەسـی پـێ بحەسـێ چووە پاڵ ژنەکەی. ژنی سوڵتانیش لۆمەی کچە گچکەکەی کردو گوتی:

. کیژم، ئەوە ئیش بوو تۆ کردت؟ ئەوە بۆ وات لە خۆت کرد؟

دوای چـەند مانگێـك، کـوڕە کەچـەڵ ئێسـترێکی شـەلی کـڕی. هـەموو ڕۆژێ سـواری دەبـوو و منداڵـە وردکـە بـە دووی دەکـەوتن. گاڵتـەیان پێـدەکردو بەردیان تێ دەگرت و بە گۆرانی دەیانگوت:

دان دان،

کەچەڵ کەچەڵ، زاوای سوڵتان!

ڕۆژێ، جـەنگ لـە بـەینی ئـەم سـوڵتانەو قڕاڵـی فـەڕەنگ هەڵگیرسا. سـوڵتان لەشـکری کـۆکردەوەو ڕەوانـەی جـەنگی کـرد. لەشـکرەکە شـکا. سـوڵتان برازایـەکی خـۆی نـارد. برازاکـەی لەشـکری فـەڕەنگی شـکاندو بـە خۆشـی و سادی گەڕانەوە. دوای چەند مانگێك، سوڵتان نەخۆش کەوت، گوتی:

. دڵم گۆشت مامزی دەوێ.

خـەڵك دەچـوونە ڕاوە مـامزو مامزیـان بـۆ دەهێنـا. بـەڵام بـە کـاری خـوای گۆشـتەکە تـاڵ بـوو. شـۆرباکەی تـاڵ دەردەچـوو. سـوڵتان بـە دوو ،برازاکـەی گوت:

. بڕۆن مامزێکم بۆ ڕاو بکەن گۆشتەکەی باش و بەتام بێ. تفت و تاڵ نەبێ.

برازاکـانی خیوەتیـان بـردو چـوون لـە دەشـت و دەرخیوەتیـان هەڵـدا. تـاژی و توولەی ڕاویشیان برد. ئەوەنـدەی هـەوڵیان دا مامزێك ڕاو بکەن نەیانتوانی. سـێ ڕۆژ مانـەوە هیچیان دەسـت نەکـەوت. کـوڕە کەچـەڵیش لـەولاوە چووە دەرەوە. خیـوەتی لـە ئاقـاری هەڵـدا. ڕۆژی یەکـەم نزیکـەی (دە) مـامزی ڕاو کرد. کەچی دوو کوڕە وەزیرەکە، واتا برازاکانی سوڵتان، قەت هیچیان ڕاو

نەکرد. کوڕە کەچەڵ لە ڕاووشکار بەردەوام بوو تا بیست مامزی بە نێچیر گرت. پیاوێکی نارده لای دوو براکەو پێی گوتن:

. گۆشتی مامز لای ئەم ڕاوکەرە دەست دەکەوێ.

گوتیان:

. بە ڕاست؟!

گوتی:

. بەڵێ!

دوو براکە هاتنە لای کوڕە کەچەڵو گوتیان:

– ئەم مامزانە نافرۆشی؟

کوڕە کەچەڵ پێی گوتن:

. ئەم مامزانە بە پارە نادەم بەڵام ئەگەر یەکێ بیەوێ، مۆری خۆمی لە سمتی دەدەمو چەندی گۆشت مامز بوێ دەیدەمێ.

کە براکان ئەم قسەیان بیست، لە دڵی خۆیاندا گوتیان: با گۆشتەکەی لێ وەربگرینو لێ بگەڕێین مۆرێکمان لێ بدا. لە کوێ دەماننناسێتەوە!

بەم جۆرە ڕازی بوون. کەچەڵ مۆری هێنا. یەکەو مۆری لێدانو هەشت مامزی دانێ. مامزەکانیان وەرگرتو بە شادومانی گەڕانەوە چونکە دەیانزانی سوڵتان لێیان ڕازی دەبێ.

کوڕە کەچەڵ زوو خۆی پێچایەوەو بەر لە ولداش زاواکانی گەڕایەوە شار. چووە لای ژنەکەیو هەقایەتەکەی بۆ گێڕایەوەو پێی گوت:

. هەستە شۆربایەکی باشو زەریف بۆ باوکت لێ بنێ. ئەمەیش گۆشت مامز!!

کاتێ دوو گەنجەکە گەڕانەوەو شۆربایان بەو گۆشتە لێنا کە هێنابوویان، بە کاری خوای گۆشتەکە تاڵ بوو دەتگوت زەقنەبووتە!! سوڵتان شۆرباکەی ڕژاند. لەولاوەش ژنی کوڕە کەچەڵ شۆربای لێناو لە لەگەنێکی کرد. شۆرباکە دەتگوت سەرتووە. چووە لای دایکیو گوتی:

. دایکە، ئەم شۆربایە بۆ باوکم ببە بیخوا.

دایکە گوتی:

ــ دەبڕۆ...بڕۆ! باوکت شۆربای کەسی نەخواردووە! شۆربای دوو برازاکەیشی نەخوارد. چۆن شۆربای تۆ دەخوا. کە لێشت تووڕەیە.

کچەکە گوتی:

. دایکە، شتی وا گرنگ نییە. تۆ تەنیا ئەوەندە بکە شۆرباکەی بۆ ببە. بە خوا هەر بخوات چاك دەبێتەوە.

ژنە شۆرباکەی بۆ سوڵتان برد. سوڵتان تامی کرد دیتی دەڵێی سەرتووە. شیرین دەڵێی شەکرە. پرسی:

. کێ ئەم شۆربایەی لێ ناوە؟

ژنەکەی پێی گوت:

. ئەمە دەستلێنی کچەکەتە. ژنی کوڕە کەچەڵ !

سوڵتان گوتی:

. بە ڕاستی شۆربایەکی باشە!

سوڵتان شۆرباکەی خواردو چاك بۆوە.

دوای چەند ساڵێك، دووبارە شەڕ لە بەینی ئەم سوڵتانەو قراڵی فەڕەنگ دا کەوت. سوڵتان لەشکرێکی بە سەرکردایەتی دوو برازاکەی نارد. لەشکرەکەیان لە یەکەم شەڕو پێکدادانددا شکا. کوڕە کەچەڵ کاتێ بەمەی زانی. سوای ئێسترە شەلەکەی بوو و بۆی دەرچوو. منداڵ بە بەردان کەوتنە دووی. هاواریان دەکرد:

دان دان،

کەچەڵ کەچەڵ، زاوای سوڵتان!

ڕۆیشت تا گەیشتە چۆڵەوانی. ئێسترەکەی لە ناو ئەشکەوتێك بەستەوە. کوڕەکە خۆی منداڵە جنۆکە بوو. چەند تاڵە قژێك و چەرخێکی دەرهێنا. تاڵە قژەکانی هەڵکڕووزاند. ئەسپێکی بۆ هات وێنەی نەبوو. جل وبەرگی خۆی کردەبەرو سواری ئەسپەکەی بوو. سوڵتان چوو بۆ ئەوەی سەیری لەشکرەکەی بکا. دیتی سەربازێك پەلاماری سەربازەکانی فەڕەنگی داو زۆری لێ کوشتن. ئەسپەکەی(دە)ی دەکوشت، خۆی (سەد)ی دەکوشت. تا

ڕۆژئاوا کوشتاری کرد، ئەوسا لە لەشکر دابڕاو ڕکێبی لە ئەسپەکەی داو گەڕایەوە ناو ئەشکەوتەکە. جلە کۆنەکەی کردەوە بەرو چووەوە ماڵێ.

سوڵتان گوتی:

. ئای لەو گەنجە! توخوا ئەمە کێیە؟

پێیان گوت:

. نایناسین.

ڕۆژی دووەم، سەر لە نوێ شەڕ دەستی پێکردەوە. کوڕە کەچەڵ دووبارە سواری ئێستره شەلەکەی بوو و چووە دەرەوە. منداڵ دایانە بەر بەردەپلووکان و هاواریان کرد:

دان دان،

کەچەڵ کەچەڵ، زاوای سوڵتان!

هیچ ئاوڕی لێ نەدانەوە. ڕۆیشت تا گەیشتە ئەشکەوتەکە. ئێسترە شەلەکەی لەناو ئەشکەوت بەستەوە. تاڵە قژەکانی دەرهێنا و هەڵیکرووزاندن. ئەسپی گۆڕین پەیدا بوو. جل وبەرگیشی لەسەر پشت بوو. کوڕە کەچەڵ جل وبەرگەکەی کردەبەرو سواری ئەسپەکە بوو و پەلاماری لەشکری فەرەنگی دا. دیسان سوڵتان چاوی پێکەوت و کەیفی پێهات. کوڕەکەچەڵ دەستی بە کوشتار کرد. زۆری لە دوژمن کوشتن. (دە) هەرێمی لە دەستی فەرەنگان ڕزگار کرد. سوڵتان زۆری هەوەس پێهات و گوتی:

. توخوا بزانن ئەمە کێیە؟!

کە شەڕ تەواو بوو، فەرەنگ بەزین. عەسر داهات، کوڕە کەچەڵ بە سواری ئەسپەکەی لە لەشکر دابڕاو هەڵات. سوڵتان هاواری کرد:

. گەورەم ڕاوەستە!!

کوڕە کەچەڵ وەڵامی نەدایەوە. دوو برازاکەی سوڵتان وەکوو کەر سەریان شۆڕ کردبوو سەیریان دەکرد.

ڕۆژی سێیەم، دیسان لەشکری هەردوولا داکەوتنە شەڕگە. سوڵتان گوتی:

ـ ئەگەر گەنجەکە هات، هەوڵدەن ئابلۆقەی بدەن و لێ مەگەڕێن ڕابکات.

گوتیان:

ـ سەر سەرو سەر چاو!

بەیانی، کوڕە کەچەڵ وەکوو جاران سواری ئێسترە شەلەکەی بوو. کە چووە دەرەوە منداڵە وردکە بە بەردان وەریگەڕانیو هاواریان کرد:

دان دان،

کەچەڵ کەچەڵ، زاوای سوڵتان!

کوڕە کەچەڵ هیچ خۆی لە گووره نەبرد. ڕۆیشت تا گەیشتە ئەشکەوتەکە. تاڵە قژەکانی هەڵکرووزاند. ئەسپی تاین پەیدا بوو. دەستە بەرگێکی لەسەر پشت بوو. کوڕە کەچەڵ دەستە بەرگەکەی کردە بەرو سوار بوو چووە شەڕ. لەگەڵ دوژمندا کەوتە شەڕو لێکدان. کوشتارێکی زۆری لێ کردن. دوژمن پشتیان داو هەڵاتن. پاشان دەوری دوو هەزار سەربازی بە سەردا قڵپ بووەوە. تێی وەرهاتن‌و دەستیان بریندار کرد.

شەڕ بڕایەوە. کوڕە کەچەڵ ویستی بگەڕێتەوە. گرتیان‌و بردیانە لای سوڵتان. سوڵتان دیتی بریندارە دەسەسڕی خۆی دەرهێناو لە دەستی بەست. کوڕە کەچەڵ دەرفەتی وەرگرت‌و تێی تەقاند هەڵات.

سوڵتان بە شادی‌و خۆشی گەڕایەوە. بەڵام نەختێ هەستی بە غەمگینی دەکرد چونکە کوڕەکەی لە دەست چوو، نەیتوانی هیچ قسەی لەگەڵدا بکا. سوڵتان گەڕایەوە ماڵێ. زۆر بەو سەرکەوتنە شادومان بوو. کوڕە کەچەڵیش گەڕایەوە ماڵێ‌و بەسەرهاتەکەی بۆ ژنەکەی گێڕایەوەو برینەکەی دەستی‌و دەسەسڕی سوڵتانی پێشان دا. کچە دەسەسڕەکەی بۆ دایکی بردو گوتی:

– دایکە، سەیر کە! مێردەکەی من بوو دوژمنی فەرەنگی شکاند. شایەد بەو شایەدەی دەستی بریندار بووەو باوکم بە دەسەسڕی خۆی برینەکەی بۆ بەستۆتەوە. ئەمەیش دەسەسڕەکەیە!

دایکی پێی گوت:

ـ دە بڕۆ. لە خۆت هەڵدە! لەگەڵ ئەم درۆ گەورەیەت!! مێردی تۆ ئەو کەچەڵەیە کە ڕۆژ تا ئێوارێ وەکوو ئێستر دەخەوێ. لە خواردن بەولاوە هیچ ئیشێك ناکا.

کچەکە پێی گوت:

ـ دایکە، هەستە بچین برینەکەت نیشان بدەم.

دایکە گوتی:

ـ دە هەستە با بچین !

چوونە مدبەق. کوڕە کەچەڵ خەوتبوو. کچە دەستی کوڕە کەچەڵی هەڵکردو برینەکەی نیشانی دایکی دا.

ژنی سوڵتان چووە لای مێردی‌و پێی گوت:

ـ کوڕە کەچەڵ دەستی برینداره‌و برینەکەی بە دەسەسڕی تۆ بەستراوەتەوە. ها، ئەوەیش دەسەسڕەکەت!

سوڵتان گوتی:

ـ ئای لەو عاجباتییە!! هەستە بچین.

چوونە لای کوڕە کەچەڵ. سوڵتان لێی وردبووەوە، ناسییەوه‌و پێی گوت:

ـ تۆ مادەم ئاوها بووی، بۆچی پێت نەدەگوتم؟

کوڕە کەچەڵ گوتی:

ـ ئەمە بەختی منە!

ئینجا کوڕە کەچەڵ باسی ئەو گۆشت مامزەی بۆ سوڵتان کرد کە دوو برازاکەی بۆیان هێنابوو، پێی گوت:

ـ من ئەو گۆشتەم دانی‌و مۆری خۆمم لەسەر سمتی دان. بڕۆ تەماشاکە بۆت دەردەکەوێ.

سوڵتان گازی دوو برازاکەی کرد. ڕووتی کردنەوە. قسەی کوڕە کەچەڵ ڕاست دەرچوو.

سوڵتان هەردوو برازاکەی دەرکرد. لەگەڵ کچە گچکەکەی پێکهاتەوه‌و هێنایەوە ماڵێ. زەماوەندێکی تازەی بۆ کردن‌و جیازێکی زۆری بۆ کچەکەی کرد. کوڕە کەچەڵ‌و کچی گچکەی سولتان بە شادی‌و خۆشی لەگەڵ سوڵتان ژیان.

لای ئێوە بووین‌و هاتینەوە.

* * *

## ٩ـ برا گچکه

هەبوو نەبوو...

کابرایەك هەبوو، سێ کوڕی هەبوو. ڕۆژێ، پێی گوتن:

ـ ڕۆڵـەکانم، وەسـیەت بـێ کـە مـن مـردم، بمشـۆن و لـەناو تـابووتێکم بنـێن و تابووتەکە لە پشتی وشترێك باربکەن و وشترەکە بەڕەڵڵا کەن. وشترەکە لـە کوێ یخ بوو، لە شوێنی یخ بوونەکەی گۆڕم بۆ لێ بدەن.

کوڕەکان سەری ڕەزامەندییان بۆ دانەواند.

دوای چەند ڕۆژێك، باوکیان سەری خستە سەر سەرین و ئەمری هەقی بەجێ گەیاند. شووشتیان و کفنیان کردو لە ناو تابووتێکیان نا. تابووتەکەیان لە وشترێك بارکردو وشترەکەیان بەرهەڵدا. پاش چەند ڕۆژێ، کوڕەکان گوتیان:

ـ جەنازەی باوکمان بزر بوو. دەترسین شتێکی لێ هاتبێ.

بە دوای وشترەکەدا گەڕان. گەیشتنە سێڕیانێك هەر یەکە لە براکان چووە ڕێگایەك. برای گچکە ملی ڕێیەکی گرت. گەیشتە کۆشکێك دیتی وشترەکە وا لەوێیە. گـۆڕێکی لێداو تابووتەکەی باوکی ناشت. کە ناشتی، مەنجەڵێك لەناو کۆشکەکە بوو برنجی تێدابوو. هەندێ برنجی لە قاپێك کردو خواردی.

لە پڕ گوێی لە دەنگی ژنێك بوو گوتی:

ـ هونەر هونەری ئەو کەسەی نییە کە چێشتەکە تێدەکاو دەیخوا، هونەر هونەری ئەو کەسەیە کە لێی دەنێ.
کوڕەکە، کە گوێی لە دەنگەکە بوو، سەری هەڵبڕو سەیری سەرەوەی کۆشکەکەی کرد. ژنێكو منارەیەکی دی لە کەللەسەری بنیادەم دروست کرابوو. ژنەکە گوتی:
ـ ئەو برنجە من لەوێم دانابوو. ئەوەی داببەزێو برنجەکە بخوا دەبێ شەترەنجم لەگەڵ بکا. ئەگەر من لەوی ببەمەوە دەیکوژمو ئەگەر ئەو لە من بباتەوە، شووی پێ دەکەم.
کوڕەکە گوتی:
ـ ڕازیم!
تومەز ژنەکە، کە چاوی بە کورشەکە کەوتبوو، ئەشقی ببوو!
دەستیان بە یاری کرد. ژنەکە خەریك بوو لێی بباتەوە. بەڵام سستی کردو بە ئەنقەس دۆراندی. کوڕەکە ژنەکەی لە خۆی مارەکردو چووە کنی. چەند ڕۆژێك لەوێ مایەوە. ژنەکە پێی گوت:
ـ پیاوەکە، دەمەوێ هەقایەتی خۆمت بۆ بگێڕمەوە:
( ڕۆژێ، لە دەو ڕووبار سەری خۆم دەشووشت. تاڵە قژێکی سەرم بەربووەوە. لە ناو قووتوویەکی یاقووتم نا. بە مێردەکەمم گوت:
ـ پسمام دەترسم یەکێ بیدۆزێتەوەو بۆ خاتری ئەم تاڵە قژە بە دوامدا بێ!)
(لێرە بە دواوە هەقایەتەکە لەسەر زمانی ژنەکە نامێنێو وەکوو کەسی سێیەم باسی دەکرێ. و.)
کوڕەکە پێی گوت:
ـ شتی وا دوورە. کێ دەگاتە ئێرە؟
ژنەکە پێی گوت:
ـ ئەوە پێم گوتی. ئاگاداری خۆت بە!
بە ڕێکەوت ژنەکە قوتووە یاقووتەکەی بزر کرد. مەیتەری کوڕی سوڵتان دۆزییەوە. کردییەوە دیتی تاڵە قژێکی تێدایە. گوتی:
ـ بەخوا بۆ کوڕی سوڵتانی دەبەم!

کە بۆ کوڕی سوڵتانی بردو کوڕی سوڵتان چاوی پێکەوت، لەشکرێکی کۆکردەوەو بە دوای خاوەنی تاڵە قژەکەدا کەوتە گەڕان. گەیشتە کۆشکەکە. مێردی ژنەکە نووستبوو، سەری بە سەر ڕانی ژنەکەی کردبوو. ژنەکە لە ناکاو دیتی ئەو هەموو لەشکرە هات. کە ئەو لەشکرەی دی ویستی مێردی بە خەبەر نەهێنێ چونکە خۆشی دەویست. گریا و فرمێسکی بەسەر گۆنای کوڕەکەدا ڕژا. کوڕەکە بە ئاگا هات. دیتی ژنەکەی دەگری. پێی گوت:

– دۆتمام، ئەوە چیتە؟

ژنەکە گوتی:

. ئەدی پێم نەگوتی ئاگادار بە دێن! ئەوە هاتوون و لە هنداو کۆشکن!

لەشکرەکە هاتن بە ژنەکەیان گوت:

. هلۆ، بە گەلمان کەوە!

ژنەکە بە خۆو بە مێردی دەستیان دایە شیرو داکەوتنە مەیدانی شەڕ. لە کاتی شەڕدا قاچی ئەسپی ژنەکەیان شکاند. ژنەکەیان بە دیل گرت و لە مێردەکەی وەرهاتن. لە تیلەقەی پشتیان داو بەریان دایەوە. ئەویش لە هۆش خۆی چوو. ژنەکەیان بردو گەڕانەوە شاری خۆیان.

کاتێ کوڕەکە لە زەبری لێدانەکە هاتەوە هۆش خۆی، دانیشت و سەیری دەوروبەری خۆی کرد، کەسی نەبینی. ملی ڕێی گرت و ڕۆیشت. ڕۆیشت تا گەیشتە شاری سوڵتان. لەولاوەیش سوڵتان، کە ژنەکەیان بۆ برد، گوتی:

با مارەت بکەم.

ژنەکە گوتی:

. شتی وا چۆن دەبێ؟ ئێوە مێردی منتان کوشتووە. دەبێ پرسەی بۆ دابنێم.

سوڵتان گوتی:

. باشە.

ژنەکە حەفت ڕۆژ تازیەی دانا.

کوڕەکەیش گەیشتە شار. لە برسان لاکەی لێوە دەهات. چووە ماڵە دراوسێیەکی سوڵتان و لە دەرگای داو گوتی:

. نەختێ خواردنم بدەنێ.

گوتیان:

ـ ئێمە هیچ خواردنمان نییە. بۆ خۆت برۆ ماڵی سوڵتان خێراتیان داناوە.

کوڕەکە بە ژنی ماڵەکەی گوت:

ـ ژنەکە، ماڵەکەیان کامەیە؟

ژنەکە گوتی:

ـ وەرە بچین پیشانت بدەم!

کە چوون، کوڕەکە گوتی:

ـ تۆ لە دەرگا بدە!

ژنەکە گوتی:

ـ باشە، خەم ناکا!

لە دەرگای دا. گوتیان:

ـ کێیە؟

کوڕەکە گوتی:

ـ منم

گوتیان:

چت دەوێ؟

گوتی:

ـ ژنی سوڵتانم دەوێ. ئیشم پێیە! ژنی سوڵتان هاتە دەرێ. کە کوڕەکە چاوی پێکەوت ناسییەوە. ئەویش کوڕەکەی ناسییەوە. بە کوڕەکەی گوت:

ـ ئەوە چۆن گەیشتیتە ئێرە؟

گوتی:

خوا منی گەیاندە ئێرە!

ژنەکە بە کوڕەکەی گوت:

ـ ها، ئەم بازنە مەزرینگییە بگرە. بیبە بازاڕ بیفرۆشە! دوو ئەسپی پێ بکڕە. لە ئاقاری، لە فلانە جێ چاوەڕێم بکە. لەوێ دەگەمە لات.

کوڕەکە گوتی:

ـ باشە چی دەڵێی وا دەکەم!

کوڕەکە بازنی مەزرینگی وەرگرت و چووە بازاڕ فرۆشتی. دوو ئەسپی پێ کڕی و چووە ئەو شوێنەی ژنەکە بۆی دیاری کردبوو. بە ڕێکەوت کۆیلەیەك بە دزی گوێی لە قسەکانیان بوو. کە عیشا داهات، کۆیلەکە چووە شوێنەکە. دیتی دوو ئەسپ بەستراونەتەوەو گەنجەکە ڕاکشاوەو خەوی لێکەوتووە. کۆیلەکە، کە دیتی کوڕە خەوتووە، جڵەوی ئەسپەکانی لە دەست دەرهێناو ئەسپەکانی چەند هەنگاو لەوێ دوور خستەوە. کاتێ کچەکە هات و دوو ئەسپەکەی دی، لە تەنگاوییان سەرنجێکی وای لە کۆیلەکە نەدا. پێی گوت:

. زوو ئەسپەکان زین کە.

کۆیلەکە ئەسپەکانی زین کرد. هەردووکیان سواربوون و ڕۆیشتن. لە هەورازان هەڵکشان و لە نشێوان داکشان تا بەیانی هەر ڕۆیشتن. بەیانی، ژنەکە ئاوڕی دایەوە بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ مێردەکەی بکا دیتی ئەمە مەرزوقی کۆیلەیە. پێی گوت:

ـ مەرزوق، هەی بێ ویژدان!! ئەمە چییە؟!! هەی سەگی سەگباب! ئەمە چ ئیشە تۆ کردووتە؟

کۆیلەکە پێی گوت:

. خانم، هاتم دیتم کابرا خەوتووە. وەك یارمەتیدانێك جڵەوی ئەسپەکانم لە دەست دەرهێنا. ئەو هەر خەوتبوو. ئەوە بوو تۆ هاتی!

ژنەکە گوتی:

. قەیدی نییە. ئەوە تازە هاتووە!

ژنەکە چاوی بە بیاباندا گێڕا. بیابان ڕەملی دەکرد. بە کۆیلەکەی گوت:

. مەرزوق، ئەم کوندە هەڵگرە. ڕاکە لەم ئاوە پڕی کە!

کۆیلەکە گوتی:

. بە سەرچاو!

کۆیلەکە دەستی دایە کوندەکەو ڕۆیشت. کە ئەو دوورکەوتەوە، ژنەکە بە لایەکی تردا ڕۆیشت تا گەیشتە ناو هۆزێکی عارەبان. شێخی هۆزەکە مێوانداریییەکی باشی کرد. هەر وایزانی پیاوە. ژنە حەفت ڕۆژ لەوێ مایەوە. شێخ بۆی دەرکەوت ئەمە ژنە، پێی گوت:

. مادەم ژنی بۆچی شوو بە من ناکەی؟

ژنەکە پێی گوت:

. چ قەیدییە بەڵام من زۆر نییە مێردم مردووە. دەبێ پرسەی بۆ دابنێم.

ڕۆژی سێیەم، کە شەو داهات، ژنەکە ڕایکردو چووە ناو هۆزێکی تر. شێخی ئەو هۆزەش میوانداریيەکی باشی کرد. ژنەکە سێ ڕۆژ لەوێ مایەوە. شێخ زانی ئەمە ژنەو پێی گوت:

. مادەم تۆ ژنی، دەمەوێ خۆم زەماوەندت لەگەڵ بکەم.

ژنەکە پێی گوت:

. چ قەیدییە بەڵام لە مێژ نییە مێردەکەم مردووە. دەمەوێ تازییەی بۆ دابنێم.

ژنەکە ویستی ڕابکا بەڵام نەیتوانی. کە ماوەی تازیە تەواو بوو، شێخ پێی گوت:

. خۆت بۆ مارەکردن ئامادە کە!

ژنەکە پێی گوت:

. نەختێ سەبر بگرە! ئێمە ڕەوشتمان وایە ئەگەر بمانەوێ شوو بکەین، چل ڕۆژ لەگەڵ چل کچدا بە بەلەم لە ناو ڕووبار دەگەڕێین.

شێخ چل کچی لەناو کەشتییەك ناو پاسەوانی لەگەڵ ناردن. کە گەیشتنە ڕووبارەکە، ژنەکە بە پاسەوانەکانی گوت:

. ئێوە بگەڕێنەوە، ئێمە هیچ ترسمان لەسەر نییە.

پاسەوانەکان گەڕانەوە!

دوای دوو سەعات، ژنە پەتی کەشتییەکەی پچڕاندو لەگەڵ تەوژمی ئاودا ڕۆیشتن تا گەیشتنە دوورگەیەك چل شۆڕە سواری تێدا بوو. ژنەکە گوتی:

. چ بکەین؟ ئابلۆوقەیان داوین!

ئینجا بە چل کچەکەی گوت:

ئەگەر هاتن، پێشوازییان لێ دەکەین.

کە هاتن، ژنەکە پێی گوتن:

. بەخێر بێن! چاوەڕێمان دەرکردن.

سوارەکان گوتیان:

. خۆش بن.

ئينجا ژنەكە پێى گوتن:

. ئێوە چل پياوو ئێمە چل ژنين! هەر يەكێكمان بۆ يەكێكتان.

پێيان گوت:

. باشە! دەى با مارەيى ببڕين.

ژنەكە پێى گوتن:

. نەختىَ سەبر بگرن. ئێمە ڕەوشتمان وايە ئەگەر بمانەوىَ زەماوەند بكەين، قاوە بۆ دەزگيرانەكانمان لىَ دەنێين.

پێيان گوت:

. باشە. قەيدى نييە!

ژنەكە گوتى:

. بەڵام بەو مەرجەى كە قاوەمان لێنا و پێشكەشمان كرد، هەمووتان فنجانە قاوە بە دەستەوە بگرن و ڕاوەستن تا من دەڵێم بخۆنەوە، ئەوسا هەمووتان بە يەكەوە قاوەكە بخۆنەوە.

گوتيان:

. زۆر باشە!

ژنەكە قاوەى كوتا، كوڵاندى و دەرمانى بێهۆشى تێكرد. چل فنجانە قاوەى تێكردو دايە ژنەكان و ئەوانيش يەكەو فنجانێكيان دايە پياوەكان. ئينجا ژنەكە پێى گوتن:

. بخۆنەوە!

هەموو بە يەكەوە خوارديانەوەو لە جێى خۆيان وەرپلان. ژنەكە جلى لەبەر هەر چل پياوەكە كردەوەو بردى. بە خۆو بە هەر چل كچەكە ڕۆيشتن تا گەيشتنە شارێك. سوڵتانى ئەو شارە تازە مردبوو. خەريك بوون بازى بەختييان هەڵدەدا. كە هەڵياندا، بازەكە چوو لەسەرسەرى ژنەكە نيشت. وايانزانى پياوە. كرديانە سوڵتان. ژنەكە لەسەر تەختى سەڵتەنەت دانيشت و تاجى لەسەر ناو دەستى بە فەرمانڕەوايى شارەكە كرد.

پێش هەموو شتێك فەرمانێكی دەركرد وێنەی خۆیو هەر چل كچەكە بكێشنو لەسەر دەرگای سەرای بدەن. گوتی:
. هەركەسیێ هاتو لەم وێنەیە وردبووەوە، دەسگیری بكەن.
ئەو پیاوانەی ژنەكە تەفرەی دابوون. هەموو بە دوایدا دەگەڕان. دوو شێخی هۆزی عارەبانو ئەو چل سوارەی مادەی بێهۆشی دەرخوارد دانو مێردەكەیو سوڵتانو كۆیلەكە.
ڕۆژێ، كۆیلەكە بەوێداهات. لە وێنەكە ڕاماو گوتی:
. ئاخ..! ئاغا ژنەكەم چۆنی؟
پاسەوان گرتیانو خەبەریان دایە ژنەكەو گوتیان:
. كۆیلەیەكمان گرتووە.
ژنەكە گوتی:
. فڕێی دەنە بەندیخانە!
دوای ماوەیەكی كەم، مێردەكەی هات. سەیری وێنەكەی كردو گرتیان.
بە ژنەكەیان گوت:
. پیاوێكمان گرتووە لە دیار وێنەكە قسەی دەكرد. ژنەكە گوتی:
. بیهێنن!
ژنەكە، كە چاوی پێكەوت، شادو گوشاد بوو. گوتی بیبەنە حەمام. جوان جوان بیشۆنو دەستە بەرگێكی تازەی بكەنە بەر.
ڕۆژی سێیەم، دوو شێخەكەی هۆزی عارەبانو چل سوارەكە هاتنو سەیری وێنەكەیان كرد. هەموویان گرتنو هێنایاننە لای ژنەكە. ژنەكە پێی گوتن:
. چتان لە سەیركردنی ئەم وێنەیە دەویێ؟ بۆ وا بە وردو باریكی تەماشای دەكەن؟
پێیان گوت:
. ئەی سوڵتان، ئەم ژنە خاپاندوونی!
ژنەكە مێردەكەی خۆی هێناو پێی گوت:
. هەقایەتی تۆ لە گەڵ ئەم وێنەیە چییە؟
مێردەكەی گوتی:

ـ یەکێکیان ژنی منە. ژنەکەم زۆر خۆش دەویست. بە زەبری زۆر لێیان سەندم. ئەوە چەند مانگە بە دوایدا دەگەڕێم. ئەوەتا وێنەکەم لێرە دیتو دڵم پێ خۆش بوو.

ژنەکە پێی گوت:

ـ تۆ لێرە دانیشە!

ئینجا گوتی:

ـ کۆیلەکە بکوژن!

کۆیلەکەیان کوشت. ئەوسا گوتی:

ـ سوڵتانو ئەو چل سوارەیش بکوژن.

ئەوانیشیان کوشت. مایەوە دوو شێخەکە. یەکێکیان باوکی چل کچەکە بوو. ژنەکە شێخی یەکەمی کوشتو باوکی کچەکانی بەرەڵا کردو چل کچەکەیشی دایەوە.

مێردەکەی خۆی هێناو پێی گوت:

ـ من ژنی تۆم. تۆ چەند تەپو تەوەزەلو خەوۆکی. دەخەویتو بە ئامانو زەمان بە ئاگا نایەی!!

ئەوسا هەقایەتی خۆی لە سەرەتا تا کۆتایی بۆ گێڕایەوە. کابرا، کە گوێی لە هەقایەتەکە بوو، هەر واقی وڕما.

دوای چەند ڕۆژێ. ژنەکە کۆبوونەوەیەکی بە گرەگرەکانی شار کردو پێی گوتن:

ـ گەلۆ! حەزدەکەم بزانن من ژنمو ئەمەیش مێردمە. دەمەوێ دەسەڵات بدەمە دەست مێردەکەم. ئێوە چ دەڵێن؟

هەموو گوتیان:

ـ کەیفی خۆتە.

ژنە تاجی لەسەر سەری خۆی هەڵگرتو لەسەر سەری مێردی داناو زۆر بە شادیو خۆشی ژیان.

لای ئێوە بووینو هاتینەوە.

* * *

## ١٠- شێرەژن

هەبوو نەبوو....

سوڵتانێك هەبوو، کچێکی هەبوو. زۆری خۆش دەویست. کچەکە دوو برای هەبوو. ڕۆژێ، سوڵتان گوتی:

- دەمەوێ بچمە مەککە. بچمە ماڵی خوا بۆ حەج!

دوو کوڕەکە گوتیان:

- ئێمەیش دێین.

سوڵتان گوتی:

- باشە، کەیفی خۆتانە.

کچە هاتوچۆی مەلاژنی دەکرد. خوێندەواری هەبوو. باوکی پێی گوت:

- کچم تۆیش دێی؟

کچەکە گوتی:

- نەخێر باوکە، ئەمن لێرە دەبم!

باوکە پێی گوت:

- باشە کچم، کەیفی خۆتە.

ڕۆژی دووەم. سوڵتان گۆشتفرۆش و بەقاڵ و سەوزەفرۆشی ڕاسپارد. گوتی:

ـ کچەکەم پێویستی بە هەر شتێ بوو بیدەنێ.
هەموو ڕازی بوون. ئەوسا باوکەو دوو کوڕەکەی چوونە سەفەری حەج و کچەکەیش لە ماڵەوە دەرگای لە سەر خۆی کلیل دا. ئەگەر شتێکیان بۆ هێنابا، دەرگای دەکردەوەو شتەکەی وەردەگرت.
ڕۆژێ، شاگری گۆشتفرۆش گۆشتی بۆ کچەکە بردو چاوی پێکەوت. لە دڵی خۆیدا گوتی: خودایە، ئەمە کچێکی چەند جوانە! شاگردەکە گەڕایەوە لای وەستاکەی و پێی گوت:
ـ وەستا!
وەستا گوتی:
ـ ها.
شاگردەکە گوتی:
ـ شتێ هەیە دەمەوێ پێت بڵێم.
وەستا گوتی:
ـ بڵێ!
شاگردەکە گوتی:
ـ وای کچی سوڵتان کچێکی جوانە! جوانی وەکوو خۆی نییە! گۆنای دەڵێ بلوورە، چاوی چاوی مامزە، بڕۆی قەڵەمییە، دەمی دەڵێی فنجانە! وای وەستا کچێکی جوانە!
وەستا پێی گوت:
ـ بە ڕاست؟!
شاگردەکە گوتی:
ـ بەڵێ!
گۆشتفرۆش چوو خۆی شووشت و دەستەبەرگێکی پاکی لەبەر کردو چووە ماڵی کچەکەو لە دەرگای دا. کچەکە گوتی:
ـ کێیە؟
گۆشتفرۆش گوتی:
ـ منم.

کچەکە سەری لە پەنجەرە هەڵکێشا. گۆشتفرۆشی بینی و پێی گوت:
. چت دەوێ؟
گۆشتفرۆش گوتی:
. دەرگاکەتم لێ بکەوە. دەمەوێ قسەت لەگەڵ بکەم.
کچەکە گوتی:
. چت دەوێ؟ قسەی چم لەگەڵ دەکەی؟
گۆشتفرۆش گوتی:
. دە تۆ دەرگا بکەوە. هەقت چییە چم دەوێ؟!
کچەکە گوتی:
. دەرگا ناکرێتەوە!
گۆشتفرۆش پێی گوت:
. تۆم خۆش دەوێ.
کچەکە گوتی:
ـ بڕۆ ڕانەوەستی. هەی داك فەتس! داك داڕزای! تۆ زەماوەند لەگەڵ من بکەی؟!
کچەکە وای گوت و پەنجەرەی داخست و چووە ژوورەوە و دەستی بە قورئانخوێندن کرد. گۆشتفرۆش کە ئەم قسەیەی لێ بیست. لە دڵی خۆیدا گوتی:
. دەبێ ئەم دڕکەت لە بن پێ دەربێنم!
لەوە بە دواوە چیدی گۆشتی بۆ نەنارد. نامەیەکی بۆ باوکی کچەکە نارد و نووسی: فلآنی، کچەکەت دەرگای بۆ ڕێداران خستۆتە سەرپشت. هەرکەسێ دەچێ قرۆشێکی دەداتێ و لە گەڵی ڕادەبوێرێ. زوو بیکوژن!.
نامەکە ی نارد. کابرا نامەکەی خوێندەوە و گوتی:
. ئاخ! کچی من بێ و ئەو هەموو کارە نەگریسە بکا؟!!
بە کوڕە بچووکەکەی گوت:
. هەر ئێستا بگەڕێوە بۆ شاری خۆمان بۆ بەغدا. خوشکت بکوژە و فنجانێکم لە خوێنەکەی بۆ بێنە.

کوڕەکە گوتی:

سەرسەرو سەرچاو!

کوڕەکە خۆی هەڵدایە سەر خانەی زین و ئەسپی لینگ دا تا گەیشتە بەغدا. سەرو سۆراغ و وەزعی خوشکی لە خەڵکی شار پرسی. گوتیان:

- خوشکت ڕۆژ تا ئێواریێ، شەو تا سبەینێ نوێژ دەکاو قورئان دەخوێنێ.

کوڕەکە، کە ئەمەی بیست، سەری لەم کارە سوڕما. چووەوە ماڵێ. گوێی لێ بوو خوشکی قورئانی دەخوێند. لە دەرگای دا. کچەکە گوێی لێ بوو لە دەرگا درا. گوتی:

- کێیە؟

کوڕەکە گوتی:

- منم.

کچەکە لە پەنجەرەوە سەیری کرد. برای بینی و پێی گوت:

- بە خێر بێیتەوە! بە خێر بێیتەوە برام! ئەوە کەی تەشریفت هاتەوە؟ ئەی کوا باوکم و کاکەم؟!

کوڕەکە حەپەسا و گوتی:

- دە تۆ جارێ دەرگا بکەوە!

کچە دەرگای کردەوە و سلاوی لە برای کرد. برای لە دڵی خۆیدا گوتی:

- پێیدەڵێم دوای چەند ڕۆژی دی باوکم دێتەوە. منی دەپێشدا ناردووە بۆ ئەوەی تۆ ببەم بۆ پێشوازی. کە گەیشتینە ناو جەرگەی بیابان، لەوێ جێی دێڵم و ڕادەکەم. پاشان باڵندەیەك دەکوژم و خوێنەکەی لە فنجانێك دەکەم و دەیبەم دەیدەمە باوکم.

کوڕەکە بە خوشکی گوت:

- باوکم ناردوومی بۆ ئەوەی بتبەمە پێشوازی باوکم.

کچەکە ڕازی بوو. خوشك و برا ملی ڕێیان گرت. ڕۆیشتن تا گەیشتنە ناو جەرگەی بیابان. کوڕەکە بە خوشکی گوت:

- خوشکم، پێویستە لەم بیابانە، لەسەر ئەم تەپۆڵکە بەرزە نەختێ بخەوین!

کوڕەکە خۆی نەنووست. کاتێ کچەکە چاوی چووە خەوو کوڕەکە دیتی خەوتووە، لەوێ جێی هێشت و ڕۆیشت.
کچەکە نووست تا ڕۆژ هەڵات و خڕخاڵی لەبەر گەرمای خۆر گەرم داهات و پێی لەگەڵ گەرمای خڕخاڵەکە داغ بوو. لە خەو هەستا سەیری کرد برای نەماوە و کەس دیار نییە. گوتی:
. ئاخ برام تەفرەی دام!
هەستا ڕۆیشت. ئەو ڕۆژە تا ئێوارێ هەر ڕۆیشت. کە تاریك داهات، جێی بۆ خۆی لەسەر شوێنێکی بەرز ڕێك خست. بۆ سبەینێ وا ڕێکەوت کوڕی سوڵتانی ئەو ناوە بۆ ڕاو و شکار هاتە دەرەوە. نزیکەی بیست پیاوی لەگەڵدا دابوو. لە دوورەوە بۆراتیەکی دی لەسەر بەرزاییەکە لە پەلە هەوری دەکرد. بە هاوڕێکانی گوت:
. گەلۆ، ئەگەر ئەمە کچ بوو بۆ منە و ئەگەر هەر شتێکی تر بوو بۆ ئێوەیە.
گوتیان:
. باشە!
ئەسپیان تاوداو چوونە سەری. کوڕی سوڵتان سەیری کرد ئەمە کچێکە وەکوو مانگ دەدرەوشێتەوە. گوتی:
. ئەمە بۆ منە!
عەبای خۆی لوول داو بە ئاگای هێنا. کچەکە چاوی بە کوڕی سوڵتان کەوت و پێی گوت:
. دامپۆشە. خوا داتپۆشێ.
کوڕەکە پێی گوت:
. بە حەڵاڵی تۆم دەوێ، چ دەڵێی؟
کچەکە گوتی:
. با بچینەماڵتان، لەوێ مارەییمان دەبڕین.
کوڕەکە کچەکەی بردەوە ماڵێ و لە خۆی مارەکرد. چوونە پەردەیان بۆ دوو ڕۆژ دواتر دانا. ماڵی سوڵتان کچەکەیان بردە حەمام. ڕووتیان کردەوە، شووشتیان، مووی بەرو بن هەنگڵیان کرد بانگی موو هەڵگریان کرد گەندە

مووی دەم وچاوی هەڵگرت. گازی شارەزایەکی کوتانیان کرد. هات دەستی کوتا، وێنەی چڵە دارێکی لە ناو لەپی کوتا، کوڵمەی کوتا، چەنەگەو گەردەن‌و سەرسنگی تا ناوکی کوتا. بە کوتان(پشتێنی سوڵتان)ی بۆ دروست کرد. سەر عەورەتی کوتا. ئەو کوتانەی بۆ کرد کە پێی دەڵێن(کوتانی بووك). خەنەیان لە ناو هەردوو لەپی ناو هەموو شتێکیان تەواو کرد. لەحەمام هێنایانەوە. پۆدرەیان لێدا. هەر دوو ڕوومەتیان سوور کردو نوونیان لە نێوان برۆکانی داو هێڵیان بۆ کێشاو لێویان سوور کردو پەرچەمیان بەردایەوە. وەکوو مانگی کاتی عیشای لێهات. کوڕی سوڵتان هات چووە کنی. تارای لەسەر لابردو کچێنی هەڵگرت. ژنانی ماڵی سوڵتان هاتنە ژوورەوە. خوێنەکەیان سڕییەوە. شووشتیان‌و بردیان لەسەر چوارپا دایان نایەوە. کوڕەکە دووبارە هاتەوە لای‌و لەگەڵیا نووست. تا بەیانی بەم جۆرە بوون. بەیانی، کوڕەکە (دە) لیرەی ڕۆژانەی دایە کچەکە. زیافەتیان کردو دوای حەفت ڕۆژ، ژنەکە چووە حەمام‌و خۆی شووشت. لەگەڵ کوڕەکەدا بوو تا منداڵێکی بە سکی کەوت‌و کوڕێکی بوو. ساڵ وەرسوڕایەوە کوڕێکی دیکەی بوو. کچە لەوێ مایەوە تا پێنج کوڕی بوو.

ڕۆژێ، کچەکە ماڵە باوانی لە خەودا دی‌و کە هەستا لە پرمەی گریانی دا.

مێردی لێی پرسی:

ـ ئەوە چ بووە؟ بۆ دەگری؟

گوتی:

ـ خەونم بە ماڵی خۆمانەوە دیوە. غەریبی ماڵەوە دەکەم.

مێردی پێی گوت:

ـ باشە، بۆ ماوەی چەند مانگێك بڕۆوە لایان‌و پاشان وەرەوە.

کچەکە گوتی:

ـ ئەرێ بە خوا دڵم ئەوەی دەوێ.

گەنجەکە بانگی خزمەتکارەکەی کردو گوتی:

ـ وەرە برۆ فلانە کەس ببەوە ماڵە باوانی. شەش مانگ لە گەڵیا بمێنەوەو ئەوسا بیهێنەوە.

خزمەتکارەکە ئەسپی زین کرد. سوار بوون و کەوتنە ڕێ. نیوەی ڕێگایان بڕی، خزمەتکارەکە بە کچەکەی گوت:

. فلانە کەس، دەبێ شتێکی ئاوهام لەگەڵ بکەی!

کچەکە گوتی:

. نابێ برام! شتی وا چۆن دەبێ؟ تۆ وەکوو برای منی.

خزمەتکارەکە گوتی:

. ئەگەر خۆتم تەسلیم نەکەی، سەری کوڕەکەت دەبڕم.

کچەکە گوتی:

. هەرچی دەکەی بکە!

خزمەتکارەکە ڕپی دایە کوڕی گەورەی کچەکەو سەری بڕی. دوای سەعاتێك پێی گوت:

. دەی هلۆ، رابە، با دەست پێبکەین!

کچەکە گوتی:

. لە ڕێی خوا وازم لێ بێنە!

خزمەتکارەکە گوتی:

. بە قسەم نەکەی سەری کوڕی دووەمیشت دەبڕم.

کچەکە گوتی:

. هەرچی دەکەی بکە!

خزمەتکارەکە ڕپی کرد بە کوڕی دووەمی کچەکەو سەری لە لەشی جیا کردەوە. سەعاتێك پێچوو بۆ جاری سێیەم بە کچەکەی گوت:

. دەی هلۆ، رابە، با دەست پێ بکەین!

کچەکە گوتی:

. بشمری ئەوەی داوای دەکەی لە منت دەست ناکەوێ.

خزمەتکارەکە گوتی:

. بە قسەم نەکەی، سەری کوڕی سێیەمیشت دەبڕم.

کچەکە گوتی:

. هەرچی دەکەی بکە!

بەم جۆرە خزمەتکارەکە هەموو کوڕەکانی ژنەکەی سەربڕی‌و ئینجا گوتی:
- دەی ئەگەر خۆتم تەسلیم نەکەی، سەری تۆیش دەبڕم.
کچەکە پێی گوت:
- کەیفی خۆتە. هەرچی دەکەی بکە. ئەگەر تووشی هەزار دەردو ناخۆشیش بم، خۆمت نانێمە بەردەست. ئینجا بە خزمەتکارەکەی گوت:
- مۆڵەتم بدە تا سەر دەستاو بچم، پاشان هەرچی دەکەی بکە.
خزمەتکارەکە پێی گوت:
- دەترسم ڕابکەی!
کچەکە گوتی:
- پەتێ لە دەستم ببەستە.
ژنەکە ڕۆیشت تا گەیشتە لای دارخورمایەك. تاریك کەوتبووە عەردی. پەتەکەی لە دەستی خۆی کردەوەو لە دارخورماکەی بەست‌و تێی تەقاند هەڵات. ڕۆیشت ڕۆیشت تا گەیشتەوە شاری باوکی.
لەولاوە، خزمەتکارەکە تا بەیانی چاوەڕێی کرد. کە کچەکە هەر نەهاتەوە، پەتەکەی ڕاکێشا دیتی هێشتا بەستراوەتەوە. گوتی: با بچم بزانم چی لێهات. چوو کەس لەوێ نەبوو. گوتی:
- ئاخ! لە دەستم هەڵات. خزمەتکارەکە لۆژ لۆژ گەڕایەوە لای کوڕی سوڵتان.
ژنەکە، کاتێ خەریك بوو دەچووەوە ماڵی باوکی لە ڕێگادا پیاوێکی چیلکەکەری بینی. پێی گوت:
زێڕو خشڵ‌و جلی خۆمت دەدەمێ، تۆش جلی خۆتم بدەری‌و مەڕێکم بۆ سەر ببڕەو ورگەکەم بدەرێ.
کابرای چیلکەکەر گوتی:
- باشە!
جلی خۆی دایە ژنەکەو ژنەکەیش جلی خۆیدایە کابرا. کابرای چیلکەکەر بەرخێکی بۆ هێنا. ژنە بەرخەکەی کوشتەوە. ورگەکەی دەرهێناو پاکی کردەوەو دە سەر سەری خۆی داهێناو بوو بە کوڕە کەچەڵێکی تەواو!

چووەوە ماڵێ. باوکی نەیانناسیەوە. وەکوو کارەکەر ساڵێك لە ماڵی باوکی ئیشی کرد.
لەولاوەیش مێردەکەی چاوەڕێی دەکرد بچێتەوە. کە ژنەکە هەر نەچووەوە، کابرا سوار بوو چووە ماڵی سوڵتانی خەزووری‌و لە چارەنووسی ژنەکەی پرسی. گوتیان:
. ئەوە چ دەڵێی؟ ئێمە هیچ کچمان نییە.
کوڕی سوڵتان، کە دەکاتە برای ژنەکەو ئەوە بوو کاتی خۆی خوشکی بردو بە خەوتوویی لە بیابان جێ هێشت‌و باڵندەیەکی سەربڕی‌و خوێنەکەی لە فنجانێك کردو بۆ باوکی بردو باوکی خواردییەوە، بەڵام کاتێ باوکە هاتەوەو لە ڕەوشتی کچەکەی خۆی پرسی. پرسی داخۆ ئیشی وای کردووە کە لە نامەکەدا هاتبوو، یان نا؟ گوتیان: شتی وا نییە؟ ئەمە هەمووی درۆو بوختانە. سوڵتان زۆر لە کارەکەی خۆی پەشیمان بووەوە. جا کە مێردی کچەکە هات‌و پرسیاری کچەکەی کرد. پێیان گوت:
. ئێمە هیچ کچمان نییە.
گوتی:
– :با...هەتانە!!
کوڕەکە، هەستا هەقایەتی خۆی‌و کچەکەی بۆ گێڕانەوە. کە بیستیان زۆر شادو کەیفخۆش بوون. بە مێردی کچەکەیان گوت:
کچەکە کەی سەفەری کردووە؟
گوتی:
. نزیکەی ساڵێکە.
گوتمان کچەکە خۆی کردبووە کوڕە کەچەڵ‌و بە کارەکەری لە ماڵی باوکی ئیشی دەکرد. بیستی مێردەکەی هاتووەو گوێشی لێ بوو چیان دەگوت. چووە پێش‌و گوتی:
. من کچی ئێوەم.
ئینجا ورگەکەی لەسەر سەری خۆی هێنایە خوارێ. کە باوکی چاوی پێکەوت لە پڕمەی گریانی دا. پرسیاری منداڵەکانی لێکرد. ئەویش

بەسەرهاتی خۆی لەگەڵ خزمەتکارەکە بە وردو باریکی بۆ گێڕانەوە. دایکی بردییە حەمامو شووشتیو ژوورێکی بۆ خۆیو بۆ مێردی تەرخان کرد.
کچەکە حەفت مانگ لە ماڵی باوانی مایەوە. ئەوسا مێردەکەی ئیزنی خواست ڕێی بدەن بگەڕێتەوە لای خزمو کەسو کاری خۆی.
بەم جۆرە، ژنەکەی بردو گەڕایەوە شاری خۆیان. بانگی خزمەتکارەکەی کردو لێی پرسی:
ـ تۆ بۆچی ئەو تاوانە گەورەیەت کرد؟!
دەستبەجێ لە سەری خزمەتکارەکەی داو بە شادیو شەنگوڵی لەگەڵ ژنەکەیدا ژیا.
لای ئێوە بووینو هاتووینەوە.

* * *

## ١١ـ كوڕی دەرمان

هەبوو نەبوو...

کابرایەك هەبوو، سێ کوڕو کچێکی هەبوو. ڕۆژێ، کابرا بە کوڕەکانی گوت:

. ڕۆڵەکانم، شووشەیەکم لەسەر تەقچکە داناوە کەس دەستی لێنەداو گەمەی پێنەکا، دەرمانی تێدایە!

گوتیان:

باشە، ئێمە چ ئیشمان بەسەردایە.

بەڵام کچەکە نەیدەزانی. چەند مانگێك دوای ئەو قسەیەی کابرا بە کوڕەکانی گوت، کابرا نەخۆش کەوت و عەمری خوای کرد. پاش چەند ڕۆژێ، برای گەورە بە خوشکی گوت:

. دەچم کوولەکە بۆ فراوینی ئەمڕۆ دەکڕم. کچەکە گوتی:

. باشە، بڕۆ کوولەکە بکڕە.

کوڕەکە چووە بازاڕی سەوزەو کوولەکەی کڕی و هێنایەوە. کچەکە کوولەکەی لێنا. چووە ژوورەوە. چاوی بە شووشەکەی سەر تەقچکەکە کەوت و هێنایە خوارێ. تامی کرد، شیرین بوو. هەندێکی بەسەر کولەکەکە دا کردو

خواردی. چەند مانگێکی پێچوو، کچەکە سکی بوو. کە براکان دیتیان خوشکیان سکی هەیە. خەنجەریان هەڵکێشا. پەلاماران دا بۆ ئەوەی سەری ببڕن. کچەکە پێی گوتن:

. برام، چ خێرێکی خوای بووە! بۆچی دەمکوژن؟! من هیچم نەکردووە. تەنیا ئەوەی ئەم شووشەکەم خواردوٚتەوە. براکان لە نێوان خۆیان تەگبیریان کرد بچن مامان بێنن. مامان لەگەڵیان هات، کچەکەی پشکنی دیتی هیچ عەیبی نییە. براکان لوٚمەی خۆیان کرد کە باسی شووشەکەیان بۆ خوشکیان نەکردبوو. پاش چەند ڕۆژێ، کچەکە کوڕێکی بوو. کوڕەکە دوای لە دایکبوونی یەکسەر پێی گرت و ڕۆیشت. کوڕەکە خاڵۆی گەورەی بەرگدروو بوو. کە ئێوارە دادەهات، خاڵۆی چرای پێدەکرد، کوڕەکە دەچوو دەیکوژاندەوە. خاڵۆی پێی دەگوت:

. دا کاسێ حەرامزادە!

شەوێ خاڵۆی دوورمانی دەکرد، خەوی هات و نووست. کوڕەکە چوو چرای کوژاندەوە. پاشان لە دڵی خۆیدا گوتی: دەترسم خاڵۆم بە ئاگابێ و لێم بدا. چراکەی هەڵگرت بۆ ئەوەی بیبا دایگیرسێنێ، لە ڕێگادا تووشی کابرایەك هات. لێی پرسی:

. مامۆ ئەوە دەچیتە کوێ؟

کابرا گوتی:

. دەچم شەو دەپێچمەوە و ڕۆژگار ڕادەخەم.

کوڕەکە پێی گوت:

. مامۆ بوەستە تا ئەم چرایە پێدەکەم، منیش لەگەڵت دێم. کابرا گوتی:

. شتی وا نابێ.!

کوڕەکە بەژنی چوار بست بوو. کابرا ڕازی نەبوو لەسەری بوەستێ. کوڕەکە هەر گرتی و قۆڵبەستی کرد و لەسەر زەوی درێژی کرد و لەوێ جێی هێشت و چوو چراکە دابگیرسێنێ. تروسکاییەکی دی. چوو دیتی مەنجەڵێکی گەورە لەسەر ئاگر داندراوە. گۆشتی بنیادەمی تێدایە. چل دێو لە دەوری مەنجەڵەکە دانیشتوون. بە دەستێك مەنجەڵەکەی بڵند کرد و بە دەستەکەی تر

چراکەی داگیرساند. چراکە کوژایەوە، گەڕایەوە دووبارە مەنجەڵەکەی بڵند کرد. کە ئەو دێوەکانی دیو دێوەکان هێزو تاقەتی ئەویان دی، پێیان گوت:

. ئەوە چییە؟ ئەوە چ دەکەی؟

کوڕەکە گوتی:

. چیتان دەوێ بەدبەختینە؟!

دێوێك لێی هەستا. بەڵام کوڕەکە هەر دێوەکەی گرت و لە بن هەنگڵی خۆی نا و توند ڕایگوشی. دێوەکە هاواری کرد:

. ئاخ..!! ئاخ...!!

کە دێوەکان ئەم کردەوەیان لێدی، پێیان گوت:

ـ مادەم تۆ ئەوەندە بە تاقەتی با بەیەکەوە بۆ دزی بچینە ماڵی سوڵتان.

کوڕەکە پێی گوتن:

. دەچین با بچین!

چوونە ماڵی سوڵتان. کوڕەکە لە ئەستوندەیەکی داو بەری دایەوە. بە دێوەکانی گوت:

. شمشێرێکم بدەنێ.

ئینجا گوتی:

وا من دەچمە ژوورەوەو ئێوە یەك یەك لە دوای من وەرنە ژوورەوە.

هەر یەکە دەچووە ژوورەوە. کوڕەکە شمیشێرێکی لە ملی دەداو سەری پەل دەدا تا خلاسی کردن. سەری هەر یەکێکی دەبڕی و هەر دوو گوێ و لووتی دەبڕی و لە ناو خورجینەی دەنا.

کوڕەکە چووە ماڵی سوڵتان دیتی کچی سوڵتان نووستووە. مۆمدانێکی زێڕی لەسەرینگانەو مۆمدانێکی زیوی لە پێینگانە. مۆمدانە زێڕەکەی هەڵگرت و لە پێینگانی دانا و مۆمدانە زیوەکەی لە سەرینگانی دانا. ماچێکی لێ کرد و ئەڵقەی لە پەنجەی دەرهێنا و هاتە دەرەوەو گەڕایەوە. کابرای قۆڵبەستکراوی کردەوەو دەست بە چرا گەڕایەوە ماڵێ. دیتی خاڵۆی خەریکە بە خەبەر دێ. کە بە خەبەر هات دیتی چرا هێشتا هەر پێیە.

بەیانی جارچی کەوتنە ناو شارو جاڕیان دا:

(هەرکەسێکی ئەو دێوانەی لە ماڵی سوڵتان کوشتووەو جێی مۆمدانەکانی سەرینگان و پێینگانی کچی سوڵتانی گۆڕیوەو کچی سوڵتانی ماچکردووەو ئەڵقەی پەنجەی بردووە، بێ، خۆی بناسێنێ. ئەمین و ئەمانە. ئەوەی ئەم فەتحەی کردووە هەقی خۆیەتی زەماوەند لە گەڵ کچی سوڵتان بکا! ).

خەڵکەکە هەر کەسی ڕاست دەبووەوە دەیگوت: ئەوە من کردوومە. کە پێیان دەگوت: ئەگەر تۆ کردووتە وەسفی شازادە خانمان بۆ بکە کچێکی چۆنە؟ کابرا پەکی دەکەوت و فڕێیان دەدایە ناو بەندیخانە تا کەس نەما. سوڵتان پرسی:

- کەس نەماوە؟!

(گوتیان:

– با، یەك کەس ماوە، بەرگدرووە!

گوتی:

بڕۆن بیهێنن.

کوڕەکە بە خاڵۆی گوت:

- خاڵۆ، منیش لە گەڵتان دێم.

خاڵۆی پێی گوت:

- دانیشە، سەگباب!

کوڕەکە گوتی:

- خاڵۆ، خوا خێرت بنووسێ. لێم گەڕێ لەگەڵتان بێم.

خاڵۆی گوتی:

- بڕۆ هەی بەدبەخت!

ئەوان چوونە ماڵی سوڵتان و کوڕەکەیش کەوتە شوێنیانەوە. چوو لەبەر دەرگا دانیشت. ئەوان کەوتنە قسان. کوڕەکە بازی دایە بەردەمیان و گوتی:

- ڕۆژتان باش.

خالۆی پێی گوت:

- بڕۆ دەرەوە هەی بەدبەخت!

سوڵتان بە خاڵۆی کوڕەی گوت:

- لێیگەڕێ!

کوڕەکە گوتی:

- (جەنابی سوڵتان ئەو هەموو شتە من کردوومە! خاڵۆم بەرگدرووە. شەو خەوتو من چراکەم کوژاندەوە. پاشان لە دڵی خۆمدا گوتم: دەترسم خاڵۆم بە خەبەر بێو لێم بدا، دەستم دایە چراکەو چوومە دەرەوە بۆ ئەوەی ئاگرێك بدۆزمەوەو چراکە داگیرسێنمەوە. ملی ڕێم گرتو ڕۆیشتم. لە پیاوێك ڕاست هاتم پێم گوت: ئاپۆ دەچیتە کوێ؟! پێی گوتم: کوڕم، دەچم ڕۆژگار ڕادەخەم و شەو دەیپێچمەوە. پێم گوت: چاوەڕێم بکە تا ئەم چرایە دادەگیرسێنم. ئەوسا منیش لەگەڵت دێم. گوتی: شتی وا نابێ. کە دیتم ڕازی نابێ. قۆلبەستم کردو لەسەر ڕێگا جێم هێشتو ڕۆیشتم. ترووسکایی ئاگرێکم دی. چووم دیتم مەنجەڵێکی گەورە لەسەر ئاگر بوو. مەنجەڵەکەم بڵند کردو چراکەم داگیرساند. چل دێو لە دەوری مەنجەلەکە بوون. کە دیتیان چ تاقەتێکم هەیە گوتیان: بەدبەخت ئەوە، تۆ کێی؟ پێم گوتن: بەدبەخت ئێوەن! ئێوە کێن؟ یەکێکیان لێم قیت بووەوە. منیش هەر گرتمو لە بن هەنگڵی خۆم نا و ڕامگوشی. زیرەی لێ هەستا: ئاخ..!ئاخ..! ئیتر بەرمدا. کە دێوەکان ئەمەیان بینی پێیان گوتم: ئەگەر ئازای وەرە بچین دزی لە ماڵی سوڵتان بکەین! گوتم: با بچین هاتینە ماڵی ئێوە. ئەستووندەکم شکاندو پێم گوتن: شمشێرێکم بدەنێ بۆ ئەوەی بچمە ژوورەوە بزانم کەسی تێدایە، یان نا؟ هاتمە ژوورەوەو پێم گوتن: یەك یەك وەرنە ژوورەوە. هەر یەکە دەهاتە ژوورەوە. شمشێرێکم لە ملی دەداو سەرم دەپەڕاند تا دوام بڕاندنەوە. گوێو لووتی هەموویانم بڕیو لەناو خورجینەم نا. ئینجا بەناو کۆشکدا گەڕام. کچەکەتم دی نووستبوو. جەنابی سوڵتان دوو، مۆمدانی لە لابوو: یەکێ زێڕو یەکێ زیو. مۆمدانە زێڕەکە لە سەرینگانی بوو. مۆمدانە زیوەکە لە پێینگانی بوو. جێگای مۆمدانەکانم گۆڕی. ئینجا ماچێکم لە کچەکە کردو ئەڵقەی پەنجەم هێنا. فەرموو سوڵتان، ئەمە گوێو لووتی دێوەکانو ئەمەیش ئەڵقەکە).

سوڵتان کە ئەمەی بیستو دیتی ئەمە کوڕێکی بچکۆڵەو ئازایە. گوتی:

- گەلۆ، بە شایەد بن. من کچی خۆم دایە ئەم کوڕە. بانگی قازی کەن بیّ لێی مارەی بکا.

بەم جۆرە کوڕەکە کچەکەی گواستەوە ماڵی خۆیانو بە شادیو بەختەوەری ژیان.

لای ئێوە بووینو هاتینەوە.

****

## ١٢ـ كچ و كوڕ ـ مامز و نێری

هەبوو نەبوو...

سوڵتانێك هەبوو، كچێكی هـەبوو. زۆری خۆش دەویست. ڕۆژێ، كچەكە بە باوكی گوت:

ـ باوكە !

باوكی گوتی:

ـ بەڵێ، كچم!

گوتی:

ـ دەمەوێ بچمە ڕاوو شكار.

باوكی گوتی:

ـ كەیفی خۆتە.

كچەكە چووە تەویلـە بـە مەیتـەری گـوت ئەسـپێكی بـۆ زیـن بكـا. مەیتـەر ئەسپێكی بۆ زین كرد. كچەكە سوار بوو. ڕۆیشـت تـا گەیشتە نـاو جەرگەی بیابان. دونیا بەهار بوو. گیا دوو گەز هەستا بوو. كچەكە خۆی بۆ ڕاو ئامادە كرد لە پڕ گەنجێكی بینی دەتگوت مانگە. كوڕی سوڵتانی شاری دراوسێیان بـوو. كچـەكە ئەشـقی كوڕەكـە بـوو، كوڕەكـەیش ئەشـقی كچـەكە بـوو. ئەسـپەكانیان بەسـتەوەو لـە سـەر مـافووری گیـا و گـوڵ دانیشـتن. لـەناكاو

پیرەمێردێك پەیدا بوو. کە دیتی ئەمانە بە یەکەوە دانیشتوون، وێردێکی بەسە ردا خوێندن‌و کردنی بە مامزێك‌و نێرییەك. کە بوون بە مامزو نێری، لەسەر دانیشتنی سەر گیا و گوڵ بەردەوام بوون. ئینجا نێرییەکە هەستا سواری مامزەکە بوو. کە پیرەمێردەکە ئەمەی بینی دووبارە لە سەری خوێندن‌و وەکوو جاران کردنیەوە بە بنیادەم. کە گەڕانەوە سەر شکڵی جاران، هەر کەسەو ڕایکردەوە ماڵی خۆیان. کچەکە گەڕایەوە ماڵێ. دوای ماوەیەك کوڕە برادەرەکەی هاتە داخوازیی. بەڵام کچەکە بە باوکی گوت:

ـ باوکە، من نامەوێ شوو بکەم. ئەوەی بیەوێ شووی پێبکەم دەبێ هەقایەتێکم بۆ بگێڕێتەوە. ئەگەر بە دڵم بوو شووی پێدەکەم، ئەگەر بە دڵم نەبوو لە سەری دەدەم.

سوڵتان کە ئەمەی بیست بە تەکبیرەکەی ڕازی بوو. جاڕچی خستە ناو شارو جاڕی دا. خەڵکەکە گوتیان:قەت لەوە ئاسانتر نییە. دەچین هەقایەتی بۆ دەگێڕینەوەو یەکێکمان دەیهێنین. هەر کەسێ دەچوو هەقایەتی دەگێڕایەوەو کچەکە سەری دەبڕی‌و سەرەکەی بە منارەوە هەڵدەواسی.

چەند ڕۆژێ بەم جۆرە ڕۆیشت. شارێك لە تەنیشت شاری باوکی کچەکە هەبوو. کابرایەکی لێ بوو سێ کوڕی هەبوو. باوکیان ماوەیەك نەخۆش کەوت‌و مرد. شووشتیان‌و کفن‌و دفنیان کرد. پاش چەند مانگێك، کوڕەکان هەموو ماڵەکەیان دابەش کردو هەرکەسەو بەشی خۆی برد. ڕۆژێ، برای گەورە گوتی:

. بەخوا بۆ بازرگانی دەچمە شاری دراوسێمان. پارەی بردو چوو گەیشتە شاری کچەکە. چووە ناو شار دیتی منارەیەك یەك دنیا کەللەسەری پێدا هەڵواسراوە. لایدایە ماڵی پیرەژنێك. هەموو ڕۆژێ هەشت قڕۆشی دەدایە پیرەژنەکە. ڕۆژێ پێی گوت:

. پیرەژنی ئاخیرخێر، ئەم کەللە سەرانە چین؟

پیرەژن گوتی:

. ئەمە ئیشی کچی سولتانە. هەر کەسێ بێتە داخوازی دەبێ هەقایەتێکی بۆ بگێڕێتەوە. ئەگەر کچەکە دلی هەقایەتەکەی گرت، مێرد بە کابرا دەکاو ئەگەر بە دلی نەبوو لە سەری دەداو کەللەسەرەکەی بە منارەوە هەلدەواسێ.

کوڕەکە کاتێ گوێی لەم مەسەلەیە بوو گوتی:

- پیرەژن، بە خوا منیش دەچم هەقایەتێکی بۆ دەگێڕمەوە بەلکو بتوانم بیهێنم.

پیرەژن گوتی:

. نا، کوڕم، شتی وا نەکەی! تۆ گەنجی. دەترسم بە کوشتن بچی!

کوڕەکە پێی گوت:

. ئەگەر بشمکوژێ باکم پێ نییە!

کوڕەکە چووە مالی سولتان و گوتی:

. دەمەوێ هەقایەتێکتان بۆ بگێڕمەوە. کچەکە گوتی:

. بگێڕەوە!

کوڕەکە هەقایەتێکی بۆ گێڕایەوە. کچەکە بە دلی نەبوو. شیری هەلکێشاو سەری بڕی و کەللەسەرەکەی بە منارەوە هەلواسی.

ڕۆژێکی تر برای ناوەنجی گوتی:

. برام بۆ ئالوویر چووە دەرەوە. ماوەیەکی زۆی پێچوو هەر نەهاتەوە. هیچ خەبەریشی نەناردووە. سەیرە دەبێ هۆی چی بێ؟!!

ئەسپی زین کردو سوار بوو. چووە ئەو شارەو کەللە سەرە هەلواسراوەکانی بینی. پرسیاری کرد: ئەمە چییە؟!

پێیان گوت:

- ئەمە کاری کچی سولتانە هەر کەسێ بیەوێ بە دەزگیرانی بکا دەبێ هەقایەتێکی بۆ بگێڕێتەوە. ئەگەر هەقایەتەکە ئەوە بوو کە ئەو دەیەویست شووی پێدەکاو ئەگەر ئەوە نەبوو سەری دەبڕێ و کەللە سەرەکەی بە منارەوە هەلدەواسێ. کوڕەکە لە منارەکە وردبووەوە دیتی کەللە سەری برایشی پێدا هەلواسراوە. گوتی:

. ئەم قەحپەیە مادەم برای منی کوشتووە، دەچم هەقایەتێکی بۆ دەگێڕمەوەو دەیهێنم. ئەوسا لە خوێنی برام دەیکوژم. ئەگەر ڕایشی لە هەقایەتەکە نەبوو با منیش بکوژێ. کوڕەکە چووە ماڵی سوڵتان‌و گوتی:

. دەمەوێ کچەکەتان ببینم و هەقایەتێکی بۆ بگێڕمەوە. سوڵتان پێی گوت:

. بڕۆ لای وا لە ژوورەوەیە!

کوڕەکە چووە ژوورەوە بۆ لای کچەکەو هەقایەتێکی بۆ گێڕایەوە. کچەکە دڵی هەقایەتەکەی نەگرت. لە سەری کوڕەکەی داو کەللە سەرەکەی بە منارەکەوە هەڵواسی.

ڕۆژێکیان، برا بچووکەکەیان لە دڵی خۆیدا لێکی دایەوە گوتی: هەردوو براکەم چوونە سەفەرو هەر نەهاتنەوە. دەبێ چووبنە کوێ؟!!

ئەسپەکەی زین کردو ڕۆیشت تا گەیشتە ئەو شارەو منارەکەی بینی. بینی کەللە سەری پێ هەڵواسراون. کەللە سەری دوو براکەیشی پێدا هەڵواسرابوو. لایدایە ماڵی پیرەژنێك‌و پێی گوت:

. پیرەژن ئەم کەللە سەرانە چین؟

پیرەژن پێی گوت:

. ئەمە ئیشی کچی سوڵتانە. هەر کەسێ بێتە داخوازی، دەبێ هەقایەتێکی بۆ بگێڕێتەوە. کچەکە ئەگەر هەقایەتەکەی بە دڵ بوو شووی پێدەکاو ئەگەر بە دڵی نەبوو سەری دەبڕێ‌و کەللە سەرەکەی بەم منارەیە هەڵدەواسێ.

بە ڕێکەوت ئەو پیرەژنەی کوڕەکە میوانی بوو مەشاتەو خەمڵێنەری کچی سوڵتان بوو. کوڕەکە، کە بە مەی زانی گوتی:

. ئای لەو قەحپەیە!! ئەوە سەری هەر دوو براکەمی بڕیوە. قەتاو قەت وازی لێناهێنم. کوڕەکە هەموو سبەینان کە لە خەو هەڵدەستا، لیرەیەکی زێڕی لە ژێر سەرینەکەی بەجێ دەهێشت. کچی پیرەژنەکە نوێنی هەڵدەگرت‌و لیرەکەی دەدی‌و دەیبرد دەیدایە دایکی. پیرەژن نزیکەی سی لیرەی بەم جۆرە کۆکردەوە. ڕۆژێ، پیرەژن بە کوڕەکەی گوت:

. هۆی چییە هەموو ڕۆژێ لیرەیەکی زێڕ لە ژێر سەرینەکەت جێ دێڵی؟!

گوتی:

. دایە گەورەی ئاخیرخێر، ئەمە بەخشیشی منە بۆ تۆ!
پیرەژن لە دڵی خۆیدا گوتی لەوانەیە بە تەما بێ کچەکەم بخوازێ بۆیە ئەو لیرانە لەوێ دادەنێ. کوڕەکە پێی گوت:
. گوێ بگرە، شتێ هەیە دەمەوێ پێت بڵێم.
کوڕەکە هەستا یەکەم جار دەستی پیرەژنی ماچ کرد
پیرەژن گوتی:
. بڵێ چت دەوێ!
کوڕەکە گوتی:
ـ دایە گەورە، من وەکوو کوڕی تۆم. دوو برام هەبوو، کچی سوڵتان هەردووکی کوشتوون. پشتی شکاندووم. بیستوومە تۆ خەملێنەرو مەشاتەی کچەکەی. خۆم دەخاڵەتی ماڵی تۆ کردووە. داوام ئەوەیە کە چوویتە لای کچی سوڵتان وردە وردە بیوروژێنەو لێی بپرسە بڵێ کچم هەقایەتی ناو دڵی تۆ چییە؟!!. بەڵکو پێت بڵێ.
پیرەژن کە ئەمەی بیست، ترسا نەوەك کوڕەکە بەو گەنجییە بکوژرێ‌و لەبەر ئەوەش خۆی دەخالەتی ماڵی ئەو کرد بوو، پێی گوت:
. باشە، رۆژی پێنجشەمە کچی پاشا لە دووم دەنێرێ بچم سەری بشۆم‌و قژی دابێنم‌و بیخەملێنم.
کوڕەکە کە ئەمەی بیست پڕی دایە دەستی پیرەژن‌و ماچی کردو دوو سەد لیرەی دایێ. پێنجشەممە داهات، کچی سوڵتان لە دوو پیرەژنی نارد. پیرەژن چوو حەمامی گەرم کرد. کچەکەی شووشت‌و پاکی کردەوەو جل وبەرگی کردەبەر. کچەکە گوتی:
. لەلە گیان، تۆم زۆر خۆش دەوێ!
پیرەژن پێی گوت:
. ئەگەر منت هەندە خۆش دەوێ، دەمەوێ شتێکت لێ بپرسم حەز دەکەم بە ڕاستی وەڵامم بدەیتەوە.
کچەکە گوتی:
. بڵێ!

پیرەژن گوتی:
- کچم، ئەو هەقایەتە چییە لە دڵی خۆت گرتووە؟!
کچەکە، کە ئەمەی لە پیرەژن گوێ لێ بوو، لێی داو گوتی:
- چت لە من دەوێ هەی دێڵەگی سەگی سەگباب! دەتەوێ بە فەتارەتم بدەی؟! یەڵلا برۆ دەرەوە.
پیرەژن ڕۆیشتو گەڕایەوەماڵێ بە کوڕەکەی گوت:
- گەنجۆ، تۆ لە کوێ لە من پەیدابووی؟! کچەکە لەسەر قسەی تۆ واو وای پێکردم.
کوڕەکە، کە ئەمەی بیست، دەردی دڵی گرانتر بوو.
پیرەژن پێی گوت:
چەند ڕۆژێ چاوەڕێ بکە بزانین چۆن دەبێ. پێنجشەممەی پاشی کچی سوڵتان دیسان لە دوو پیرەژنی نارد. پیرەژن نەچوو. دوو جاری تر لە دووی نارد هەر نەچوو. کچی سوڵتان خۆی هاتو بردی. پیرەژن کچەکەی بردە حەمام بۆ ئەوەی بیشوا. کچەکە گوتی:
- لەلە گیان، تۆ چیت داوە لەو هەقایەتەی من؟!
پیرەژن گوتی:
- هیچم ناوێ. بەڵام تۆ وەکوو کچی خۆمیو دەمەوێ نهێنییەکی تۆ بزانم.
کچەکە گوتی:
- هەقایەتەکەت بۆ دەگێڕمەوە بەڵام نابێ بۆ کەسی بگێڕیتەوە.
پیرەژن گوتی:
- بۆ کێی دەگێڕمەوە کچم! چ کوڕم هەیە لە ناو کوڕان، چییە؟
کچەکە هەقایەتی خۆی گێڕایەوەو گوتی:
- ڕۆژێ، چوومە ڕاوو شکار تووشی گەنجێك هاتم. کوڕە سوڵتان بوو. ئەشقم بوو و ئەشقی بووم. لەسەر گیاو گوڵ دانیشتین. پیرەمێردێکی نوورانی هاتو وێردێکی خوێندو ئێمەی کرد بە مامزو نێری. نێرییەکە هەر لەناو گیاو گوڵەکە سوارم بوو. پیرەمێرد کە ئەمەی بینی دووبارە وێردێکی خوێندو ئێمەی وەکوو جاران خستەوە سەر شکلی بنیادەمان. کوڕەکە

رایکردو منیش هاتمەوە ماڵێ. ئێستایش من بە دوای ئەو گەنجەدا دەگەڕێمو نایدۆزمەوە. پیرەژن کە ئەمەی بیست گوتی:

- تواهووو!من چیم داوە لە هەقایەتی وا.

گەڕایەوە ماڵێو بە کوڕەکەی گوت:

- وس بە بەدبەخت، هیچ دەنگ مەکە! ئەوەی لە کچەکەت دەویست من بۆم وەرگرتی.

کوڕەکە گوتی:

- چۆن؟!!

پیرەژن هەقایەتەکەی بۆ گێڕایەوە. کوڕەکە هەقایەتەکەی وەرگرتو بە پیرەژنی گوت:

- خۆم دەزانم چۆن زەماوەندی لەگەڵ دەکەم.

کوڕەکە مالاوایی لە پیرەژن کردو ڕۆیشت. چووە جێگایەکی دوورە شار. ڕۆژە ڕێیەك لە شار دوور بوو. لەوێ حەمامێکی دروست کرد. پەیکەری مامزێكو نێرییەکی لە زێڕ دروست کردو لەبەر دەرگای حەمام، لە تەك خۆی داینا و ڕایگەیاند:

- گەلۆ، هەرکەسێك هەقایەتێکم بۆ بگێڕێتەوە، با بێ بەلاش خۆی بشوا. خەڵك دەهات خۆیان بشۆن، هەقایەتێکیان بۆ کوڕەکە دەگێڕایەوەو خۆیان دەشووشت. کوڕەکە هیچ هەقایەتێکی بە دڵ نەبوو. خەبەر گەیشتە کچی سوڵتانو گوتیان حاڵو مەسەلە ئەوهایە. تێگەیشت ئەمە برادەرەکەیەتی. بە باوکی گوت:

- باوکە، دەچمە گەشتو گەڕان.

باوکی گوتی:

- برۆ کەیفی خۆتە.

کچەکە پیرەژنی مەشاتەو خەملکەری لەگەڵ خۆی برد. جلی پیاوانیان کردەبەرو هاتن. لایان دایە لای کوڕەی خاوەن حەمام. کچەکە پەیکەری مامزو نێرییەکەی دی، گوتی:

- دەمەوێ هەقایەتێکت بۆ بگێڕمەوە:

(من کچی سوڵتانم. جارێکیان، بۆ ڕاوو شکار چوومە دەرەوە. تووشی کوڕە سوڵتانێك هاتم. ئەشقی یەکتری بووین. لەسەر گیا دانیشتین. پیرەمێردێك هات. ویردێکی خوێندو ئێمەی کرد بە مامزو نێری. نێرییەکە سوارم بوو. کە پیرەمێرد ئەمەی بینی دووبارە وێردێکی خوێندو ئێمەی گەڕاندەوە سەر شکلی جارانمان. کوڕەکە هەڵات و منیش گەڕامەوە ماڵێ.)

کوڕەکە، کە گوێی لە هەقایەتی کچەکە بوو، گوتی:

ـ کوڕەکە من بووم و بەدوای تۆدا دەگەڕێم.

کچەکە پێی گوت:

ـ هەستە لەگەڵما بچینە ماڵی ئێمە. بڕۆ لای باوکم و پێی بڵێ هاتوومە داخوازی کچەکەت دەمەوێ هەقایەتێکی بۆ بگێڕمەوە. کە هەقایەتەکەت بۆ گێڕامەوە، من بە باوکم دەڵێم: من ئەم هەقایەتەم دەویست. بە دڵی منە.

کوڕەکە گوتی:

ـ باشە، چ دەڵێی وا دەکەم.

چوونە شاری باوکی کچەکە. کوڕەکە چووە لای باوکی کچەکەو گوتی:

ـ هاتوومەتە داخوازی کچەکەت و دەمەوێ هەقایەتێکی بۆ بگێڕمەوە. کوڕەکە هەقایەتەگەی گێڕایەوە. کچەکە گوتی:

ـ باوکە، من ئەم هەقایەتەم دەویست. ئەم گەنجەم دەوێ.

سوڵتان جیازی بووکێنی بۆ ئامادە کردو کوڕەکە شەوی هەینی چووە پەردە. بە شادی و خۆشی ژیان.

لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

* * *

## ١٣ـ شەمسی قەمەر باجی بەیانی

هەبوو نەبوو...

ژنو مێردێك هەبوون. ژنەکە نە سکی دەبوو نە منداڵ. ڕۆژێ، ژنەکە گوتی:
. ئەگەر خوا کوڕێکم بداتێ، جۆگە هەنگوینێكو جۆگە ڕۆنێك دەکەم بە نەزر. کە نەزری کردو مێردی لەگەڵی نووست، پاش ماوەیەك منداڵێکی بە سکی کەوتو دوای ئەمەش بە ماوەیەك کوڕێکی بوو. کوڕەکە گەورە بوو. بۆ خوێندن چووە لای مەلا. کە بۆ یاری دەچووە دەرەوە. باڵندەیەك دەهاتە لایو پێی دەگوت:

بەندەی ئەمیر...نەزرت بێنە جێ
تا ماڵت کاماخ نەبێ!

باڵندەکە هەموو ڕۆژێ دەهاتو وای دەگوت. کوڕەکە چووەوە ماڵێ بە دایكو باوکی گوت. چی هەیانبوو هەموویان فرۆشت. بە هەنگوینو ڕۆنیان دا. دوو جۆگەیان لێدا. هەنگوینو ڕۆنەکەیان تێکرد. خەڵك دەهات هەنگوینو ڕۆنی بۆ خۆی دەبرد. پیرەژنێك دواکەوتبوو. کە هاتە سەر جۆگەکان، کوڕەکە لەوێ جگانەی دەکرد. جگەکەی هەڵقۆزییەوەو بە گۆزەی پیرەژنەکە کەوتو گۆزەکەی شکاند. پیرەژن گوتی:

ـ دەك لەبەر زگی دایکت هەڵگیرێی! بۆ وات کرد؟! یاخوا ئەشقی(شەمسیٚ قەمەر باجی بەیانی) لە سەرت دا.

کوڕەکە گوتی:

ـ داپیرە، (شەمسیٚ قەمەر باجی بەیانی) چییە؟!

پیرەژن گوتی:

ـ ناوی کچێکە!

کوڕەکە چووەوە لای دایکی و پێی گوت:

ـ دایکە تویشووم بۆ ئامادە کە دەچمە سەفەر.

دایکی گوتی:

ـ خێرە؟!

کوڕەکە گوتی:

ـ دەمەویٚ بچمە تاقیبی (شەمسیٚ قەمەر باجی بەیانی)!

دایکی گوتی:

ـ کوڕم، شتی وا مەکە! واز بێنە! دەترسم شتێکت بە سەر بیٚ.

کوڕەکە گوتی:

ـ هەر دەچم.

کە دایکە زانی ناتوانیٚ ڕێگە لە کوڕەکەی بگریٚ، توێشووی سەفەری بۆ ڕێکخست. کوڕەکە خواردن و کوندە ئاوێکی بردو ڕۆیشت. لە هەورازان هەڵکشاو لە نشێوان داکشا تا گەیشتە سێڕیانێك. پیرەمێردێك لە سێڕیانەکە دانیشتبوو. پرچی هاتبووە سەر چاوی و نینۆکی ئەوەندە درێژ بوو! کوڕەکە گوێزانی دەرهێنا. سەرو ڕیشی پیرەمێردی تاشی و نینۆکی کردو پێی گوت:

ـ داخۆ برسی نییە؟!

پیرەمێردەکە گوتی:

ـ با، برسیمە.

کوڕەکە نانێکی دەرهێنا و دایە پیەمێردەکە. بە یەکەوە نانیان خوارد. پیرەمێردەکە لێی پرسی:

کوڕم، ئۆغر بی، ئەوە دەچیتە کویٚ؟!

کوڕەکە گوتی:

. ناوی (شەمسیٚ قەمەر باجی بەیانی)م بیستووە. دەچمە تاقیبی ئەو.

پیرەمێردەکە گوتی:

. ئاخ..! جا تۆ چۆن دەتوانی بگەیتە ئەم کچە؟!

کوڕەکە گوتی:

. هەر دەبیٚ بیگەمیٚ!! چارە نییە!

پیرەمێرد گوتی:

مادام نانی تۆم خواردو نمەکی تۆم کرد، با پێت بڵێم: ئەمە سیٚ ڕێییە: یەکێکیان ڕێی هاتە، یەکێکیان ڕێی عەلاماتە، ئەوەی تریشی ڕێی (سەد دێوە)، ڕێی هاتو نەهاتە. تۆ بڕۆ ڕێی هاتو نەهات. بڕۆ تا دەگەیتە باغو بەراوو بیستانێك. بیستانەکە شووتی پێوەیە. هیچ شووتی لیٚ مەکەوە. ئەگەر یەك شووتی لیٚ بکەیتەوە، جنۆکە لێت دێنە دەریٚو شێتت دەکەن. لەوێوە بڕۆ تا دەگەیتە شاخێك هەمووی بنیادەمە بوونەتە بەرد. هیچ سەیری شاخەکە مەکە. ڕێی خۆت بگرەو بڕۆ، بانگت دەکەن: هۆ فلاَن فلاَن! وەلاَمی کەس مەدەوە! ئەگەر وەلاَم بدەیتەوە، دەبی بە بەرد. لەویٚ بڕۆ گوێت لە هاڕەی دەستاڕێك دەبیٚ، دانەوێڵە دەهاڕیٚ. بە دوو دەنگەکەدا بڕۆ کە گەیشتیە لای دەستاڕەکە دەبینی دەڵە دێوێك دانیشتووە دەستاڕ لێدەکا. هەڵکوتە سەری. مەمکی بمژەو ئاردەکەی هەڵلووشە. ئەو ڕێنماییت دەکا بۆ لای (شەمسیٚ قەمەر باجی بەیانی). کوڕەکە ئەم قسانەی لە پیرەمێردەکە وەرگرت، دەستی ماچ کردو گوتی:

. مامە، خوا حافیز!

پیرەمێرد گوتی:

. ئامانەتی خوای بی!

کوڕەکە ڕۆیشت. لە هەورازان هەڵکشاو لە نشێوان داکشا تا گەیشتە ئەو بێستانەی پیرەمێرد باسی کردبوو. دیتی بێستانێکی تەڕو پڕو گەشە دەڵێی ئەڵماسە! کوڕەکە هەر ئاوڕیشی لیٚ نەدایەوە. ڕۆیشت تا گەیشتە ئەو شاخەی بنیادەمی تێدا ببوون بە بەرد. لەویٚ کە چاویان پێکەوت، بانگیان کرد: هۆ

فلان! هۆ فلان! کوڕەکە هیچ گوێی نەدانێ. ڕۆیشت. دەنگی دەستاڕەکەی هاتە بەر گوێ‌و بە دوو دەنگەکە داچوو. دیتی دەڵە دێوێک دانیشتووە دەستاڕ لێدەکا. کە چاوی بە دەڵە دێوەکە کەوت، هەڵی کوتایە سەرو شیری مەمکی مژی‌و ئاردەکەی هەڵلووشی. دەڵە دێوەکە پێی گوت:

. نەجاتت بوو! ئەگەر شیری منت نەخواردبا، دەمخواردی.

ئینجا پێی گوت:

. فەرموو ئەمر کە!

کوڕەکە گوتی:

. زاڵم ئەمرت لەسەر نەکا. دەمەوێ ڕێنماییم بکەی بۆ لای (شەمسێ قەمەر باجی بەیانی).

دەڵە دێوەکە کاتێ ئەمەی بیست،

گوتی من شتی وام نەبیستووە بەڵام نامەیەکت بۆ دەنووسم‌و ڕەوانەی لای خوشکمت دەکەم بەڵکو ئەو بیناسێ.

کوڕەکە گوتی:

. باشە، نامەکەم بدەرێ.

دەڵە دێوەکە نامەکەی بۆ نووسی. کوڕەکە نامەکەی وەرگرت‌و ڕۆیشت تا گەیشتە خوشکی دەڵە دێوەکە. ئەویش دەستاڕی لێدەکرد. هەڵی کوتایە سەرو شیری مەمکی خواردو ئاردەکەی هەڵلووشی. دەڵە دێوەکە پێی گوت:

. چیت دەوێ.

کوڕەکە نامەکەی دایە دەڵە دێوەکە. دەڵە دێوەکە گوتی:

. بەخوا من خۆم (شەمسێ قەمەر باجی بەیانی) ناناسم، بەڵام خوشکێکی ترمان هەیە. نامەیەکت بۆ دەنووسم بۆ ئەو خوشکەمان ببە بەڵکو ئەو بیناسێ.

نامەیەکی بۆ خوشکی نووسی‌و دایە کوڕەکە. کوڕەکە ڕۆیشت چوو تا گەیشتە لای خوشکی دەڵە دێوەکە. ئەویش دەستاڕی لێدەکرد. کوڕەکە هەڵی کوتایە سەرو شیری مەمکی مژی‌و ئاردەکەی هەڵلووشی. دەڵە دێوەکە گوتی:

. چت دەوێ؟

کوڕەکە نامەکەی دایێ و دەڵە دێوەکە نامەکەی خوێندەوە، گوتی:

. تۆ چت لە (شەمسێ قەمەر باجی بەیانی) دەوێ؟!

کوڕەکە گوتی:

. دەمەوێ بیکەم بە هاوسەری خۆم.

دەڵە دێوەکە گوتی:

. لێرەوە ڕێگەی دەستە ڕاست بگرەو بڕۆ. دەگەیتە منارەیەك. کچەکە لە ناو ئەو منارەیەدایە. باوکی حەفتە بە حەفتە سەری لێدەدا. باوکی دێوە. کوڕەکە ڕۆیشت. کە منارەکەی لێ دەرکەوت، بانگی کرد: هۆ (شەمسێ قەمەر باجی بەیانی)! کچەکە گوێی لە دەنگی بوو. سەری هەڵکێشاو چاوی پێ کەوت. کە چاوی پێکەوت، ئەشقی بوو. کوڕەکەش کە کچەکەی بینی، ئاشقی بوو.

کوڕەکە پێی گوت:

. وەرە خوارەوە بۆ لام.

کچەکە گوتی:

. بە کوێدا بێمە خوارەوە. ئەم منارەیە پلیکانەی نییە.

کوڕەکە گوتی:

. باشە، تەگبیر؟!

کچەکە گوتی:

- پەتێکم بۆ بێنە لەو دارخورمایەی ببەستە. پەتەکە دەگرم و پێیدا دێمە خوارەوە. کوڕەکە پەتێکی هێناو لە داخورماکەی بەست. کچەکە خۆی پێدا شۆڕ کردەوەو هاتە خوارەوەو بە کوڕەکەی گوت:

. باوکم هەموو ڕۆژێکی هەینی سەرم لێدەدا. تا باوکم نەهاتۆتەوە، دوو مەڕ بێنە سەریان بڕە. بانگی ئەو هەڵۆیان بکەو مەڕەکانیان بدەرێ. ئەمانە هەڵمان دەگرن و بەسەر دەریادا دەمانپەڕێننەوەو دەمانگەیەننەوە شاری ئێوە!

کوڕەکە گوتی:

. باشە!

ئینجا چوو دوو مەڕی هێناو سەی بڕین و دایە هەڵۆکان. سواری پشتی دوو هەڵۆ بوون. دوو هەڵۆکە لە دەریادا پەڕاندنیانەوە. ئاوڕیان دایەوە دیتیان پەڵە هەورێکی سوور بە دوایانەوەیە هاواری دەکا:

. (شەمسیێ قەمەر باجی بەیانی)، بۆ کوێ ڕادەکەی؟

کچەکە، کە گوێی لەمەبوو، دەرزی فڕێ دایە ناو دەریای یەکەم. دەریە هەموو بوون بە دەرزی. سنجاقی فڕێ دایە ناو دەریای دووەم و دەرزی فڕێدایە ناو دەریای سێیەم و بزماری فڕێ دایە ناو دەریای چوارەم و چەقۆی فڕێدایە ناو دەریای پێنجەم و خوێی فڕێدایە ناو دەریای شەشەم. ڕۆژی حەفتەم لە دەریا پەڕینەوەو ڕایان کرد. باوکی کچەکە سێ دەریای بڕی بەڵام کە گەیشتە دەریای چەقۆ، بە سەریدا بازی دا وکە گەیشتە دەریای خوێ، هاواری کرد:

. ئاخ! ئۆف! ئیدی مرد. کوڕەکەو کچەکە ڕۆیشتن گەیشتنەوە لای پیرەمێردە بە ساڵاچووەکەی سەر سێڕیانەکە. کوڕەکە گوتی:

. مامە ئەوەتە هێنام!

پیرەمێرد گوتی:

. بەڕاستیتە؟!

کوڕەکە گوتی:

. بەڵێ ئەوەتانێ.

ئینجا کچەکەی بردەوە ماڵێ و حەفت شەو حەفت ڕۆژ ئاهەنگی زەماوەندیان گێڕا. ئەوجا چووە لای و لەوە بە دواوە بە شادی و بەختەوەری ژیان.

لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

* * *

## ١٤ـ دەروێش محەمەدو کچی سوڵتانی میسر

هەبوو نەبوو...

سوڵتانێك هەبوو، ژنێکی هەبوو. ژنەکە دووگیان بوو. ڕۆژێ کوڕێکی بوو دەتگوت مانگە. منداڵەکەیان گۆش کرد. دایەنێکیان بۆ هێنا شیری دەدایێ. کوڕەکە تەمەنی بوو بە سێ ساڵی، سوڵتان مەلایەکی بۆ هێنایە ماڵەوە. لێنەدەگەڕا کوڕەکە لە ماڵەوە بچێتە دەرەوە چونکە زۆری خۆش دەویست. کوڕەکە تەمەنی گەیشتە حەفت ساڵی هێشتا چ ڕێگاو بان و بازاڕی نەدیبوو. کوڕەکە مامێکی قوماشفرۆشی هەبوو. ڕۆژێ، بە مامی گوت:

. مامە، دەمەوێ لەگەڵت بێمە بازاڕ.

مامی گوتی:

. باشە، وەرە بچین!

کوڕەکەی لەگەڵ خۆی برد. کاتێ کوڕەکە چووە دەرەوەو دونیاو عالەمی بینی، واقی وڕما. ئاژەڵی بینی لە مامی پرسی:

. مامە ئەمانە چین؟!

گوتی:

. کەسی مامی، ئەمانە ئاژەڵن. خوا دروستی کردوون.

ڕۆیشتن گەیشتنە دوکانێ. دوکانیان کردەوە. کوڕەکە لە دوکان دانیشت و دەستی بە قورئانخوێندن کرد. وای لێهات کوڕەکە هەموو ڕۆژێ دەچووە دوکان و قورئانی دەخوێند. کە قورئانی دەخوێند، دەروێشێك دەهات لەولاوە دەوەستا و گوێی لێ ڕادەگرت. کوڕەکە چاوی بە دەروێش کەوت. بە مامی گوت:

. مامە، ئەم کابرایە بۆچی دێ لەولاوە دەوەستێ؟!

مامی کوڕەکە بە دەروێشی گوت:

. بابە دەروێش، چت دەوێ دێی لێرە ڕادەوەستی؟!

دەروێش گوتی:

. تۆ هەقت چییە بۆچی لێرە ڕادەوەستم؟

مامی کوڕەکە پێی گوت:

. یانی چی من هەقم چییە؟!

دەروێش گوتی:

. ئەگەرلێم بگەڕێی لێرە بوەستم باشە! ئەگەر لێنەگەڕێی، لە دیداری ئەم کوڕە بێبەشتان دەکەم.

بە ڕێکەوت ئەو کاتە باوکی کوڕەکە لەوێ بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی:

. لەوانەیە ئەم دەروێشە وەلی بێ.

ئەوە بوو پێی گوت:

. بابە دەروێش، فەرموو دانیشە. ئەمڕۆ میوانی ئێمەی!

دەروێش قبووڵ کرد و ئێوارێ چوونەوە ماڵێ و باسی دەروێشیان بۆ دایکی کوڕەکە کرد. دایکە هات شانی بابە دەروێشی ماچ کرد و گوتی:

. ئەوە ئەو منداڵەم تەسلیم بە تۆ کرد. وەکوو کوڕی خۆتە. سبەینان بیبە و ئێواران ڕۆژئاوا بیهێنەوە.

دەروێش گوتی:

. باشە!

دەروێش ناوی (محەمەد) بوو. دەروێش هەموو ڕۆژێ کوڕەکەی دەبرد. دەگەڕان و دەسوڕان. دەروێش ڕێ و بان و بازاڕی شاری پێشان دەدا. کوڕەکە بە دەروێشی گوت:

- مامە، دونیا چەند خۆش و جوانە!

کوڕەکە لەو ڕۆژەوە کە لەگەڵ دەروێش دەچووە دەرێ، پێی دەگوت مامە. دەروێش پێی گوت:

- ئەم شارەت ئەوەندە پێخۆشە ئەی ئەگەر شاری میسر ببینی دەبێ چەندت پێ خۆش بێ؟! بێ شك زۆرت بە دڵ دەبێ.

کوڕەکە گوتی:

- مامە، میسر چییە؟

دەروێش گوتی:

- میسر شارە! بەڵام شارێکی زۆر خۆشە. ئەگەر حەز دەکەی بچینە ئەو شارە، بە ماڵەوەتان بڵێ، ئەگەر ڕوخسەتیان دای خەبەرم بدێ بۆ ئەوەی بە یەکەوە بچین. کوڕەکە چووەوە ماڵێ. پێیان گوت:

- هەستە شیوت بخۆ!

گوتی: خواردنم پێ ناخورێ! دەمەوێ سەفەرێکی میسر بکەم. کە ماڵەوە بە مەیانزانی، پێیان گوت:

- کوڕم، شتی وانابێ! لەگەڵ کێ دەچیتە سەفەر؟

گوتی:

- لەگەڵ بابە دەروێش دەچم.

ماڵەوە لێ نەگەڕان کوڕەکە شتی وا بکا. کوڕەکە ئیتر دڵی شکا. نەدەهاتەوە ماڵێ و لە ماڵەوە نەدەخەوت و خواردنی لە ماڵەوە نەدەخوارد. ماڵەوە زۆریان خۆش دەویست دیتیان ڕکە کردن لەگەڵیا سوودی نییە پێیان گوت:

- باشە بڕۆ بانگی بابە دەروێش بکە.

کوڕەکە چووە لای بابە دەروێش و پێی گوت:

- مامە، هەستە لەگەڵم بچین. باوەڕکەم ماڵەوەمان بە سەفەرەکەم ڕازی بووین.

بابە دەروێش، کە ئەمەی بیست، هەستا لە گەڵیا چووەماڵەوە. دایکی کوڕەکە شانی بابە دەروێشی ماچ کردو پێی گوت:

ـ کوڕەکەی ئێمە وەکوو کوڕی خۆتە. چۆن نان و نمەکی ئێمەت کردووە، هیوادارم ئەوهات چاوت لێبێ.

دەروێش گوتی:

ـ وەکوو کوڕی خۆمە! وەکوو چاوی خۆم چاوم لێدەبێ.

دوای دوو حەفتە کەل و پەل و شتی پێویستییان ئامادە کردو بۆی دەرچوون. کە لە شار چوونە دەرەوە، دەروێش دەفێک و نووشتەیەکی دەرهێنا. دەفی لێدا. دوو ئەسپ پەیدا بوون. دەروێش بە کوڕەکەی گوت:

ـ تۆ سواری ئەسپێک بەو منیش سواری ئەسپێک دەبم. سوار بوون و ڕۆیشتن. پاش سەعاتێک گەیشتنە میسر. ژوورێکیان، لە خانوویەکیان بە کرێ گرت و تێدا گیرسانەوە. مانگێک لەوێ مانەوە. کوڕەکە سەری لەو شتانە سوڕما بوو کە لەوێ دەیدی. بە دەروێشی گوت:

ـ مامە، ئەم شارە چەند خۆشە!

دەروێش گوتی:

ـ سەبرت هەبێ شتی خۆشتریشت نیشان دەدەم.

دەروێش دوکانێکی قوماشی کردەوە. کوڕەکەی لەسەر دانا. کوڕەکە لە سبەینێ تا ئێوارێ لە دوکانەکە ئیشی دەکرد. ڕۆژێ جاڕچی جاڕی دا:

ـ ڕۆژی شەممە بازرگانەکان دوکانی خۆیان دەکەنەوە. بە کراوەیی جێیان دەهێڵن و دەچنەوە ماڵی خۆیان. کچی سوڵتان دەیەوێ بە ناو شاردا بگەڕێ و دوکان و بازاڕ ببینێ.

ڕۆژی شەممە، هەموو بازاڕ کرایەوە و پاش کەمێ کەسی تێدا نەما. کوڕەکە گوێی لە جاڕی جاڕچی نەبوو. بەیانی چوو دوکانی کردەوە و لە دوکان دانیشت. دوای سەعاتێک، عارەبانەیەک هات. هێدی هێدی دەڕۆیشت. کچی سوڵتان پەچەی لادابوو، ئەوەند جوان بوو تاریکی بازاڕی ڕەواندبووەوە و بازاڕی ڕوناک کردبووەوە. کوڕەکە کە چاوی پێ کەوت، لە هۆش خۆی چوو. لە جێی خۆی لە ناو دوکان بەربووەوە بن کورسی. کاتی ڕۆژاوا، دەروێش

دیتی کوڕەکە هەر نەهاتەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: دەترسم دوکانی کردبێتەوەو لەوێ مابێتەوەو کچی سوڵتانی دیتبێ‌و لە هۆش خۆی چووبێ. چووە دوکانێ دیتی کوڕەکە ڕاکشاوەو لە هۆش خۆی چووە. گوڵاوی هێناو لێی ڕشاند. کوڕەکە بە هۆش خۆی هاتەوە. دەروێش لێی پرسی:

ئەوە چیت بەسەرهاتووە؟

کوڕەکە گوتی:

ـ مامە، دانیشتبووم لە نشکەوە عارەبانەیەك هات. کچی سوڵتانی تێدابوو. کە چاوم پێکەوت، یەکسەر بەربوومەوە. ئاگام لە خۆم بڕا.

دەروێش گوتی:

ـ دەتەوێ شەو لە ناو نوێنی خۆیەوە بۆتی بێنم؟ بەڵام بە مەرجێ دەستی بۆ درێژ نەکەی‌و لاقەی نەکەی؟!

کوڕەکە گوتی:

ـ باشە، هیچی لێناکەم.

گەڕانەوە ژوورەکەیان لە خانەکە. سەعات سێ، دەروێش دەستی بە خوێندن کرد. هەر خوێندی خوێندی. کوڕەکە هەر هێندەی زانی بان شەقی بردو چوارپایەکی لێ هاتە خوارێ. کچی سوڵتانی لەسەر نووستبوو. لە جوانییان وا دەدرەوشایەوە دەتگوت لە زیو دروستکراوە. کوڕەکە بە ئاگای هێنا بۆ ئەوەی گەمەو سوحبەتی لەگەڵ بکا. کچەکە کاتێ بە ئاگا هات سەبری کرد ئەوانەی دەیانبینێ پێشتر نەیدیون! کوڕو کچەکە دەستیان بە گەمەو ماچ‌و مووچ کرد. کە مەلای بەیانی بانگی دا، دەروێش دەستی بە خوێندن کرد. هەر خوێندی‌و خوێندی تا چوارپاکە بەرزبووەوەو کچەکەی بردەوە. کچەکە سبەینەی پاشی هەقایەتەکەی لە دڵی خۆی گرت‌و بۆ کەسی نەگێڕایەوە. گوتی: لەوانەیە خەون بێ! ڕۆژی دووەم، دەروێش دیسان خوێندی‌و کچەکە هات‌و کوڕەکە بە خەبەری هێناو دەستیان بە گەمە کرد. کچەکە سەری سوڕما بوو. لەگەڵ بانگی بەیانی، دەورێش دووبارە خوێندی‌و کچەکە بە چوارپاوە ڕۆیشت. کچەکە حەفت ڕۆژ ئەمە حاڵی بوو. دوای حەفت ڕۆژ، بەسەرهاتەکەی بۆ ماڵەوە گێڕایەوەو پێی گوتن:

- حاڵو مەسەلە ئەوها و ئەوهایە!
پێیان گوت:
- لەوانەیە خەونت دیبێ!
کچەکە گوتی:
- بە خوا خەون نییە. ئەمشەو، شەونخوونی بکەن بە چاوی خۆتان دەبینن ئەو شەوە، ماڵیان تا سەعات سێی شەو شەونخوونییان کرد. هەر هێندەیان زانی بان شەقی بردو چوارپای کچەکە فڕیو چووە دەرەوە. هەموو لە دیار ئەم دیمەنە واقیان وڕما. چوونە سەربانو تەماشایان کرد. ڕۆژی، پاشی بە کچەکەیان گوت:
ـ ئەمشەو چرا بە چوارپاکەتەوە دەکەین. دەچین لەسەر بانەوە تەماشا دەکەین. بزانین چوارپاکە لە کوێ دێتە خوارەوەو بەیانی سەربازان دەنێرین بزانین کێیە وا دەکا. دەروێش دەستی بە خوێندن کرد. ماڵی سوڵتان بە ئاگا بوون. بان شەقی بردو چوارپای کچەکە چووە دەرەوە، چوار چرای پێوە هەڵواسرابوو. دەروێش کاتێ ئەمەی بینی، هەر خوێندیو خوێندی تا ئاسمان پڕ بوو لە چرا. ماڵی سوڵتان واقیان لەم کارە وڕما. کە چوارپاکە نیشت، هەموو چراکان بە یەکەوە لەگەڵیا نیشتن. ئیتر نەیانزانی چوارپاکە لە کوێ هاتە خوارێ. گوتیان:
- ئەوە دەبێ چ کەس بێ؟! بەخوا بزانین کێیە، پارچە پارچەی کەین.
گوتیان:
- بەیانی پیرەژنێك لە چوارپاکە دەبەستینەوە. پیرەژن شوێنەکە دیاری دەکا.
بوو بە نیوەشەو، بان شەقی بردو چوارپاکە لە ژوورەوە چووە دەرێ. پیرەژنەکەشی پێوە بوو. چوارپاکە لە ژووری کوڕەکە هاتە خوارێو پیرەژنەکەیشی هەر پێوە بوو. کچەکەش لە سەر چوارپاکە خەوتبوو. دەروێش بە پیرەژنی گوت:

ئەی پیری زاڵ،
نەفرەتی خوات لێبێ هەزار ساڵ!

ئاخەر تۆ چۆن ڕازی بووی لە چوارپات ببەستنەوە.

دەروێش خوێندی چل جنۆکە پەیدابوون. هەر یەکە بەژن بستێك و ناو قەد مەترێك. پێی گوتن:

- میز بە خۆڵ داکەن و بیکەن بە قوڕو قوڕەکە بکەن بە تۆپەڵی بچووك و لە پیرەژنی بگرن.

جنۆکەکان میزیان بە خۆڵ داکردو تێکیان وەرداو کردیانە قوڕو قوڕەکەیان کردە تۆپەڵی بچووك و بە تۆپەڵە قوڕان وەرگەڕانە پیرەژنەکە. کە لە چوارپاکە بەسترابووەوە تا پیرەژن مرد لێیان دا. کوڕی سوڵتان کچەکەی بە خەبەر هێنا. ماچی کردو گەمەی لەگەڵ کردو نقورچی لێدا. بەیانی دیسان چوارپاکە کچەی بردەوە. بەیانی، ماڵی سوڵتان جارچیان خستە ناو بازاڕ جاڕی دا:

- یەکێ ئیشێکی ئەوهاو ئەوها دەکا. هەرکەسێکە، بێ خۆی بناسێنی ئەمین و ئەمانە.

دەروێش چووە دەرەوەو پێی گوتن:

- ئەم ئیشە من دەیکەم و ئەمەیش ماڵەکەمە.

جاڕچی کە ئەمەی بیست، چووە لای سوڵتان و پێی گوت:

- دۆزیمانەوە! لە فلانە خانە!

سوڵتان چەند پیاوێکی نارد بیهێنن و گوێ لە قسەی بگرن. سوڵتان چووە کۆشکی فەرمانڕەوایی و کوڕی بەست و لە دوای دەروێشی نارد. چوون دەروێش ببەن، پێیان گوت:

- سوڵتان تۆی دەوێ!

دەروێش گوتی:

- ناچم! ئەگەر سوڵتان ئیشی بە من هەیە، با بە خۆی بێتە ئێرە.

فەرمانبەرە گەورەکەیان حەیزەرانی بە دەستەوە بوو ویستی حەیزەرانێك لە دەروێش بدا، هەر هێندەی زانی وا لە ناو کوڕی سوڵتان دایەو خەریکی کەرگانە. ئەوانەی لە کوڕەکە بوون پێیان گوت:

- کوڕە کابرا، ئەوە چییە؟

فەرمانبەرەکە گوتی:

- بە خوا خۆیشم نازانم. ویستم حەیزەرانێك لە دەروێشەکە بدەم ئەوهام بەسەرهات. کە ئامادەبووانی کوڕەکە بەمەیان زانی، بە سوڵتانان گوت:
- سوڵتان چەند پیاو ماقووڵێکی نەجیبزادەی بنێرە لا.
سوڵتان مەسەلەکەی حەفتەیەك ڕاگرت. دەروێش خەبەری بۆ سوڵتان نارد بە خۆو بە وەزیرەکانی بۆ شێوی ئێوارە دەعوەتی ئەون. سوڵتان کە ئەمەی بیست گوتی:
- چۆن بچینە لای؟!
وەزیرەکان گوتیان:
- قەیدی نییە! ئەگەر تەنیا نان و پیوازیشمان بداتێ، گرنگ نییە.
سوڵتان خەبەری بۆ دەروێش نارد گوتی:
- بەیانی دێین.
دەروێش دوعای لەسەر ژوورەکە خوێند. ژوورەکە بوو بە بە باخ و باخەکە دوو فیچقەی تێدابوو. یەك ئاوی دەڕژایە سەر ئەوەی تر. ڕۆژی دووەم، سوڵتان و هەر(دە) وەزیرەکەی چوونە لای دەروێش. کە چوونە ژوورەوەو باغەکەو دوو فیچقەکەیان دی یەك ئاوی دەڕژاندە سەر ئەوەی تر، واقیان وڕما!! لە بەینی خۆیانەوە گوتیان: دەروێش ئەم هەموو شتانەی لە کوێ بوو؟ ئینجا گوتیان:
- با پرسیاری ئەم دوو فیچقەیەی لێ بکەین!
کە پرسییاریان لێ کرد دەروێش ئاماژەی بۆ یەکێ لە فیچقەکان کردو گوتی:
- هەر یەکێ لە حەوزی ئەم فیچقەیە مەلە بکا، ئەگەر تەمەنی حەفتاساڵ بێ، کە هاتەوە دەرەوە، بە کاری خوای تەمەنی دەبێ بە بیست و پێنج ساڵی.
سوڵتان و وەزیرەکان هەموو تەمەنیان شێست و پێنج، حەفتا ساڵ بوو. جلیان داکەندو خۆیان لە ناو ئاوی حەوزی فیچقەکە نقووم کرد. بەڵام کە سەریان لە ناو ئاو دەرهێنا، دیتیان بوونەتە قووڵەڕەش. هاتنە دەرەوەو لە دەروێش پاڕانەوە:
- لە ڕێی خوا وەکوو خۆمان لێبکەوە. دەتکەین بە وەزیری سوڵتان.

دەروێش کە دیتی ئەمانە بوون بە قوولەڕەش، دوعای خوێند پیاوێك هات. دەروێش پێی گوت:

- ئەمانە گوریسپێچ کەو بیانبە لە بازاڕ بیانفرۆشە.

کابرا هەمووی گوریس پێچکردن‌و بردنی. پێیان گوت:

- کابرا ئێمە سوڵتان‌و وەزیرین!

کابرا بە پەت ڕایکێشان‌و گوتی:

- دەتانەوێ ڕا بکەن؟! بە قامچیان وەریان گەڕاییێ. بە دەروێشیان گوت:

- بۆ خاتری خوا پێمان بڵێ چیت لە ئێمە دەوێ؟! بۆ وامان پێدەکەی؟!

دەروێش گوتی:

– کچی سوڵتانم دەوێ بۆ کوڕەکەم.

ئەوانیش گوتیان:

- پەیمانی خواییت پێدەدەین ئەگەر بمانگێڕیتەوە سەر شکڵی خۆمان، کچەکەت دەدەینێ بۆ کوڕەکەت.

دەروێش دوعای خوێندو هەمووی وەکوو جاران لێکردنەوە. کە گەڕانەوە کۆشك، لە دوای قازییان ناردو کچەکەیان لە کوڕەکە مارە کرد. دەروێش‌و کوڕەکە چەند ڕۆژێك لای سوڵتان مانەوە ئینجا دەروێش‌و کوڕەکە بە سوڵتانیان گوت:

- دەمانەوێ بگەڕێینەوە شاری خۆمان. کوڕەکە لەوێ دەچێتە لای کچەکە.

سوڵتان گوتی:

- کەیفی خۆتانە!

سوڵتان جیازی بۆ بووك کردو کەل‌و پەلەکانی دانیێو بە ڕێی کردن. دەروێش‌و کوڕەکەو کچەکە ڕۆیشتن. دوای چەند ڕۆژێ گەیشتنەوە شاری خۆیان. کە گەیشتنە جێ، لە دەرگای ماڵی سوڵتانیان دا. ماڵی سوڵتان گوتیان:

- کێیە؟

پێیان گوتن:

- ئێمەین!

هەموو کەل و پەلەکانیشیان پێبوو. گوتیان:

ـ ئێمەین دەرگا بکەنەوە. دایکی کوڕەکە هاتە دەرەوە. کوڕەکەی گرتە باوەش و ماچی کرد. هەلهەلەی لێدا. هاتن بووکیان بردە ژوورەوە.

دوای حەفتەیەك، ئاهەنگی زەماوەندیان سازدا. حەفت شەوو حەفت ڕۆژ بە دەم ئاوازی دوڵ و زوڕناوە هەڵپەڕین. ئەوسا کوڕەکە چووە لای بووك و ئیتر بە خۆشی و شادی ژیان. دوای چەند مانگێك، دەروێش چووە لای باوکی کوڕەکە و چاك و چۆنی لەگەڵ کرد و گوتی:

. من بووم بە یەکێ لە ئێوە بەڵام ئێستا دەمەوێ بڕۆمەوە لای کەس و کاری خۆم.

پێیان گوت:

. مەڕۆ، ئێمە تازە هۆگری یەکتر بووینە! بێ یەکتر هەڵناکەین!

دەروێش پێی گوتن:

ـ هەردەبێ بڕۆم. چارەم نییە. دەبێ ڕێگام بدەن. هەندێ کەل و پەل و شت و مەکیان بۆ کڕی و دەروێش ڕۆیشت. دوای دەروێش، هەموو بە شادی و بەختەوەری ژیان.

لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

* * *

## ١٥- باڵندەی سەوز

هەبوو نەبوو...

کابرایەك هەبوو، کوڕو کچێکی هەبوو. ڕۆژێ، دراوسێکەیان کفتەیان لێنابوو، بۆیان بردن. گوتیان:

. کفتەیەکی بەتامە! ئەوە چۆن دروستتتان کردووە؟

ئەوانیش گوتیان:

. کوڕەکەی خۆمان سەربڕیو بە گۆشتی کوڕەکەمان لێمان نا. ئەگەر ئێوەش دەتانەوێ کفتە لێ بنێن، سەری کوڕی خۆتان بڕن.

کابرای خاوەن کوڕو کچ ژنی مردبوو، ژنێکی تری هێنابوو. ئەم ژنە نوێیە ڕقی لە کوڕەکەو کچەکە دەبووەوە چونکە زڕ بوون. کاتێ دراسێکەیان گوتی: ئێمە کوڕی خۆمان سەر بڕیوەو کفتەمان پێ لێناوە، ئێوەش ئەگەر دەتانەوێ کفتە لێ بنێن، سەری کوڕی خۆتان بڕن، باوەژن بە کچەکەی گوت:

. بڕۆ بانگی برات کە لای مەلایە بۆ ئەوەی سەری ببڕم‌و ئێمەیش بۆ خۆمان کفتە لێ بنێین.

کچەکە برای خۆی زۆر خۆشدەویست. ڕۆیشت. ڕێ‌و ڕێ هەر دەگریا. گەیشتە ماڵی مەلا دیتی برای قورئان دەخوێنێ. لە پرمەی گریانی داو گوتی:

کاکە محەمەد وەرەو مەیێ؟!

کاکە محەمەد وەرەو مەیێ؟!.

نزیکەی بیست جار ئەمەی دووبارە کردەوە. مەلا بەبرای کچەکەی گوت:

. هەستە لەگەڵ خوشکەکەت بڕۆرەوە تۆی دەوێ. دەڵێی شێت بووە!!

کوڕەکە جزوی قورئانی پێوەداو خستییە لاوەو هەستا بە خوشکی گوت:

. دادە، ئەوە چیتە؟!

کچەکە گوتی:

. باوەژن هەر ئێستا تۆی دەوێ.

بەڵام پێی نەگوت دەیەوێ سەری ببڕێ. کوڕەکە هەموو شتێکی جێ هێشت و لەگەڵ خوشکی چووەوە ماڵێ. کە گەیشتەوە ماڵێ دیتی باوەژن چەقۆ دەسوێ. باوەژن کاتێ چاوی بە کوڕەکە کەوت، گوتی:

. ڕۆژ باش کوڕم.

کوڕەکەیش گوتی:

. چیت دەوێ؟

باوەژن گوتی

. وەرە سەرت بنۆڕم.

باوەژن بە کچەکەی گوت

–تۆ بڕۆ بازاڕ نان بکڕە.

کوڕەکە سەری لە باوەشی باوەژنی نا، باوەژن چەقۆی لە سەر ملی دانا و سەری بڕی. کوڕەکە نزیکەی (دە)جار پەلی هاوێشت. ئینجا باوەژن هەستا هاونی هێنا. گۆشتەکەی کوتا و ئێسقانەکەی فڕێ دا. کچەکە لە بازاڕ هاتەوە، زانی باوەژن سەری برای بڕیوە، دەستی بە گریان و فیزاع و فوغان کرد. ئینجا ژیر بووەوە. هەستا چوو ئێسقانی برای کۆکردەوەو لەناو کیسەیەکی کرد و فڕێی دایە بن کووپە. ئێوارێ، کابرا لەسەر کار هاتەوە. شیویان بۆ دانا. کابرا لە ژنەکەی پرسی:

. ئەمڕۆ چیت لێناوە؟

ژنەکە گوتی:

ـ كفتەمان لێناوە.
كابرا گوتی:
ـ ئەی كوا محەمەدی كوڕ؟
ژنەكە گوتی:
ـ كەوتە ناو ڕووبارو خنكا.
كچەكەیش هیچی بە باوكی نەگوت. باوكە دەستی بە گریان كرد. سەعاتێك گریا ئینجا ئارام بووەوە. كفتەكەی خوارد. بەڵام كچەكە نەیخوارد. ڕۆژی پاشی، كچەكە سەیری ژێر كوپەی كردو تەماشایەكی كیسەكەی كرد. باوەژن بە كیسەكەی نەدەزانی. دوای دوو سێ مانگ، كیسەكە گەورە بوو. بە قەد شووتییەكی لێهات. ڕۆژێ، ئاوگێڕ هات كوپەكە پڕ ئاو بكا ساتمەی لە شووتییەكە كرد. شووتییەكە شكاو باڵندەیەكی سەوزی لێ هاتە دەرەوە. بە كاری خوا قسەی دەكرد. باڵندە سەوزەكە فڕی چووە ناو باخێك. پیرەمێردێك هاتە ناو باخەكە دوعایەكی لە باڵندە سەوزەكە خوێندو كردی بە بنیادەم. كردی بە كوڕ. كوڕەكە چووە لای بەقاڵو پێی گوت:
ـ كاكی بەقاڵ، دەرزیو شەكرو سنجاقم دەوێ. ها ئەمەیش دەرهەمێك!
بەقاڵ گوتی:
ـ باشە!
بەقاڵ شتەكانی دایێ. كوڕەكە شەكرەكەی وەرگرتو وردی كرد. چووەوە ماڵی خۆیانو هاواری كرد:
من باڵندەیەكی سەوزم..
باڵندەیەكی سەوزم. دایكم لێرەیە؟
مەبەستی زڕدایكی بوو. كە خوشكی گوێی لە دەنگی بوو، چووە دەرەوە بۆ لای. كە چاوی پێ كەوت، باوەشی پێداكردو ماچی كرد. كوڕەكەیش خوشكی ماچ كردو پێی گوت:
ـ تۆ خوشكی منی!!
باوەژن كە ئەمەی گوێ لێبوو بە كوڕەكەی گوت:
ـ وەرە ژوورەوە! بۆ نایەیتە ژوورەوە؟

زڕداکی پێی گوت:

چۆنی؟

کوڕەکە گوتی:

- سوپاس بۆ خودا باشم!

ئینجا پێی گوت:

- دایکە حەز لە شەکر دەکەی؟!

زڕدایکی گوتی:

- ئەریٚ بەخوا!

کوڕەکەی پێی گوت:

- چاوت بنووقێنە.

باوەژن چاوی نووقاند. کوڕەکە هەموو دەرزیو سنجاقەکەی لە زاری کرد. باوەژن پێوە تلایەوەو مرد. دوای قەیریٚ باوکی هات. کوڕەکە بە باوکی گوت:

- باوکە، حەزت لە شەکرە؟

باوکە گوتی:

- ئەریٚ بەخوا!

کوڕەکە دەرزیو سنجاقەکەی لە زاری کردو ئەویش مرد. کوڕەکە لە لای خوشکی مایەوە. خانووەکەیان فرۆشت. سەریان هەڵگرتو ڕۆیشتن تا گەیشتنە ناوەندی بیابان. کوڕەکە تینوو بوو. گەیشتنە پیرەمێردێك پیٚ یان گوت:

- ئاوت پیٚ نییە؟

گوتی:

- ڕۆڵەکانم، من ئاوم پیٚ نییە. کە لێرە ڕۆیشتن، دەگەنە دوو جۆگا ئاو: ئەوەی ئاوی جۆگەی یەکەم بخواتەوە، دەبیٚ بە مامزو ئەوەی ئاوی جۆگای دووەم

بخواتەوە، دەبیٚ بە بەراز. خوشك و برا ڕۆیشتن. گەیشتنە دوو جۆگاکە. کوڕەکە بە خوشکی گوت:

ـ دادە، تینویٚتی پرزەی لیٚ بڕیوم. چیدی خۆم پیٚڕاناگیریٚ، دەمرم! هەندیٚ ئاوی جۆگای یەکەمم بدیٚ بیخۆمەوە. خوشکی پیٚی گوت:

ـ برام دەترسم ببی بە مامز.

کوڕەکە گوتی:

ـ گرنگ نییە چونکە ئەگەر ئاو نەخۆمەوە دەمرم.

خوشکی کە ئەمەی بیست، هەندیٚ ئاوی دایە. کوڕەکە ئاوەکەی خواردەوەو بوو بە مامز. خوشکی دەستی بە گریان کرد بۆ برای. برای بە کاری خوا توانای قسەکردنی مابوو. کچەکە مامزەکەی بردو ڕۆیشت. کوڕی سوڵتان چاوی بە کچەکە کەوت و ئەشقی بوو. چونکە کچیٚکی زۆر زۆر جوان بوو. چوو کچەکەی هەڵگرت و مامزەکەیشی لەگەڵ خۆی بردو چووەوە ماڵیٚ. کوڕی سوڵتان مامزەکەی بەستەوەو کچەکەی لە خۆی مارە کردو چووە کنی. مامزەکە لەگەڵ کچەکە لەویٚ مایەوە. کچەکە خواردنی خۆشی دەدایێ. کوڕی سوڵتان پیٚشتر ژنی هەبوو. کە ژنی پیٚشووی ئەو ژنە تازەی بینی، زۆری خەفەت و مەراق لیٚ خوارد. ژنی یەکەم زۆری ڕق لە ژنی دووەم دەبووەوەو غیرەی دەکرد، چونکە کوڕی سوڵتان خوشکی مامزەکەی زۆر خۆش دەویست لەبەر ئەوەی زۆر زۆر جوان بوو. دوای چەند مانگیٚك، خوشکی مامزەکە سکی بوو. دوو سیٚ ڕۆژی مابوو سکەکەی دابنیٚ، ژنی یەکەم چووە ناو باخی کوڕی سوڵتان کە لە تەنیشت ماڵەوە بوو. قۆرتیٚکی بیست گەز قووڵی لیٚدا. حەسیریٚکی بە سەردادا. ئینجا چووە لای خوشکی مامزەکەو پیٚی گوت:

ـ فلاٚنی، هەستە پیاسەیەك بە ناو باخدا بکەین و بای باڵی خۆمان بدەین!

خوشکی مامزەکە هەستا بەگەڵی کەوت. کە چوونە ناو باخ، خوشکی مامزەکە نەیزانی، بەسەر حەسیرەکە کەوت و بەربووە ناو قۆرتەکە. بە کاری خوای کە بەربووەوە، منداڵەکەی ناو سکی بە جووڵە کەوت. ژنەکە ژانی منداڵبوونی گرت.

ژنی یەکەم کە ژنی دووەمی بەردایەوە ناو ئەو قۆرتە چوو قەبرێکی دروست کردو گڵکۆیەکی ڕێکخست. کە کوڕی سوڵتان هاتەوەو پرسی:

. ئەی کوا فلانە کەس؟

ژنی یەکەم گوتی:

. مرد! ئەمەیش گۆڕەکەی!!

کوڕی سوڵتان، کە ئەم خەبەرەی بیست، زۆر ناڕەحەت بوو. لە خۆی داو گریا چونکە کچەکەی زۆر زۆر خۆش دەویست. ئینجا ژنی یەکەم بە کوڕی سوڵتانی گوت:

. هەستە ئەم مامزە سەر ببڕە.

کە مامزەکە زانی دەیانەوێ سەری ببڕن، پەتەکەی پچڕاندو ڕایکرد. چووە سەر ئەو قۆرتەی خوشکی تێدابوو هاواری کرد:

خانمی خانمان!

عەنبەری شەیداو جوان!

چەقۆیان سویوە

بۆ برای کلۆڵت!

خوشکی لە ناو قۆرتەکە وەڵامی دایەوە:

چیم لە دەست دێ؟

من چیم لە دەست دێ؟!

کە کوڕی میرم لە مەڕ دەست بێ!

مامزەکە ئەمەی بیست و گەڕایەوە ماڵێ. کوڕی سوڵتان هەستی پێکرد، گوتی:

. کە دەڵێین با مامزەکە سەر ببڕین، مامزەکە پەتەکە دەپچڕێنێ و ڕادەکا بۆ ناو باخ. دەبێ پێ بکەوم بزانم مەسەلە چییە؟!

ئینجا بە ژنەکەی گوت:

. هەستە چەقۆکە بسوو با مامزەکە سەر ببڕین.

مامزەکە، کە ئەمەی بیست، پەتەکەی پچڕاند و ڕایکرد بۆ ناو باخ. کوڕی سوڵتان بە دوایدا چوو دیتی مامزەکە چووە سەر قۆرتەکە و گوتی:

خانمی خانمان!
عەنبەری شەیداو جوان!
چەقۆیان سویوە
بۆ برای کلۆڵت!

کچەکە لە ناو قۆرتەکە وەڵامی دایەوە:

چیم لە دەست دێ؟
من چیم لە دەست دێ؟!
کە کوڕی میرم لە مەڕ دەست بێ!

کوڕی سوڵتان، کە گوێی لەم وەڵامە بوو، چووە سەر قۆرتەکە و حەسیرەکەی لاداو بە ژنەکەی گوت:

. فلانە کەس!!

ژنەکەی گوتی:

. بەڵێ.

گوتی:

. ئەوە کێ فڕێی دایتە ناو ئەم قۆرتە؟!

گوتی:

. ژنی یەکەمت.

کوڕی سوڵتان ژنەکەی دەرهێناو لەگەڵ مامزەکە بردییەوە ماڵێ. کە ژنی یەکەم لە ماڵەوە چاوی بە کوڕی سوڵتان کەوت، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا. کوڕی سوڵتان پێی گوت:

. وەرە پێم بڵێ ئەمەت بۆ کرد؟

ژنەکە وەڵامی نەدایەوە.

کوڕی سوڵتان دەستی دایە شیرو سەری ژنەکەی پەل دا. مایەوە خۆیو خوشکی مامزەکە. پاش ماوەیەك، ئەم ژنە کوڕێکی بوو. کوڕەکە گەورەبوو. بوو بە حەفت ساڵی، باوکی لای مەلا لەبەر خوێندنی دانا...ئیتر بە خۆشیو بەختەوەری ژیان.

لای ئێوەبووینو هاتینەوە.

* * *

## ١٦ـ ژنی عولعولی

هەبوو نەبوو...

چیلکەکەرێك هەبوو، ژنێکی هەبوو. ڕۆژێ کابرای چیلکەکەر چووە دەرێ بۆ چیلکە کردن و ژنەکەیشی لەگەڵ خۆی برد. تەوری ڕاوەشاند بنەچیلکەیەك هەڵکەنی، تەورەکە درەنگەی هات. بە بەردێك کەوت و هەڵقۆزییەوە. تاتە بەردێك دەرکەوت. دەوری سەعاتێك خەریکی تاتەکە بوو. جوولاندی و لایدا. حەفت کووپەی گەورەی بە زنجیری پڕ زێڕی تێدا دەرکەوت. کابرای چیلکەکەر کاتێ کە چاوی بەم هەموو زێڕە کەوت، هەر شاگەشکە بوو. بە ژنەکەی گوت:

- ئافرەت، وەرە سەیری کە خوا چی پێداوین.

ژنەکە شێتۆکەو عولعولی بوو. مارێکی گول لەسەر حەفت کووپەکە پەپکەی خواردبوو. ژنەکە گوتی:

- پیاویژگە، دەستی لێمەدەو هیچی مەبە! ئەمە هی ئەم زیندەوارە بەسەزمانەیە. نابینی چۆن کلکی بادەدا.

کابرا گوتی:

- چۆن ئافرەت؟

ژنەکە گوتی:

ـ هیچ نەبەی. ئەگەر ببەی لای حوکمات شکاتت لێ دەکەم. دەڵێم حاڵ‌و مەسەلە لەوەدایە.

کابرای چیلکەکەر لە قسەی ژنەکەی ترسا، گوتی:

ـ بە تەمای خوای!

گەڕانەوە ماڵێ. کە گەڕانەوە ژنەکە لە ماڵێ چووە دەرێ، کابرایەکی دی پێی گوت:

ـ نەتزانیوە مێردەکەم حەفت کووپە زێڕی دۆزیوەتەوە. ویستی بۆ خۆی ببا. زێڕەکە هی ماری گولی کلکتەقێن بوو، من لێنەگەڕام بیبا.

کابرا لێی پرسی:

ـ زێڕەکە لە کوێیە؟

ژنەکە گوتی:

ـ وەرە بچین نیشانت بدەم.

کابرای بردە شوێنەکە. کابرا کە زێڕەکەی دی، بە ژنەکەی گوت:

ـ گوناحە مێردەکەت ئەمە ببا. ئەمە هی ئەم زینداوەرە بەسەزمانەیە.

ئیدی گەڕانەوە. بەڵام دوای نەختێ، کابرا چووە شوێنەکەو هەر حەفت کووپە زێڕی بۆ خۆی برد. پاش دوو ڕۆژ، کابرای چیلکەکەر چوو دیتی کووپە زێڕەکان نەماون.

کاتی ڕۆژاوا گەڕایەوە ماڵێ وشترێکی دی بارە زێڕێکی لێ بوو. زێڕەکە هی خەزێنەی پاشا بوو. وشترەکە لە کاروان دابڕابوو وێڵ ببوو. کابرا جڵەوی وشترەکەی گرت‌و بردییەوە ماڵێ‌و بە ژنەکەی گوت:

ـ ئەم وشترەم لە کۆڵانێ گرتەوە بە کەس مەڵێ!

ژنەکە گوتی:

ـ باشە، بە کەس ناڵێم.

کابرا لە دڵی خۆیدا گوتی:

ـ ئاخ ! ئەوە بۆ پێم گوت؟! دەترسم زمانم لێبدا.

دوای نەختێ ژنەکە گوتی:

ـ پیاویژگە، عەیبە ئەم وشترە بێنیتەوە ماڵێ‌و نەیبەیتە قشڵە.

کاتێ کابرا ئەمەی بیست، گوتی:

- (إنا لله و إنا إلیه راجعون) بڵێ بۆچی پێم گوت؟!

بوو بە سەعات سێی شەو ژنەکە نووست. کابرا وشترەکەی کوشتەوەو کفتەی لێناو ژنەکەی بە خەبەر هێناو پێی گوت:

- ئافرەت، هەستە لە خەو ڕابە، خوا کفتەی باراندووە.

ژنەکە لە خەو هەستا دەستی بە کۆکردنەوەی کفتە کرد. هەر دەیخواردو پێدەکەنی تا هەمووی خوارد. بۆ سبەینێ ژنەکە لای دەرو دراوسێکانی گوتی:

- ئەمشەو کفتە باری!

کە دەرو دراوسێ گوێیان لەم قسەیە بوو، زانییان ئەمەی لە خەیاڵی شێتانەی خۆی دروست کردووە. دوای دوو مانگ، ئەوسا بە بزربوونی وشترەکەیان زانیو لە قشڵە بە دوای وسترەکەو خەزێنەی سەرپشتیدا گەڕان. بەڵام نە وشترەکە دیار بوو، نە زێڕی سەر پشتی. جاڕچییەکیان ناردە ناوشار جاڕی دا:

- (هەرکەسێك وشترێکی وێڵی دۆزیوەتەوە بارە زێڕێکی لێیە، ئەمینو ئەمانە! بیهێنێتەوە.)

کە ژنەکە گوێی لە جاڕچی بوو، چوو گوتی:

- ئەو وشترەی ئێوە دەڵێن لەماڵی ئێمەیە!

هاتنە ژوورەوەو ماڵیان پشکنی بەڵام هیچیان نەدۆزییەوە. مێردی ژنەیان بردە قشڵە بۆ ئەوەی لێکۆڵنەوەی لەگەڵدا بکەن. گوتیان:

- کوا پارەو زێڕەکە؟! لە کوێت داناوە دەری بێنە؟!

کابرا گوتی:

- ژنەکەم شێتو عولعولییە. بڕۆن بیهێنن پرسیاری لێ بکەن. لە چ ڕۆژو چ سەعاتێك مێردەکەت وشترەکەی دۆزییەوەو هێنایەوە ماڵێ؟!

چوونە دوو ژنەکەو گوتیان:

- یەڵڵا هەستە.

ژنەکە گوتی:

ـ تا خەرەکەکەشم لەگەڵ خۆم نەهێنم نایەم.
ژنەکە خەرەکەکەی لەسەر سەری خۆی داناو ڕوویکردە قشڵە. چووە ژوورەوە خەرەکی دامەزراندو دەستی بە خەرەکرێسی کرد. کە مێردی بەم جۆرەی بینی، پێی گوتن:
ـ نەمگوت ژنەکەم شێتۆکەیە؟! ئەگەر شێت نەبێ خەرەك لەگەڵ خۆی ناهێنێتە ئێرەو لێرە دینامەزێنێ و خوری پێنارێسی!!
پاشا لە ژنەکەی پرسی:
ـ ژنەکە مێردەکەت کەی وشترەکەی هێنایەوە ماڵێ؟! لە چ ڕۆژو چ سەعاتێك؟!
ژنەکە گوتی:
ـ ئەوە ئێوە شێت بوونە. ئەدی ئەو شەوە نەبوو کە کفتە لە ئاسمان باری.
پاشا کە ئەمەی بیست گوتی:
ـ بێ خش ئەمە شێتە.
ئینجا ڕوویکردە کابراو گوتی:
ـ کابرا، هەستە دەستی ژنەکەت بگرەو بیبەوە ماڵێ.
کابرای چیلکەکەر ژنەکەی بردەوە ماڵێ. دەستی دایە دارێك و کەوتە گیانی. کە تێرو پڕی لێدا هەقی خۆی نایە دەست و تەڵاقی دا. کابرای چیلکەکەر پاشان خانوویەکی بۆ خۆی ئاوا کردو دووبارە ژنێکی تری هێنا. ئەم ژنەی دووەمینی ژنێکی زۆر خاتوون و بێ مانەندبوو.
کابرا دوکانێکی کردەوەو دەستی بە بازرگانی قوماش کرد .کابرا برایەکی هەژارو بەلەنگازی هەبوو. لە دووی نارد پارەی دایێ و خانوویەکی بۆ دروست کردو ژنی بۆ هێناو دوکانێکی قوماشفرۆشیی بۆ کردەوە. هەردوو برا دەستیان بەم کاسبییە کرد. سبەینان دەچوونە سەر دوکان و ئێواران دەهاتنەوە. دوای چەند مانگێك یەکەو کوڕیان بوو. وەکوو گوڵ پێی گەشانەوە. بە شادی و خۆشی و بەختەوەری ژیان. تەنانەت خەڵك کاتێ چاویان پێدەکەوتن، پێیان هەڵدەشاخان و ئێرەییان پێ دەبردن.
لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

* * *

## ١٧ـ كچی قازی

هەبوو نەبوو...

کابرایەك هەبوو، سێ کوڕ هەبوو. پارەیەکی زۆریشی هەبوو. سامانی دەگەیشتە دەوری سەد هەزار لیرە. کابرا نەخۆش کەوت و لە سەرەمەرگدا بە کوڕەکانی گوت

. ڕۆڵەکانم، ئەگەر مردم کفنم بکەن و لە جێگایەکی باش بمنێژن.

کوڕەکان گوتیان:

. خەمت نەبێ باوکە، بە کەیفی تۆ دەکەین!

دوای چەند ڕۆژێ، باوکە مرد. کوڕە گەورەکە چوو کفنی هێنا شووشتیان و کفنیان کرد و ناشتییان. چەند ڕۆژی بەسەردا تێپەڕی، برای گەورە کاڵای بازرگانی کڕی و ڕووی کردە ئەستەمبۆڵ دەوری مانگێك، لەوێ مایەوە و لە مامەڵە زەرەری کرد و مایەپووچ دەرچوو. لە خەفەتان نەخۆش کەوت و مرد. پاش مانگێك، برای ناوەنجی هەندێ کەل و پەلی کڕی و بردی بۆ شام و دەستی بە مامەڵە کرد. ئەویش زەرەری کرد و مایەپووچ دەرچوو و لە داخان نەخۆش کەوت و مرد. نزیکەی ساڵێکی پێ چوو، ئەم جارە برای بچووك چووە لای مامی. مامی زۆر دەوڵەمەند بوو. پێی گوت:

. مامە، وەرە بە یەکەوە بۆ بازرگانی بچینە شام.

مـامی ڕازی بـوو. ئەسـپ و تـەختی ڕەوانیـان بـە کـریٚ گـرت و چـونە شـام. خانوویەکیان بە کریٚ گرت و تێدا دامەزران. کوڕەکە بە مامی گوت :

. مامە، چ ئیش بکەین؟

مامی گوتی

ـ دوکـانێکی قوماشفرۆشـی بکـەوە. دوکـانی قوماشفرۆشییان کـردەوە. مـام و بـرازا هـەموو ڕۆژیٚ دوکانیـان دەکـردەوە. ڕۆژیٚ، مـامی چـووە قاوەخانـە، کوڕەکـە بـە تـەنیا لـە دوکـان مایـەوە. خـەریکی قومـاش فرۆشـتن بـوو، هـەر هێندەی زانی کچێك بە ژووریٚ کـەوت. کچـی قازی بوو. تومـەز کچەکە چوو بووە بازاڕ، چاوی بە کوڕەکە کەوتبوو و ئەشقی ببوو. ئەوە بوو چووە لای و ڕووی خۆی پیشان دا. کوڕەکەیش، کە چاوی بە کچەکە کەوت ئەشـقی بوو. لەبەر ئەشقی کچەکە پەشۆکا و حەپەسا. کچەکە پێی گوت:

. کوڕەکە، فڵان قوماش و فڵان قوماشمان بۆ دەربێنە!

کوڕەکە قوماشەکانی دەرهێنا. کچەکە هەردوو پارچە قوماشـەکەی کـردە دوو لەت و پریاسکەیەکی بەسـراوی بـۆ کوڕەکـە تێهەڵداو بـۆی دەرچـوو. پـاش قەیریٚ، مـامی کوڕەکـە لـە قاوەخانـە هاتـەوە. کوڕەکـە مەسـەلەی کچـەکەی بـۆ گێڕایەوە و گوتی:

. حاڵ و مەسەلە ئاوها بوو!

مامی گوتی:

. گرنگ نییە.

کوڕەکە گوتی:

. مامە خۆشم دەویٚ، تازە بە بیٚ ئەو هەڵناکەم!

مامی گوتی:

. کوڕم سەبرت هەبیٚ!

کوڕەکە گوتی:

. مامە، با پریاسکەکە بکەینەوە بزانین چی تێدایە؟!

مامی گوتی:

- بیکەوە؟!

کوڕەکە پریاسکەکەی کردەوە دیتی پارچە کاغەزێکی نووشتاوەی تێدایە. کاغەزەکەی کردەوەو سەیری کرد لێی نووسرابوو:

ئەگەر منت خۆش دەوێ، بزانە من کچی قازیم!

کوڕەکە، کە ئەمەی خوێندەوە، زۆر کەیف خۆش بوو. مامو برازا چوون پرسیان:

ماڵی قازی لە کوێیە؟

پێیان گوتن:

ئەمە ماڵی قازییە. کوڕەکە لە دەرگای دا. گوتیان:

- کێیە؟

کوڕەکە گوتی:

- منم.

کە کچەکە گوێی لە دەنگی بوو، ناسی. چووە دەرەوە. لەگەڵ کوڕەکە چاویان پێککەوت. کچەکە پێی گوت:

- بڕۆ لای باوکم دوکانی ژێر شانشینی لێ بە کرێ بگرە.

کچەکە ئەم تەگبیرەی بۆ کردو کوڕەکە چووە لای قازیو پێی گوت:

- جەنابی قازی، هاتووم دوکانێکم بەکرێ بدەیتێ، ئەمەیش (دە) لیرە کرێی دوکانەکە.

بەم جۆرە کوڕەکە دوکانێکی قوماشفرۆشیی لەوێ کردەوەو لەگەڵ مامەی لەسەر دوکانەکە دانیشتن. ڕۆژێ، مامی پێی گوت:

- چاو ببڕە ئەم شانشینەو زێڕەوانی کچەکە بکە. بزانە چت بۆ بەر دەداتەوە؟

کوڕکە گوتی:

- بەڵێ

پاش چەند ڕۆژێ، کچەکە پەنجەرەی شانشینەکەی هەڵدایەوەو ئاوێکی کولاوو جۆشاوی ڕشتە خوارەوە. کوڕەکە، کاتێ ئەمەی بینی، چووە لای مامیو خەبەرەکەی دایێ. مامی گوتی:

- چت دیت؟

کوڕەکە گوتی:

. دیتم پەنجەرەی هەڵدایەوەو ئاوێکی کوڵاوو جۆشاو ڕژایە خوارەوە!

مامی گوتی

– ئایا دەزانی ئەمە مانای چییە؟

کوڕەکە گوتی:

– نا، نازانم !

مامی پێی گوت:

– ئەوە کچەکە پێت دەڵێ: بەیانی وەرە حەمام. لەوێ چت پێ خۆشە، وا دەکەین! بڕۆ لای ژنی حەمامچی (دە) لیرەی بدەرێ و پێی بڵێ: دەمەوێ بەیانی بێم لە حەمام خۆم بشۆم.

کوڕەکە گوتی:

. هەر ئێستا دەچم.

کوڕەکە چووە لای ژنەی حەمامچی و پێی گوت:

– پووری، بگرە ها ئەو (دە) لیرە، بەیانی دەمەوێ بێمە حەمام خۆم بشۆم.

ژنەکە گوتی:

. کوڕم، بەیانی نابێ ! بەیانی کچی قازی دێ خۆی دەشوا!

کوڕەکە پێی گوت:

. منیش لەگەڵ ئەو دێم.

ژنەکە گوتی:

نابێ!

کوڕەکە پاڕایەوەو سەری ژنەکەی ماچ کرد. ژنەکە ڕازی بوو. ڕۆژی پاشی، کوڕەکە چووە حەمام و چاوەڕێی کچەکەی کرد. هەرچاوەڕێی کردو ئەو هەر نەهات. لەناو حەمام بورژاو خەوی لێکەوت. دوای نەختێ، کچەکە هات دیتی کوڕەکە نووستووە. ویستی بە ئاگای بێنێ، بە ئاگا نەهات. کچە ئەوەندەی هەوڵی داو دەستی لە لەشی دا سوودی نەبوو. ئیدی هەندێ تۆوی لە گیرفانی خۆی دەرهێناو لە گیرفانی کوڕەکەی کردو بۆی دەرچوو.

دوای سەعاتێك، کوڕەکە بە خەبەر هات. کچەکە دیار نەبوو. کوڕەکە لە حەمام ڕۆیشتو گەڕایەوە لای مامی و پێی گوت:

– کچەکە نەهات، منیش نەختێ نووستمو پاشان بە خەبەر هاتمو هاتمەوە.

مامی پێی گوت:

. سەیری گیرفانت بکە بزانە چی تێدایە؟

کوڕەکە دەستی لە گیرفانی ڕاکرد دیتی گیرفانی تۆی تێدایە. مامی پێی گوت:

. دەزانی ئەوە کچەکە چت پێدەڵێ؟

کوڕەکە گوتی:

– چیم پێ دەڵێ؟

مامی پێی گوت:

– ئەوە پێت دەڵێ: ئەگەر لە حەمام دەخەوی، بۆ خۆت ئەم تۆوە بقرتێنە.

ئینجا مامەی گوتی:

– تۆ بۆچی وا ساردو نەوێرۆکی؟ سبەی چاوەڕێ بکە بزانە چیت بۆ بەردەداتەوە!

ڕۆژی دووەم، کوڕەکە هەر سایەدی شانشینەکە بوو. سەعاتێك پێ چوو، کچەکە پەنجەرەکەی بڵند کردو گوڵێکی بۆ هاوێشت. کوڕەکە هەر ڕای کرد بۆ لای مامی. مامی پێی گوت:

– ها چیت دی؟

کوڕەکە گوتی:

. گوڵێکی بۆ هاوێشتم.

مامی گوتی:

. دەزنی ئەوە چیت پێدەڵێ؟

کوڕەکە گوتی:

– چیم پێ دەلێ؟

مامی گوتی: دەڵێ بەیانی وەرە ناو باخەکەی باوکم.

ئینجا مامی پێی گوت:

. برۆ لای باغەوان و پێیبڵێ: مامە، دەمەوێ بەیانی بێمە سەیری ناو باخ!
باغەوان پێی گوت:
. نابێ، بەیانی کچی قازی دێ، خەبەری ناردووە.
کوڕەکە پێی گوت:
. مامە، چی تیا بەستەیە؟ بۆ لێناگەڕێی بێم؟!
ئینجا لێیپاڕایەوەو سەری ماچ کرد. باخەوان لە دڵی خۆیدا گوتی:
. (دە) لیرەی لێوەردەگرم با بێتە ناو باخ و ئەگەر کچی قازی هات وا دەزانێ بە سەر دیواردا بازیداوەو هاتۆتە ناو باخ. ئیتردەری دکەم. ئەگەر پرسیاریشی لە من کرد، دەڵێم: ئاگام لە هیچ نییە.
ئینجا بە کوڕەکەی گوت:
. بێنە پارەکەم بدەرێ.
کوڕەکە پارەکەی دایێ و گەڕایەوە. خەبەری دایە مامی و گوتی:
. باخەوان ڕازی بوو.
مامی پێی گوت:
. خۆت گێل و منداڵ مەکە. نەچی لەوێش بخەوی!
کوڕەکە گوتی:
. نا، ناخەوم!
ڕۆژی دووەم. کوڕەکە چووە ناو باخ. گەڕاو سووڕا گەیشتە لای بنەگوڵێکی پڕ گوڵ و بۆنی کرد. چووە ژێر دارمێوێك سێبەری لە سەر فیچقەیەك کردبوو. فیچقەکە ئاوێکی ڕوون و زوڵاڵی لەبەر دەڕۆیشت. کزە بایەکی فێنکی دەهات. دانیشت ملی خوار بووەوەو خەوی لێکەوت. دوای سەعاتێك، کچی قازی هات ئەم لای پشکنی، ئەولای پشکنی، کوڕەی نەدۆزییەوە. چووە بن سێبەرەکە، دیتی کوڕەکە وا لەوێ نووستووە. ویستی بە خەبەری بێنێ، بە خەبەر نەهات. کچەکە گوتی:
. ئای خوایە!! پیاوێکی چەند ساردو سڕە!
چووە لای باخەوانەکەو پێی گوت:
. برۆ سێ جگم بۆ بێنە.

باخەوان سیٚ جگی بۆ هیٚنا. کچەکە جگەکانی وەرگرت و لە ناو گیرفانی کوڕەکەی ناو ڕۆیشت. پاش نەختیٚ، کوڕەکە لە خەو هەستا، کچەکە دیار نەبوو. دەستی بردە ناو گیرفانی سەیری کرد سیٚ جگی تیٚدایە. چووە لای مامی و پیٚی گوت:

. نەهات.

مامی گوتی:

. گیرفانت بڕوٚنە بزانە چی تیٚدایە؟!

کوڕەکە گوتی:

. جگ!

مامی پیٚی گوت:

. پیٚم نەگوتی ساردو سڕ مەبە! خاوو خلیچك مەبە! ئەوە کچەکە پیٚت دەڵیٚ ئەگەر زۆرت خەو هات بۆ خۆت یاری بەم جەگانە بکە.

ئینجا پیٚی گوت:

. ئەم جارە تەماشا کە بزانە چ دەکا؟

کوڕەکە چوو لە ناو دوکانەکەی دانیشت. تەماشای کرد دوای نەختیٚ دیتی کچەکە هەموو پەنجەرەکانی شانشینی بڵند کردو هیٚنایە خواریٚ. ئینجا پەنجەرەکی بڵندکردو هیٚنایە خواریٚ. پاشان پەنجەرەکی تری تا نیوەی بڵند کردو هیٚنایە خواریٚ. مامی کوڕەکە هات. بە کوڕەکەی گوت:

. ها، چیت دی؟

کوڕەکە گوتی:

ـ هات، هەموو پەنجەرەکانی شانشینی بڵند کردو هیٚنایە خواریٚ. ئینجا پەنجەرەکی بڵند کردو هیٚنایە خواریٚ. پاشان پەنجەرەیەکی تری تا نیوەی بڵند کردو هیٚنایە خواریٚ.

مامی پیٚی گوت:

. دەزانی ئەوە چی دەڵیٚ:

کوڕەکە گوتی:

. چ دەڵیٚ؟!

گوتی: ئەوە پێت دەڵێ سبەینێ وەرە دیوەخان. کە هاتی دەرگا بکەوەو وەرە ژوورەوەو دەرگا قوفڵ دەوە. کە گەیشتیتە دالانەکە دەرگایەکی ناوەڕاست دەبینی، دەرگاکە بکەوەو بڕۆ سەرەوەو دەرگاکە کلیل دە. کە چوویتە سەرەوە، دەرگای ژوورەوە بکەوە. ئەگەر دەتەوێ کلیلی دەو ئەگەر دەتەوێ بە کراوەیی جێی بێڵە. کەیفی خۆتە. کوڕەکە تەمسەرو کەمتەرخەم بوو. باش گوێی لێ نەبوو مامەی چی گوت.

ڕۆژی دووەم ئێوارێ، کوڕەکە چوو دەرگای دیوەخانی کردەوەو بە کراویی جێی هێشتو چووە ناو دالانەکە. دەرگای ناوەڕاستی کردەوەو ئەویشی بە والایی جێی هێشتو سەرکەوت چووە ژوورەوەو دەرگای کردەوەو بە کراویی جێی هێشت. نەختێ چاوڕێی کرد، کچەکە نەهات، سەری نایە سەر سەرینو خەوی لێکەوت. کچەکە هات وایزانی کوڕەکە دەرگای دیوەخانو دەرگای ناوەڕاستی داخستووە، هەوڵی دا کوڕەکە بە خەبەر بێنێ، کە دیتی بە خەبەر نایە لە تەنیشتی ڕاکشا. سەری خستە سەر سەرینو ئەویش خەوی لێکەوت.

نیوەشەو، شەوگەڕ هاتن. حاجی ئەحمەد ئاغایان لەگەڵدابوو. گوتیان:

- دەرگای ماڵی قازی بۆچی کراوەتەوە؟

چوونە ژوورەوە دیتیان دەرگای ناوەڕاستیش کراوەتەوە. بە پلیکانەدا چوونە سەلال دیتیان کچی قازی ڕاکشاوەو پیاوێکی لە تەنیشت خەوتووە. گوتیان:

- ئای خوایە!! کچی قازی ئیشی وا دەکا؟ باوکیشی قازییە! گوتیان:

- بیانبەن.

هەردووکیان بردنو فڕێیاندانە بەندیخانە!

کچی قازی دایەنێکی هەبوو لە ماڵەوە لەگەڵیاندا بوو. خوشکێکی بە مێردیشی هەبوو ماڵیان لەو سەری شار بوو. کچەکە هەر جارێ بچووبایە سەردانی خوشکی، بە دایەنەکەی دەگوتو دەچوو پێنج ڕۆژ لە کن خوشکی دەمایەوە. بەیانی قازی پرسیاری کچەکەی کرد، گوتی:

- ئەدی فلانە کەس لە کوێیە؟

دایەنی کچەکە گوتی:

. چۆتە سەردانی خوشکی.

قازی، کە ئەمەی بیست، بێدەنگ بوو. لەولاوەیش مامی کوڕەکە دیتی بەیانی کوڕەکە نەهاتەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی:

ـ چبکەم؟! دەترسم شتێکی بەسەر هاتبێ. عەسر داهات کوڕەکە هەر نەهاتەوە. مامی قرقرا، گوتی: خوایە چبکەم؟! ناوێرم بچم لە ماڵی قازی بپرسم.

دوو ڕۆژ دوای گیرانی کچەکەو کوڕەکە، قازی بیستی کچەکەی لە گەڵ پیاوێك نووستووەو دەستگیر کراوە. زۆری خەفەت خوارد، لە ماڵەوە نەچووە دەرێ. کوڕەکەو کچەکەش لە بەندیخانە بوون. کچەکە بانگی خزمەتچییەکی کرد لەوانەی خواردنیان بۆ بەندییان دەهێنا. لیرەیەکی دایێو پێی گوت:

. بڕۆ فلأنە جێ. مەبەستی ماڵی مامی کوڕەکە بوو. سێ جار لە سەر یەك هاوار بکە:

پەمۆچی پەمۆت سووتا!

پەمۆچی پەمۆت سووتا!

پەمۆچی پەمۆت سووتا!

مامی کوڕەکە گوێی لێبوو پەنجەی خۆی گەستو گوتی: ئەوانە گیراون! کە زانی گیراون، چووە قشڵە پرسیاری لێکردن:

– مەسەلە چییە؟

کچەکە گوتی:

. هەموو سووچی برازای تۆ بوو. دەرگاکانی دا نەخستبوو.

مامی کوڕەکە، کە بەمەی زانی چەپۆکێکی لە سەری برازای داو گوتی:

. بە خوا گێڵو بێ کەلکی!

کچەکە گوتی:

– لیرەیەك بدە بە ژنێكو پێی بڵێ جلێکی پاكو پۆشتە لەبەر بکاو هەندێ خواردنی پێ بنێرە. کە هات با جلەکانی لەگەڵ جلی برازات بگۆڕێتەوە،

ئەوسا من خۆم دەزانم چۆن ئیشی خۆم لەگەڵ حاجی ئەحمەد ئاغا یەك لا دەكەمەوە.

مامی كوڕەكە چوو ژنێكی دۆزییەوە. بە برازاكەی دەچوو، پێی گوت:

. ئافرەت حاڵو هەقایەت لەوەدایە! لە ڕێی خوا ئەم چاكەیە بكە، (دە) لیرەت دەدەمێ.

ژنەكە قبوڵی كرد. مامەی كوڕەكە سینییەكی پڕ خواردنی دایە دەست. ژنەكە سینی خواردنی هەڵگرت و چووە قشڵە. چووە ژوورەوە بۆ لای بەندییەكان. كچەكە، كە چاوی بە ژنەكە كەوت، لە خەنی خۆشییان شاگەشكە بوو. جلی لەبەر داكەندو جلی كوڕەكەی لەبەر كردو لە تەنیشت خۆی دانیشت. جلی ژنەكەیشی كردە بەر كوڕەكە. كوڕەكە، دەستی دایە سینییەكەو بە جلی ژنانە چووە دەرەوە. كە چووەدەرەوە، مامی بردییەوە ماڵێو پێی گوت:

. تۆ بۆچی وات كرد؟

كوڕەكە وەڵامی پێنەدرایەوە.

لەولاوەیش كچی قازی نامەیەكی بۆ پاشا نووسی و گوتی:

. (دەمەوێ لە باری ئەو تاوانەی لە ملم ڕاكراوە لەگەڵ حاجی ئەحمەد ئاغا ڕووبەڕووم بكەنەوە. بزانم بۆچی منی گرتووە؟! دەمەوێ هەر ئێستا لە داواكەم بكۆڵنەوە. )

پاشا هات. باوكی كچەكەیش بە پلانی كچەكەی خۆی زانی بوو. چووە قشڵەو بە پاشای گوت:

. بۆچی كچەكەم و كارەكەرەكەمت گرتووە؟!

پاشا گوتی:

. دەڵێن لەگەڵ كابرایەك نووستووە.

قازی بە پاشای گوت:

. كارەكەرەكە ڕووت كەنەوە، ئەگەر ژن بوو لە بەرگی پیاواندا، من داوا لەسەر شەرەفی حاجی ئەحمەد ئاغا تۆمار دەكەم. ئەگەر پیاویش بوو، هەر ئێستا كچەكەم سەردەبڕم. پاشا گوتی:

. بانگی حاجی ئەحمەد ئاغا بکەن.
بانگیان کرد. پاشا گوتی:
. بۆچی کچی قازیت گرتووە؟
گوتی:
. دیتم لەگەڵ پیاوێك نوستبوو.
لە کچەکەیان پرسی:
. بۆچی لەگەڵ ئەو پیاوە نووستبووی؟!.
کچەکە گوتی:
. من لەگەڵ هیچ پیاوێك نەنووستووم. ئەوەی ئێو دەڵێن پیاو نییە، کارەکەری خۆمە. لە دیوەخانە لای شانشین لەگەڵ خۆم خەواندبووم. لە دڵی خۆمدا گوتم: نەوەك یەکێ لێمان بە ژووریٚ بکەویٚ. بە کارەکەرەکەمم گوت: جلی پیاوان بکاتەبەرو لە لەگەڵ من بخەویٚ. چونکە ماڵی چۆڵ پیاوێکی تێدابێ باشە. لە بیریشم کرد دەرگا دابخەم. حاجی ئەحمەد ئاغا بە چ حەقێك دێتە سەرەوە بۆ لامان و قۆڵبەستمان دەکا و دەمانخاتە بەندیخانە؟! بۆچی نەیپرسی ئەو پیاوە کێیە؟
پاشا گوتی:
حاجی ئەحمەد ئاغا، بۆچی ئەم ئیشەت کردووە.
گوتی:
. جەنابی پاشا، ئەمە پیاوە. دایەن با ڕووتی بکاتەوە.
پاشا ڕازی بوو. بانگی داینیان کرد. دایەن هات و ڕووتی کردەوە. دەرکەوت ئافرەتەو لە بەرگی پیاواندایە. پاشا، کە ئەمەی دی، لە سەری ئەحمەد ئاغای داو کچی قازیو ژنەکەی بەرەلا کرد.
هەموو گەڕانەوە ماڵیٚ. کاتیٚ مامی کوڕەکە زانی کچەکە لە بەندیخانە بەربووە چووە لای قازیو دەستی ماچ کردو گوتی:
. جەنابی قازی، ئەوەی بوو بوو. بیکە بۆ خاتری خوا، کچەکەی تۆ برازای منی خۆش دەویٚو برازای منیش کچی تۆی خۆش دەویٚ بۆیە وایان بەسەرهات. تکایە بیانخە باخەڵی یەکتر.

قازی گوتی:

- ئەوە کچەکەم پێشکەش کرد.

مامی کوڕەکە زۆر شادو کەیفخۆش بوو. کچەکەیش، کە زانی باوکی ڕەزامەندی پێشانداوە، ئەو شەوە لە خۆشییان خەوی لێنەکەوت. دوای حەفتەیەك، کچەکەیان بردە حەمام. شووشتیان و پاکیان کردەوەو هێنایانەوە. سووراوو سپیاویان لێداو موو هەڵگر هات گەندەمووی ڕووی هەڵگرت. (مووهەڵگر ژنێکە دوو داو بادەدا لە ناوی ئاوی تێکەڵ بە سووراوی هەڵدەکێشیٚ و داوەکە لە سەر ڕووی کچەکە کشت و خاو دەکاو مووی ڕووی هەڵدەگریٚ. ئەمەیە موو هەڵگرتن)

کە لێبوونەوە کچەیان برد. لە ناو ژوورێك دایاننا. شەو کوڕەکەیان هێناو کردیانە پەردەوە. بۆ بەیانی زیافەتی بووکانەیان کردو خەڵکیان بانگ کرد. هەموو شاد شەنگوڵ بوون. کوڕەکەو مامی نزیکەی ساڵێك لای قازی مانەوە. ئاخیری کوڕەکە چووە لای قازیی خەزووری و پێی گوت:

- مامە، ماوەیەکی زۆرە ئێمە لەم شارەین. ئێستا دڵمان نیشتمان و ماڵەوەی دەویٚ. دەمانەویٚ ئیزنمان بدەی بچینەوە.

قازی گوتی:

- هەقی خۆتانە!

مامی کوڕەکە پێویستی سەفەری ئامادەکرد. تەختێکی ڕەوانی بۆ خۆیان و تەختێکی ڕەوانی بۆ کچەکە کڕی و سوار بوون و چوونەوە بەغدا.

زۆری پێنەچوو، مامی کوڕەکە نەخۆش کەوت. دختۆریان هێنایە سەر، سوودی نەبوو. پاش چەند ڕۆژیٚ، کابرا مرد. برازای کفن و دفنی کردو خێرو سەدەقەی بۆ کرد. مەولودی پێغەمبەرو تەهلیلەی بۆ کرد. کوڕەکەو ژنەکەی زۆر بۆ مامەی کوڕەکە گریان. پاش ساڵێك لە بیریان کرد. کەوتنە خۆشی و شادی!

لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

* * *

## ١٨ـ ژن چاکەی لەسەر پیاو هەیە

هەبوو نەبوو...

سولْتانێك هەبوو، سێ کچی هەبوو: گەورەو ناوەنجی و بچووك. ڕۆژێ، کچەکان گوتیان:

. مەسەلە چییە؟ باوکمان بۆچی خۆی لێ کڕ کردووین، بە شوومان نادا؟

کچە گەورەکە بە خزمەتکارەکەی گوت:

. بڕۆ ناو بێستان سێ گندۆرە بێنە: یەکێ تەواو گەیی بێ، دووەم ماتەبێ، سێیەم کاڵك بێ.

خزمەتکارەکە چوو گندۆرەکانی هێنا. کچەکە گندۆرەکانی لەسەر سینییەك داناو سەرپۆشێکی ئاوریشمی بەسەرداداو بۆ کۆڕی سولْتانی نارد. ئەوانەی لەوێ بوون کە چاویان پێکەوت، لە مەبەستەکەیان گەیشتن. سولْتانیش تێگەیشت. سولْتان گوتی:

. بەخوا حەقی خۆیانە.

کە کۆڕ هەستاو خەڵکەکە بڵاوەیان کرد، سولْتان گازی کچەکانی کرد. یەکەم جار ڕووی کردە کچە گەورەکەو گوتی:

- کچم، پرسیارێکت لێدەکەم: ئایا پیاو چاکەی لەسەر ژن هەیە؟ یان ژن چاکەی لەسەر پیاو هەیە؟

کچەکە وەڵامی دایەوە گوتی:

- نا. باوکە، پیاو چاکەی لەسەر ژن هەیە!

باوکە، کە ئەم وەڵامەی بیست، گوتی:

- ئافەرین! دەتدەمە کوڕی وەزیری گەورە.

خەبەری بۆ وەزیری گەورە ناردو گوتی:

کچی گەورەم دەقەبەر کوڕەکەت کرد.

ئەوسا گوتی:

- بانگی کچی ناوەنجی بکەن.

کچی ناوەنجی هات، سوڵتان پێی گوت:

- دەمەوێ پرسیارێکت لێ بکەم: ئایا پیاو چاکەی لە سەر ژن هەیە؟ یان ژن چاکەی لەسەر پیاو هەیە؟

کچەکە گوتی:

- نا. باوکە، پیاو چاکەی لەسەر ژن هەیە!

سوڵتان، کە ئەم وەڵامەی بیست، گوتی:

- دەم خۆش!! دەتدەمە کوڕی وەزیری گچکە.

خەبەری بۆ وەزیر ناردو گوتی:

- کچی ناوەنجیم دەقەبەر کوڕەکەت کرد.

ئینجا خەبەری بۆ کچە گچکەکەی ناردو پێی گوت:

- وەرە! پرسیارێکت لێ دەکەم. (کچەکە حەزی نەدەکرد شوو بکا): ئایا پیاو چاکەی لەسەر ژن هەیە؟ یان ژن چاکەی لەسەر پیاو هەیە؟

کچەکە گوتی:

- ژن چاکەی لەسەر پیاو هەیە!

سوڵتان گوتی:

- چ، چ ؟!! چت گوت؟

کچەکە گوتی:

. ئەوەم گوت کە گوتم.

سوڵتان گوتی:

. ئاخر چت گوت؟

کچەکە گوتی:

. گوتم ژن چاکەی لەسەر پیاو هەیە.

سوڵتان گوتی:

مادەم وات گوت، دەبێ بتدەمە عەلی پەککەوتە. (عەلی پەککەوتە پیاوێکی زۆر تەوەزەل بوو، لە تەوەزەلییان ئەم ناوەیان لێنابوو.)

کچەکە گوتی:

. باکم پێ نییە. دەمدەیە هەرکێ بمدەیێ!

باوکی بە تورەیی چووە دەرەوە. چووە لای ژنەکەی و گوتی:

. کچەکەت بۆچی ئەو رایەی هەیە؟

ئینجا سوڵتان ئاهەنگی زەماوەندی بۆ کچەکانی سازداو دەستی کچەکانی لە ناو دەستی مێردەکانیان نا. دوڵ دڕاو تەقەی بڕا. کچە بچووکەکە چووە لای عەلی پەککەوتەو هێنایەوە ماڵەوە بۆ لای خۆی. عەلی پەککەوتە ڕاکشاو نووست.

ڕۆژی پاشی، کچەکە چووە لای عەلی پەککەوتە. سەیری کرد ماسوولکەی بازووی هەر یەکەی ئەوەندە گەورەو ئەوەندە ئەستوورە!! بانگی خزمەتکارەکانی کۆشکی کردو پێی گوتن:

. بڕۆنە ناو باخ، هەزار شواڕی شلکی دارهەرمێ و دارهەنارم بۆ بێنن.

خزمەتکارەکان چوون شواڕەکانیان هێنا. کچەکە شواڕەکانی لە ناو تەشتە ئاوێك دانا تا باش بنوێنەوە. یەکەم جار سەد شواڕی هێناو کەوتە گیانی عەلی پەککەوتە. عەلی پەککەوتە بە حەستەم جوولایەوە. بەیانی سەد شواڕی تری لێدا. عەلی پەککەوتە لەسەر لەپان ڕۆیشت. ڕۆژئاوا سەد شواڕی لێدا. عەلی پەککەوتە هەڵدەستایەوەو بەردەبووەوە. ماوەی سێ ڕۆژ دارکاری کرد. عەلی دەستی بە ڕۆیشتن کرد. بەڵام هێشتا بڕەك تەپ و سست بوو. دەستە جلێکی باشی کردەبەر. بەڵام هێشتا ڕۆژ هەتا ئێوارێ هەر دەخەوت. کچەکە

دەستی دایە دارو بیست داری لێدا. هەر لێیدا تا نووستنی تەرخ کرد. ئینجا کچەکە لیرەیەکی دایێو پێی گوت:

– ها، ئەم لیرەیە بگرەو برۆ لای وەستا (جاسم)ی ئاسنگەرو پێ بڵێ:

ـ مامە، تەورێکم بۆ دروست بکە وێنەی نەبێو لیرەیەکی بدەرێ چەندی دەوێ با بیگێڕێتەوەو ئەوەی مایەوە بیهێنەوە.

عەلی پەککەوتە چووە لای جاسم ئاسنگەرو پێی گوت:

. مامە، تەورێکم بۆ دروست بکە.

ئاسنگەرەکە گوتی:

. کوا پارەت؟

عەلی گوتی:

. فەرموو ئەمە لیرەیەك. هەقت چەندە بیگێڕەوەو ئەوەی مایەوە بمدەرەوە.

جاسم ئاسنگەر تەورێکی بۆ دروستی کرد مانەندی نەبوو. عەلی تەورەکەی هێنایەوەماڵێو بە ژنەکەی گوت:

. ئەمە تەورەکەی وەستا بۆی دروست کردینو ئەمەیش باقی پارەکە.

ئینجا کچەکە پیاوێکی ڕاسپارد گوتی برۆ وەستا فلاّنم بۆ بێنە. کابرا چوو وەستای هێنا. کچەکە پێی گوت:

. وەستا!

وەستا گوتی:

. بەڵێ، خانم !

گوتی:

. دەمەوێ بزانم تەوروەشێن ڕۆژانەی چەندە؟

وەستا گوتی:

. بیست قرۆشە.

کچەکە گوتی:

. ئەم پیاوە ببە ئیشی پێ بکە. پاش هەموو کرێکارەکان ئینجا بە ڕێی کەو بە شەپان لە پشتی دەو ڕۆژی تەنیا (دە) قرۆشی بدەرێ.

وەستا گوتی:

بە سەرچاو!

کچی سوڵتان دەیەویست مێردەکەی بەم کارە بە تاقەت بێ، پشتی قایم بێ‌و سستی‌و تەوەزەلی لێ بتەکێ!

ئیتر عەلی پەککەوتە بەیانیان دەچووە دەرەوە تا ڕۆژاوا نەدەهاتەوە. ماوەی ساڵێك بەم جۆرە کاری کرد. کە کچەکە دیتی عەلی پەککەوتە چوست‌و چالاك بووە. پێی گوت:

. ماندوو بووی؟ یان هێشتا ماندوو نەبووی؟

گوتی:

. بە خوا ماندوو بووم!

کچەکە گوتی:

. ها، ئەمە بیست لیرە. بگرە بڕۆ بازاڕ مامەڵەی پێ بکە.

عەلی چووە بازاڕو دەستی بە کڕین‌و فرۆشتن کرد. پاش نزیکەی (دە) ڕۆژ، هەموو پارەکەی زەرەر کرد. هاتەوە لای کچەکەو پێی گوت:

. دۆتمام، پارەکەم هەموو زەرەر کرد. چ دەڵێی؟!

کچەکە گوتی:

. قەیدی ناکا.

ئەم جارە پەنجا لیرەی دایێ‌و گوتی:

. بڕۆ کڕین‌و فرۆشتنی پێ بکە.

عەلی پارەکەی وەرگرت‌و چووە بازاڕ دیتی کابرایەك بانگ ڕادێلێ:

. هۆ قسەم پێیە. کێ قسەی بە پەنجا لیرە دەکڕێ؟!

عەلی پەنجا لیرەی بە کابرا داو گوتی:

. قسەکەتم بۆ بکە.

کابرا گوتی:

. قسەکە ئەمەیە.

قسەکەی پێ گوت.

عەلی پەککەوتە گەڕایەوە. چوو بە ژنەکەی گوت: ئەمڕۆ، کە گەیشتمە بازاڕ، سەیرم کرد کابرایەك بانگی ڕادەهێشت: قسەم پێیە بە زێڕی دەدەم. کێ

دەیکڕیّ. هۆ! لێم پرسی ئەم قسەیە چییە؟ گوتی: پەنجا لیرەی زێڕ بدە با پێت بڵێم. پارەکەم دایێ و گوتی: (ئەگەر چوویتە شارێك بەیانی بچۆ ناو شار، ئێواریّ مەچۆ. کە چوویتە ناو شاریش لە جێگایەکی بەرز ئاکنجی بە.)
کچەکە پێی گوت:
- چاکت کرد.
ئینجا کچەکە لە دوو کاروانچییەکی نارد. کاروانی وڵاتی عەجەمو شارەکانی دی دەکرد. کابرا هات. کچەکە پێی گوت:
- ئەم پیاوە بە خزمەتکاری ببە. با جێی ئێسترەکانی کاروان بماڵیّ و ئالیکیان بداتیّ.
کاروانچی گوتی:
- باشە!
ڕۆژی پاشی، کچەکە نانی بۆ عەلی دروست کردو بەگەڵ کاروانچی دا. ڕۆژی سێیەم، عەلی لەگەڵ کاروانەکە چووە سەفەر. سەفەری کاروانەکە درێژەی کێشا. لە ڕێگا، ئاویان نەما. گەیشتنە سەر بیرێك. کوندەیەکیان دایە دەست یەکێك و پەتێکیان لیّ بەستو شۆڕیان کردەوە ناو بیرەکە. کابرا، کە چووە خواریّ و پێی بە ئاوی بیرەکە کەوت. هاواری کرد:
- ئاخ! ئاخ! دەرم بێنن! دەرم بێنن!
دەریان هێنا. یەکێکی تریان شۆڕ کردەوە. ئەویش وەکوو ئەوەی یەکەمی بەسەرهات. لە بەینی خۆیانەوە ڕاوێژیان کردو گوتیان: با ئەم خزمەتکارە شۆڕ کەینەوە کە کچی سوڵتان بەگەڵیداوین. بانگی عەلی پەککەوتەیان کردو گوتیان:
- فلانە کەس، وەرە شۆڕبەوە ناو ئەم بیرە.
عەلی شۆڕ بووەوەو هاواری لیّ هەستا.
- ئاخ! ئاخ! دەرم بێنن! دەرم بێنن!
گوێیان نەدایێ. عەلی کوندەکەی پڕ ئاو کردو هەڵیان کێشایەوە. دیتیان کوندەکە پڕ ئاوە. کوندەکەیان وەرگرتو پەتەکەیان پچڕاند. عەلی بەربووەوە ناو بیرەکە. لە ناو ئاو نقووم بوو. کە نقووم بوو لە بن ئاوەکە کونێکی دی.

چووە ناو کونەکەو دەرگایەکی دی. دەرگاکەی پاڵ داو چووە ژوورەوە دیتی کۆشکێکە دەڵە دێوێکی تێدایە. دەستاړ لێدەکا. خۆی گەیاندە دەڵە دێوەکە شیری مەکی خواردو ئاردەکەی هەڵلووشی. دەڵە دێوەکە پێی گوت:

. تۆ تازە بووی بە کوڕی من. لای من بمێنەوە.

عەلی مانگێك لای دەڵە دێوەکە مایەوە. دەڵە دێوەکە پێی گوت:

. هەستە سەد هەنار لەم هەنارانە بڕنە. دێوەکە هەنارەکانی لە ناو فەردەیەك کردو عەلی بە شانی خۆی داداو ویستی لە ناو بیرەکە بێتە دەرەوە. بە کاری خوای وا ڕێك کەوت هەمان کاروان لە گەڕانەوەدا گەیشتنەوە سەر هەمان بیر. پەتو دەولکیان شۆڕ کردەوە ناو بیرەکە. عەلی پەتەکەی گرتو هاواری کرد:

. هەڵمکێشنەوە!

کە چاویان پێکەوت، واقیان وڕما. گوتیان:

. تۆ فلاّن کەس نیت؟

گوتی:

. با!

هەڵیان کێشایەوەو دەریان هێنا. شادو شوکور بوون کە بە زیندوویی دیتیانەوە. ڕۆیشتن گەیشتنە شوێنێكو لەوێ خستیان. کاروانەکە لە جێگایەکی نزم ئێورین. عەلی چووە سەر جێگایەکی بڵند. چونکە ئەو قسەی بیر کەوتەوە کە بە پەنجا لیرەی زێڕ کڕی بووی. کە گەیشتە سەر تەپۆڵکەکە، دایکردە لێزمە بارانێکی بە خوڕ. عەلی خۆی دایە پەنایەك. ماوەیەك باران بەردەوام بوو. کە باران لێی کردەوە ڕۆیشتنو کە سبەینە داهات، عەلی هەنارێکی بردو لە کاروان دوورکەوتەوە. دەستی دایە چەقۆیەكو هەنارەکەی شکاند. هەنارەکە گەوهەرو گەردەنبەندی لێهەڵڕژا. هەر گەردەنبەندێك شارێکی دەهێنا. گوتی:

. ئەمە بۆ ژنەکەم دەنێرمەوە. سندووقێکی هێناو هەنارەکانی لە ناو ناو بۆ ژنەکەی ناردەوە. کچی سوڵتان کە سندووقەکەی بە دەست گەیشت، کردییەوە دیتی هەناری تێدایە، گوتی:

. سەیر کەن! چ نەماوە هەناری بۆ ناردووم!

هەنارێکی شکاند گەردەنبەند بە گۆڕێ وەربوو. هەر یەکە ئەوەندەی دەهێنا نەبێتەوە. کچە، کە چاوی بە گەردەنبەندەکان کەوت، چاوی زەق بووەوە. گوتی:

. با بیشارمەوە.

ڕۆژی دووەم، کاتی ڕۆژاوا، کاروان گەیشتەوە شار. کاروانچییەکان چوونە ناو شار. عەلی بە تەنیا چووە سەر چیا. نیوەشەو دیتی دوو کەس لەسەر شوورەی شار هاتنە خوارێ. چوونە سەر تەپۆلکەیەك و شتێکیان لە زەوی ناشت. کە ناشتیان و ڕۆیشتنەوە، عەلی چوو شوێنەکەی هەڵدایەوە سەیری کرد کوڕێکی خنکاوە. بە دوای دوو کەسەکەدا ڕایکرد. بۆ ئەوەی بزانێ ئەم دوو کەسەماڵیان لە کوێیە. قەرە بە قەرەیان ڕۆیشت تا دوو کەسەکە گەیشتنە ماڵێك. عەلی ماڵەکەی بە نیشان کرد و گەڕایەوە لای کوڕە خنکاوەکە. لە پەڕۆیەکی پێچا و لە ناو سندووقێکی نا. بەیانی کاتی چێشتەنگا و چووە ناو شار. گوێی لێبوو جاڕچی جاڕی دەدا:

. هەر کەسێ کوڕی سوڵتانی دیوە. بێ، خەبەر بدا ئەمن و ئەمانی هەیە!

عەلی پێی گوتن:

. کوڕی سوڵتان لای منە.

کە ئەمەیان بیست گرتیان و قۆڵبەستیان کرد. عەلی پێی گوتن:

. بۆچی قۆڵبەستم دەکەن؟

گوتیان:

. بڕۆ سوڵتان دەیەوێ بتبینێ.

گوتی:

. فەرموو با بچینە لای سوڵتان.

چوونە لای سوڵتان و گوتیان:

. ئەم پیاوە دەڵێ کوڕی سوڵتان لای منە.

سوڵتان گوتی:

. کابرا تۆ بۆچی کوڕی منت کوشتووە؟!

عەلی گوتی:

- من نەمكوشتووە.

سوڵتان گوتی:

- ئەی كێ كوشتوویەتی!

عەلی گوتی:

- گوێ بگرە هەقایەتەكەت بۆ بگێڕمەوە:

( لە دەرەوەی شار دەهاتمەوە. گەیشتمە بەر دەروازەی شار، ڕۆژئاوابوو. منیش ڕەوشتم وایە پاش ڕۆژئاوا، ناچمە ناوشار، لە دەرەوە دەنووم، كە سبەینە داهات ئەوجا دەچمە ناو شار. دوێنێ كاتی ڕۆژئاوا، گەیشتم. چوومە سەرچیا. نیوە شەو، دوو پیاوم بینی بە سەر شوورەی شاردا هاتنە دەرەوە. چوونە سەر گردێك. منیش تەماشام دەكرد. قۆرتێكیان لێداو شتێكیان تێداناشتو گەڕانەوە. كە ئەمەم دی، لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەوە چ بوو لێرە ناشتیان؟ چووم شوێنەكەم هەڵدایەوە دیتم كوڕێكە. كە ئەمەم بینی بە دوای دوو پیاوەكەدا ڕامكرد دیتم چوونە ماڵێكو ماڵەكەم بە نیشان كرد).

سوڵتان گوتی:

- ئێی؟

عەلی گوتی:

- هەستە بچین ماڵەكەت نیشان بدەم.

سوڵتانو وەزیر هەستان چوونە ماڵەكە. دیتیان ئەمە ماڵی دایەنی كوڕەكەیە. دایەنەكە خنكاندبووی‌و هاتبوون لە دەرەوەی شار شاردبوویانەوە. سوڵتان بە دایەنەكەی گوت:

- بۆچی ئەم ئیشەت كرد؟

دایەنەكەی كوشتو بە عەلی گوت:

- ناوت چییە؟

عەلی گوتی:

- ناوم (عەلی)یە.

سوڵتان گوتی:

- تۆ دەبێ لای من بمێنیتەوە. تۆ ئێستا وەكوو كوڕی خۆمی.

عەلی گوتی:
. باشە.
عەلی نامەیەکی بۆ ژنەکەی نووسی و پێی گوت:
. هاوسەری ئازیزم، من بوومەتە کوڕی سوڵتان و حاڵ و حەقایەت لەوەدایە!
کاتێ، کچکە نامەکەی پێگەیشت و خوێندییەوە، زۆر شادو گوشاد بوو.
دوای چەند مانگێك، عەلی پێنج سەد لیرەی بۆ ژنەکەی نارد. ئەویش کە پارەکەی پێگەیشت، وەستای هێنا و کۆشکێکی وەکوو ماڵی باوکی دروست کرد. ناوماڵێکی وەکوو ناوماڵی باوکی لێدانا. دوای ماوەیەك، سوڵتان نەخۆش کەوت. وەسیەتی کرد و لە وەسیەتەکەدا نووسی:
. (ئەگەر من مردم، عەلی لە جێی من دەبێتە سوڵتان)!
کوڕ ڕەزامەندییان لەسەردا. سوڵتان وەسیەتەکەی نووسی و چووە بەر دڵۆڤانیا خودێ!
وەزیرەکان هاتن تاجیان لە سەر سەری عەلی دانا و ناویان نا (سوڵتان عەلی).
ئەو حەلە، عەلی نامەیکی بۆ ژنەکەی نووسی و خەبەری دایە کە سوڵتان مردووەو ئەم لە جێی ئەو بۆتە سوڵتان. کچەکە کاتێ نامەکەی پێگەیشت، زۆر شادومان بوو. نامەیەکی بۆ عەلی نووسی و داوای لێکرد بگەڕێتەوە. عەلی وەڵامی دایەوە و گوتی:
. ماوەیەك سەبر بگرە.
عەلی دوو مانگ بە دادپەروەریی فەرمانڕەوایی کرد. وەزیرەکان زۆر لە فەرمانڕوایی عەلی ڕازی بوون. عەلی دوای ماوەیەك نامەیەکی بۆ ژنەکەی نووسی و گوتی:
ـ دێمەوە. لە دەرگای بازاڕەوە تا دەرگای ماڵەوە فەرش و قاڵی ڕاخەن. سندووقە لیرەیەکیشی بۆ نارد. پاش چەند ڕۆژێ، ژنەکە نامەکەو پارەکەی پێگەیشت. چوو فەرش و قاڵی کڕی و ڕایخست. سوڵتان عەلی بە خۆو بە پێنج سەد سواری چەکدار هاتەوە. کچەکە بە پیرییەوە چوو. عەلی چووەوە ماڵی خۆی کە دەتگوت بەهەشتە. دوای سێ ڕۆژ، عەلی بە ژنەکەی گوت:
. ئافرەت، کوا هەنارەکان؟

کچەکە گوتی:

. ئەوەتا.

عەلی چوار هەناری دەرهێناو بە کچەکەی گوت:

. هانێ ئەم چوار هەنار بۆ باوکت بنێرە.

کچەکە چوو هەنارەکانی لەسەر سینییەك داناو پارچە قوماشێکی حەریری بە سەر داداو بۆ دایکی بردو گوتی:

. ئەم هەنارانەم بۆ باوکم هێناوە.

دایکی گوتی:

. بڕۆ.. بڕۆ! باوکت لێت تووڕەیە.

کچەکە لە دایکی پاڕایەوە.

دایك هەمیشە دڵیپاكو ناسکەو کچ پارچەیەکی جگەرە!

دایکە هەنارەکانی بۆ سوڵتان بردو سوڵتان پرسی:

. ئەمە کێ ناردوویەتی؟

ژنەکەی گوتی:

. ئەمە هی کچە بچووکەکەتە.

سوڵتان گوتی:

. بۆچی شت لەم هیچو پووچە وەردەگرن؟!

ئینجا گوتی:

. چەقۆیەك بێنن با هەنارێك بشکێنین.

کە هەنارەکەی شکاند دیتی گەردەنبەندی گەوهەر بە گۆڕێ وەربوو. هەر گەردەنبەندێك شارێکی دەهێنا.

سوڵتان گوتی:

. ئۆی ئەوە چییە؟!

لە هەمان کاتیشدا بە هاتنەوەی سوڵتان عەلی خانی زانی. کچەکە بەیانی بە مێردەکەی گوت:

. بڕۆ بازاڕ هەندێ شتو مەکمان بۆ بکڕە. دەمەوێ ئەمڕۆ باوکم داوەت بکەم.

نامەیەکیشی بۆ باوکی نووسیو گوتی:

- باوکە، ئەمرۆ تۆ میوانی ماڵی ئێمەی!
زیافەتیان ئامادە کرد. کچەکە هەموو شتێکی لەسەر شێوەی ماڵی باوکی ڕێك خست. تەنانەت بادیو دوڵکەی ئاویش.
ڕۆژئاوا، باوکی کچەکە هات. کە چووە ژوورەوە دیتی دالانی خانووەکە ڕێك وەکوو دالانی خانووی خۆیانە. واقی وڕما!
چووە ژوورەو سەیری کرد هەموو شتێ وەکوو ماڵی خۆیانە. هەر وایزانی ئێرە ماڵی خۆیانە. بیری کردەوە چووە سەلال تەماشای کرد ئەویش وکوو ژووری خۆی وا بوو. سەری سوڕماو ویستی بپرسێ. بەلام شەرمی کرد.
شیویان خوارد. دوای شیو، دانیشتنو بە قسەی خۆش ڕایانبوارد. پاش ماوەیەك، خەڵکەکە هەموو پەرتەیان کرد. مایەوە سوڵتانو کچەکەیو زاواکەی!
کاتێ کچەکە دیتی هەموو خەڵکەکە بلاوەیان کرد، چوو دەستی باوکی ماچ کرد. سوڵتان گوتی:
- ئەمە یانی چی؟
کچەکە گوتی:
- من کچی تۆمو ئەمەش عەلی پەککەوتەیە. ئایا ژن چاکەی لەسەر پیاو هەیە؟ یان پیاو چاکەی لە سەر ژن هەیە؟
سوڵتان سەری سوڕماو پێی گوت:
- هەقی تۆیە. من بۆت دەسەلمێنم.
کە سوڵتان دیتی کچەکەی مێردی خۆی چ لێکردووە، سەر لە نوێ ئاهەنگی زەماوەندی بۆ سازدانو سازندەو گۆبەندەو شیربازی هێنان. دوای شیربازی، مەولودیان کردو سەر لە نوێ کچەکەیان بۆ عەلی گواستەوە. پاش چەند مانگێك، کچەکە کوڕێكو کچێکی بوو. هەر یەکە پۆکلەیەکی قژی زێڕو پۆکلەیەکی زیو بوو.
ژنو مێردو منداڵەکان بە خۆشیو شادی ژیان.
لای ئێوە بووینو هاتینەوە.

* * *

## ١٩ـ ترنجە خاتوون

هەبوو نەبوو...

وەزیرێـــك هـــەبوو، ســـێ كـــوڕی هـــەبوو.

كوڕەكـــان گـــەورە بـــوون: گەورەكـــە تەمـــەنی دەوری بیســـت ســـاڵ دەبـــوو. ناوەنجییەكە شازدە ساڵو بچووكەكە پازدە ساڵ بوو.

ڕۆژێ لـە ڕۆژان، باوكیـان چـووە ڕاوو شـكار. خیوەتیشـی بـردو لـەو دەرە هەڵیدا. ماوەیەكی پێچوو، ڕۆژێ، كوڕە گەورەی وەزیر چووە چۆڵو بیابان بۆ ڕابواردن. دەڕۆیشت، مـامزێكی دی، شـاخێكی زێڕو شـاخێكی زیـو بـوو. ئەسپی لنگ داو كەوتە دوایەوە. مامزەكـە ڕایكـرد. كوڕەكـە بەری دا دووی. بڕۆ بڕۆ تا مامزەكە گەیشتە سەر بیرێكو خۆی هەڵدایە ناو بیرەكەو لە ناو ئـاودا نقـووم بـوو. كوڕەكـە لـە سـواری ئەسـپەكەی دابـەزی. ئەسـپەكەی بەسـتەوەو چـووە نـاو بیرەكـە. خانوویـەكی تێـدابوو. دەرگـای خانووەكـەی كـردەوە، كۆشـكێك بـوو. چـووە نـاو كۆشـكەكە، خـەڵك دانیشـتبوون. چـوو گوتی:

- ڕۆژتان باش.

گوتیان:

- ڕۆژ باش، فەرموو چت دەوێ؟

گوتی:

. ئەو مامزەم دەوێ کە تازە هاتە ئێرە.
پێیان گوت:
. نابێ، مامز چۆن دەبەی؟
گوتی:
. هەردەبێ بیبەم. ئەگەر سەری خۆیشم لە پێناو دانابێ وازی لێناهێنم.
پێیان گوت:
. مادەم وایە برۆ ئەم ژوورە. ئەمە ژووری مامزەکەیە. لە دەرگا بدە کچەکە وا لەوێیە.
مامزەکە کچی سوڵتان بوو. بە جادوو خۆی دەکردە مامز. کوڕەکە چوو لە دەرگای دا. مامزەکە گوتی:
. چت دەوێ؟
کوڕەکە گوتی:
. تۆم دەوێ.
مامزەکە گوتی:
. ئی دڵیتە؟
کوڕەکە گوتی:
. ئەرێ بە خوا.
مامزەکە پێی گوت:
. هەقایەتی (ترنجە خاتوون) دەزانی؟
کوڕەکە گوتی:
. نەخێر.
مامزەکە ئەمری کرد گوتی:
. لە سەری دەن.
کوڕەکە هەر هێندەی زانی شیری وا لەسەر ملەو سەریان پەڕاند.
ڕۆژێ، برای ناوەنجی چووە دەرەوەو گوتی: با بچم بزانم برام چووە کوێ؟ دوو ڕۆژە بزر بووە. چوو گەیشتە هەمان شوێنی بیابان. ئەویش مامزەکەی دی و بە سواری ئەسپ کەوتە دووی. مامزەکە ڕایکرد. برۆ برۆ مامزەکە گەیشتە سەر

بیرەکەو خۆی فڕێ دایە ناوی‌و لە ناو ئاوی بیرەکە نقووم بوو. کە کوڕەکە دیتی مامزەکە چووە ناو بیرەکە، چووە سەر بیرەکە دیتی ئەسپی برای لەوێ بەسراوەتەوە. ئەویش ئەسپی خۆی بەستەوەو بە دوای مامزەکەدا شۆڕ بووەوە ناو بیرەکە. دەرگایەکی دی، پاڵی داو کردییەوە. کۆشکێك‌و کۆمەڵە خەڵکێکی بینی. چووە ژوورەوە بۆ لای خەڵکەکەو سەلامی لێکردن. سەلامیان لێوەرگرتەوەو پێیان گوت:

ـ فەرموو چت دەوێ؟

گوتی: ئەو مامزەم دوێ کە تازە هاتە ئێرە.

پێیان گوت:

ـ لاوێ، ئەمە مامز نییە، کچی سوڵتانە.

گوتی:

ـ ئەگەر کچی سوڵتان بوو چییە؟

گوتیان:

ـ بڕۆ سەرکەوە بۆ ژوورەکەی. وا لەوێیە. بزانە چ پرسیارێکی هەیە. ئەگەر وەڵامت پێدرایەوەو وەڵامەکەی بە دڵ بوو، شووت پێدەکا.

گوتی:

ـ باشە.

سەرکەوت بۆ ژووری کچەکەو پێی گوت:

ـ هاتووم تۆم دەوێ.

کچەکە گوتی:

ـ پرسیارێکت لێدەکەم.

کوڕەکە گوتی:

ـ فەرموو بپرسە.

کچەکە گوتی:

ـ هەقایەتی (ترنجە خاتوون) دەزانی؟

کوڕە گوتی:

ـ نەخێر نازانم.

کچەکە گوتی:

. لە سەری دەن.

کوڕەکە هەر هێندەی زانی وا شیری لە سەر ملەو سەریان لە لەشی جودا کردەوەو کچەکە سەرەکەی هەڵواسی.

پاش چەند ڕۆژێکی تر، برا بچووکەکەیان چووە دەرەوەو گوتی: دەبێ بچم پێ بکەوم چارەنووسی براکانم بە چی گەیشتووە. کەوتوونەتە کوێ و بۆ کوێ چوون! کوڕەکە زۆر عادزو غەمبار بوو. گوتی: مل دەنێمە بیابان! زۆر نەڕۆیشتبوو، مامزەکەی دی. کە چاوی بە مامزەکە کەوت، گوتی:

. ئاخ! ئەوە ئەمەیە براکانی منی تەفرە داوەو ڕەنگە هەر ئەمەییش هەردووکی کوشتبن!

ڕاوی مامزەکەی نا. مامزکە هەڵات. بڕۆ بڕۆ مامزەکە گەیشتە سەر بیرەکەو خۆی فڕێ دایە ناو ئاوی بیرەکە. کوڕەکە دیتی و ئەویش چووە سەر بیرەکە سەیری کرد ئەسپی دوو براکەی لەوێ بەسراونەتەوە. گوتی: زانیم! ئەم مامزە براکانی کوشتووم. ئەسپی خۆی لە تەك ئەسپی براکانی بەستەوەو چووە ناو بیرەکە. لە نیوەی ڕێگا، بیرەکە دوو دەرگای تێدابوو. نەچووە ئەو دەرگایەی مامزەکە چووە ناوی، نەخێر ئەو چووە دەرگاکەی دی. دەرگاکەی پاڵ داو کردییەوە. چووە ژوورێ. دیتی بازاڕو دونیایەکی دیکەیە! سەری سوڕما. برسێتی زۆری بۆ هێنا. لە دەرگایەکی دا. گوتیان:

. کێیە؟

گوتی:

منم.

وەڵامیان دایەوە:

. دەك بەخێر نێی! چیت دەوێ؟

گوتی:

. لە ڕێی خوا دەرگام لێ بکەنەوە.

دەرگاکەیان کردەوەو کوڕەکە چووە ژوورەوە دیتی پیرەژنێك بە تەنیایە. پێی گوت:

- دایپیرە، لە برسان قۆڕەم لە سکییەوە دێ.

پیرەژن گوتی:

- کێ پێی گوتی: ئێمە خواردنمان هەیە؟

کوڕەکە گوتی:

- ها، ئەمە لیرەیەك.

پیرەژن لیرەکەی وەرگرت و چووە خواریێ. خواردنی بۆ هێنا. کوڕەکە خواردنی خوارد و دەستی خۆی شووشت و سەیری دواوەی کرد. منارەیەکی دی. یەك دونیا سەری بنیادەمی پێدا هەڵواسرابوو. سەری هەردوو براکەی خۆیشی پێوە دی. پەنجەی خۆی گەست و گوتی: ئەوە ئەمە کووشتوونی. لە پیرەژنی پرسی:

- دایپیرە، ئەم منارەیە چییە؟

پیرەژن گوتی:

- وس بە. قسە مەکە! خۆت لەم شتانە هەڵمەقورتێنە!

کوڕەکە گوتی:

- دایپیرە، خوا لە دایبابت خۆش بێ. پێم بڵێ ئەمە چییە؟

پیرەژن گوتی:

- ئەمە ئیشی کچی سوڵتانە. خۆی دەکاتە مامزو دەچێتە دەرەوە بۆ دەشت و بیابان. هەر کەسێ ڕاوی بنێ و بیەوێ بیگرێ و بە دوایدا بێتە ئێرە، پرسیاری لێدەکا داخۆ هەقایەتی ترنجە خاتوون دەزانێ؟ یان نا؟ ئەگەر کابرا هەقایەتەکە بزانێ و بۆی بگێڕێتەوە، شووی پێدەکا، ئەگەر نەزانێ لە سەری دەداو سەری بەم منارەیەوە هەڵدەواسێ. کوڕەکە، کاتێ ئەمەی بیست، دەستی پیرەژنی ماچ کرد و پێی گوت:

- ها، ئەمە هەزار لیرەی زێڕ، هەقایەتەکەم پێ بڵێ. من وەکوو کوڕی خۆتم. تا پێم نەڵێی وازت لێناهێنم.

پیرەژن پێی گوت:

- باشە، بڕۆ ماڵی سوڵتانی باوکی کچەکە. لەوێ پێت دەڵێن: فەرموو چت دەوێ! بڵێ: ئێوە بۆچی ئەوەندە خنس و قرچۆکن؟ لێمگەڕێن با دابنیشم و پشوویەك بدەم! ئێوە چ کەسێکن؟

ماڵی سوڵتان، کە ئەم قسەیان لە کوڕەکە بیست گوتیان:
. فەرموو دانیشە!
فراوینیان بۆ هێنا. کە فراوینی خواردو لێبووەوە، گوتی:
ئێستا لێم بپرسن چم دەوێ!
سوڵتانی باوکی کچەکە پێی گوت:
. گەنجۆ، خێرە هاتووی؟ چت دەوێ؟
گوتی:
. بۆ کچەکەی تۆ هاتووم.
سوڵتان پێی گوت:
– برۆ لایەوە. پرسیارێکت لێدەکا.
کوڕەکە گوتی:
ـ بەڵام دەبێ ماوەیەك موڵەتم بدەن. تازە هاتووم. دەمەوێ خانوویەك بە کرێ بگرم.
سوڵتان پێی گوت:
. ئەوە مانگێك موڵەتم دای!
کوڕەکە گوتی:
. باشە.
ئەمەی گوت و گەڕایەوە لای پیرەژنەکە. پیرەژن گوتی:
. چەند ڕۆژ موڵەتت وەرگرت؟
کوڕەکە گوتی:
. ماوەی یەك مانگ.
پیرەژن گوتی:
. ماوەیەکی باشە.
ئینجا گوتی:
. هەستە بەگەڵم کەوە با بچین. سەعاتێك ڕۆیشتن. پیرەژن دەستی بۆ پرەمێردێك درێژ کردو گوتی:
. برۆ لای ئەم پیرەمێردە. ئەو ڕێنماییت دەکا چ بکەی!

کوڕەکە چووە لای پیرەمێردەکەو دەستی ماچ کرد. پیرەمێرد گوتی:

. برازا، چیت دەوێ؟

کوڕەکە گوتی:

. شتێکم لە تۆ دەوێ.

پیرەمێرد گوتی:

. بڵێ شتەکە چییە؟

گوتی:

. هەقایەتی (ترنجە خان)م لە تۆ دەوێ.

پیرەمێرد گوی:

. دە بڕۆ بڕۆ!. ئەوە تۆ لە کوێ نووستووی؟! ئەم هەقایەتە سەری هەردووکمان دەخوا.

کوڕەکە گوتی:

. هەر لێرە خۆم دەکوژم. ئەوەی دەمەوێ وازی لێ ناهێنم. دەستی پیرەمێردی ماچ کردو پیرەمێرد دڵی نەرم بوو و بە گەنجەکەی گوت:

ـ هەستە لەگەڵم بچین. ڕێگاکەت نیشان دەدەم. قاوەخانەیەك هەیە، تا لای قاوەخانەکە لە گەڵت دێم. تۆ بڕۆ ناو قاوەخانەکە. شاگردێکی لێیە. مێزەرێکی ئەستووری لەسەرە. بڕۆ دەستی ماچ کە. لێت دەپرسێ چیت دەوێ؟ بەسەرهاتی خۆتی بۆ بگێڕەوەو پێی بڵێ: کە هەقایەتی خۆتت بۆ گێڕامەوەو لێ بوویتەوە، لەسەرم بدە. کە لە هەقایەتەکە بووەوە، پێی بڵێ: بەرلەوەی بمکوژی، دەمەوێ نوێژێك لەسەر بانی قاوەخانە بکەم. بڕۆ سەر بانی قاوەخانەکە من دێم هەڵتدەگرمو دەڕۆین.

کوڕەکە گوتی:

. باشە.

ڕۆیشتن. گەیشتنە قاوەخانەکە. پیرەمێردەکە لە شوێنێك دانیشتو چاوەڕێی کرد. کوڕەکە چوو لە قاوەخانەکە دانیشت دیتی ئەو کابرایەی دەیەویست هات لە تەنیشتی دانیشتو لێی پرسی:

. برا، خەڵکی کوێی؟

کوڕەکە گوتی:

- لایدەم. هاتووم ئیشێکم بە تۆیە.

شاگردەکە گوتی:

- بڵێ چ ئیشت هەیە؟

گوتی:

- هەقایەتی (ترنجە خان)م لە تۆ دەوێ.

کە شاگردی قاوەخانەکە گوێی لێ بوو، بە تووڕەیی گوتی:

- دەك لەعنەت لە خۆت و لە بابی ئەو کەسەی ڕەوانەی ئێرەی کردووی!

کوڕەکە گوتی:

- شتی وا کەڵکی نییە تا بۆم نە گێڕیتەوە، قەت لێرە ناڕۆم!! قەیدی نییە، کە لێ بوویتەوە، لەسەرم بدە.

کابرا گوتی:

بەم مەرجە ڕازیت؟

گوتی:

- بەڵێ ڕازیم؟

شاگردی قاوەخانەکە گوتی:

- کەواتە گوێ بگرە برام:

(من کوڕی سوڵتانێکی گەورەم. باوکم وڵاتێکی گەورەی هەیە. کاتی خۆی حەفت دۆتمام هەبوو. یەکەمینم خواست دیتم کچی نییە. یەکێکی ترم هێنا هەروا. هەر یەکێکم هێنا بەم جۆرە بوو. تا بچووکەکەم هێنا، ئەویش هەر وا بوو. لە دڵی خۆمدا گوتم: من پسمامی ئەم کچانەم دەبێ نهێنییان دابپۆشم. بچووکەکەم لای خۆم گل دایەوە. چەند ئەسپێکم هەبوو بە قەد چاوی خۆم خۆشم دەویستن. بەردەوام خزمەتم دەکردن. بە مەیتەریشم گوتبوو باش خزمەتیان بکا.

ڕۆژێ، چوومە تەویلە دیتم هەموو ئەسپەکان شەکەت و داهێزراون. بانگی مەیتەرم کرد. دەستم دایە دارێك و کەوتمە گیانی و پێم گوت: پێم بڵێ کێ ئەم ئەسپانەی ئاوها لە هۆرو دۆر بردووە. مەیتەر گوتی:

. هەموو ڕۆژێ عیشایێ، ژنەکەت دێ پێم دەڵێ ئەسپێکم بۆ زین کە. هەر شەوە ئەسپێك دەبا. سواری دەبێ و دەردەچێ تا مەلابانگدانی سبەینێ نایەتەوە.
گوتم: قەت نەبی!! ئەمە شتێکی زۆر سەیرە!! تۆ بە ڕاستیتە؟! گوتی: ئەری بەخوا! کە ئەمەم گوێ لێبوو لە خەفەتان خواردنم پێنەخورا. بوو بە عیشا، چووم خۆم لە ناو تەویلە شاردەوە. دوای نەختێ ژنەکەم هات قیژاندی: مەیتەر!مەیتەر! مەیتەر گوتی: بەڵێ. گوتی: فلانە ئەسپم بۆ زین کە. مەیتەر ئەسپەکەی بۆ زین کرد. ژنەکەم سوار بوو. منیش وا تەماشام دەکەمو لە ناوەوە دەقنێمەوە. ژنەکەم ڕۆیشت گەیشتە لای شەش خوشکەکەی تری. ژنەکەم حەفتەمین بوو. بە یەکەوە ڕۆیشتن. منیش قەرە بە قەرەیان چووم. ماوەیەکی زۆر ڕۆیشتن. گەیشتنە ئەشکەوتێك. لە دەرگایان دا. دەرگا کرایەوە. لە ناو ئەشکەوتەکە پێیان گوتن: ئەوە بۆچی تاخیر بوون؟ گوتیان: چ بکەین چاوەڕێمان کرد. تا مێردەکانمان خەوتن! منیش خۆم شاردەوە، گوێم ڕاگرتو تەماشام کرد. دانیشتنو خواردیانەوە و سەرخۆش بوون، دەستیان بە سەماو گۆرانی کرد. هەر یەکە چوار پیاویان بەرکەوت. تا بەیانی پیاوەکان سواریان بوون. بەیانی، کچەکان سوار بوونو گەڕانەوە. کە کچەکان دەرچوونو ڕۆیشتن. من بە دزی چوومە لای قوڵە ڕەشەکان. هەموو لە سەرخۆشییان وڕو گێژ ببوون. هەمووم کوشتنو گوێو لووتم بڕینو بردم شاردمەوە. ئەوسا گەڕامەوە. بەڵام باسی هیچم نەکرد. ڕۆژی پاشی، شەو ئێشکم گرتو نەنووستم. کاتی عیشا، ژنەکەم هەستاو دەرگای کردەوەو چووە دەرەوە. پاش دوو سەعات هاتەوە. منیش هەستام دیتم پەستو غەمبارە، پێم گوت: ئافرەت، ئەوە چیتە؟ گوتی: هیچ. سبەینێ دەستی بە گریان کرد. گوتم: هەی بێ حەیا، چ بووە؟ گوتی: تۆ هەقت چییە؟! گوتم: هەی بێ حەیا، ئەوە بۆ ئەو قوڵە ڕەشە پیسانە دەگری؟ ها بگرە. گوێو لووتەکانم بۆ تێ هەڵدا. کە گوێو لووتەکانی دی، گوتی: ئۆی ئەوە دیارە تۆ کووشتووتن؟! چوو دارێکی هێنا. دارێکی لێدامو گوتی: بڕۆ، ببە بە سەگ!!. لێی دامو کردمی بە سەگ. کە بووم بە سەگ، لە خەفەتان سەرم بۆ دەشتو دەر هەڵگرت. هەر ڕۆیشتم ڕۆیشتم تا گەیشتمە سەر کانیو دارتووەکە. لە بن دارتووەك وەرکەتم. دوای نەختێ دیتم سێ کۆتر هاتن.

لەسەر دارتووەکە هەڵنیشتن. جلیان داکەندو لە کانیاوییەکە لە ئاو کەوتن. یەکێکیان شەرمی دەکرد. خوشکەکەی پێی گوت: شەرم لە کێ دەکەی؟ لەو سەگە؟ خوشکەکەی گوتی:

ـ ئەمە سەگ نییە. ئەمە مێردی کچی سوڵتانە، ئەو کچەی دەچووە لای قوڵەڕەشەکان و سواری خۆی دەکردن. ئەم پیاوەی مێردی کە پێی زانی، قووڵەڕەشەکانی کوشت  ئیتر ژنەکەی دارێکی لێداو کردی بەم سەگە. وەرن فێری بکەین چ بکا. بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە سەر شکڵی بنیادەمان. شتەکە زۆر ئاسانە ئەگەر گەڵایەکی ئەم دارتووە بخوا، دەبێتەوە بنیادەمی جاران. کۆترەکان ئەمەیان گوت و لە شەققەی باڵیان داو فڕین. منیش بەسەر درەختەکە کەوتم و گەڵایەکم لێ کردەوەو خواردم. بوومەوە بە بنیادەم. چوومەوە ماڵێ و لە دەرگام دا. ژنەکەم گوتی: کێیە؟ گوتم: منم. گوتی: ئەوە فێریان کردی؟ ئینجا دەرگای کردەوەو ئەم جارە دارێکی لێدام و گوتی: بڕۆ ببە بە کەر. کە لێی دام دیتم بووم بە کەر. لە دڵی خۆمدا گوتم خودای ئەمە چییە؟ چوومە لای درەختی جاران و لە سەر کانییەکە دانیشتم. کۆترەکان هاتن و منیان دی و گوتیان: ئۆی ئەم جارە کردوویەتی بە کەر!

بچووکەکەیان هەندێ گەڵای دامێ و خواردم. کە خواردم گەڕامەوە سەر شکڵی جارانم. ئینجا دارێکی دامێ و گوتی: بڕۆوە لای ژنەکەت. لە دەرگا بدە! کە دەرگای لێ کردیتەوە، بەو دارە دارێکی لێبدەو بیخە سەر هەر شکڵێك کە خۆت دەتەوێ. دارێکی ئەستوور بوو. سەری پڕ نووسینی جادوویی بوو. چوومەوە ماڵێ و لە دەرگام دا. ژنەکەم گوتی: کێیە؟ گوتم: منم ئاودێرم. دەرگای کردەوە. دارێکم لێداو گوتم ببە بە مانگا. کە بوو بە مانگا دەستی بە بۆڕە بۆڕ کردو هەموو دراوسێ لێی وە زاڵە کەوتن. باوکی ڕەوشتی وا بوو. مانگی جارێك سەردانی دەکرد. سەری مانگاکەم بڕی و گۆشتەکەم بەسەر خێزانی هەژاراندا دابەشییەوە. ڕۆژێ، باوکی هات و گوتی: ئەی کوا (ترنجە خاتوون)؟ گوتم: سەرم بڕی. لەشکری کردە سەرم بۆ ئەوەی بمگرێ و سەرم ببڕێ. منیش ڕامکرد هاتم لەم قاوەخانەیە بووم بە شاگرد. ئێستا سەیری حاڵی من بکە! من کوڕە سوڵتان بووم. ئێستا ئاوام بە سەر هاتووەو ئەو کچەی داوای هەقایەت دەکا

(ترنجە خاتوون)ە. دەگەڕێ ئەو کەسە بدۆزێتەوە کە قوڵە ڕەشەکانی کوشتووە بۆ ئەوەی بیکوژێ. برام ئەمەیە هەقایەتی من).
جا ئێستا هەستە بۆ ئەوەی لەسەرت بدەم.
کوڕەکە پێی گوت:
- باشە.
بەڵام گەڕایەوە گوتی:
- دەمەوێ بچمە سەر بانی قاوەخانەو پێش ئەوەی بمرم، دوو ڕکات نوێژ بکەم.
کابرا گوتی:
- باشە.
کە کوڕەکە چووە سەربان، پیرەمێردەکە هات. لەسەر شانی خۆی داناو هێنایە خوارێ‌و هەڵاتن. شاگری قاوەخانەکە چوو لە کوڕەکە گەڕا، نەیدیتەوە. پاش نەختێ، لێی نائومێد بوو. کوڕەکەو پیرەمێردەکەیش ڕۆیشتن تا گەیشتنەوە لای پیرەژنەکە. کوڕەکە دەستی پیرەژنەکەی ماچ کردو پێی گوت:
- دایکە، هەقایەتەکەم وەرگرت.
ڕۆژی پاشی، چووە ماڵی سوڵتانی باوکی کچەکە. کوڕ گەرم بوو. چووە ژوورەوە سەلامی کرد. سەلامیان لێ وەرگرتەوە. گوتی:
- جەنابی سوڵتان. بەڵێنم پێدەدەی. ئەگەر هەقایەتەکەم گێڕایەوە، ئازارم نەدەی. بێ کێشەو دۆخە کچەکەتم بدەیتێ؟
گوتی:
- هەقایەتەکە بگێڕەوە ئەمن و ئەمانی!
کوڕەکە گوتی:
- گەڵۆ، ئێوە کیهاتان باوکی کچەکەن.
گوتیان:
- ئەمە باوکی کچەکەیە.
کوڕەکە گوتی:
- کچەکەت لە خەڵك بەرداوە. بەلاش سەری خەڵك دەبڕێ؟!
گوتی:

. بۆچی بەلاش؟!

کوڕەکە گوتی:

. کچەکەت جندەو بیٚ ئابڕووە. ئەم کچەت هەقایەتێکی کردوٚتە بیانوو خەڵکی پیٚدەکوژیٚ. هەقایەتەکە ئەوها و ئەوها و ئەوهایە! ئەگەر باوەڕیش ناکەی، کچەکەت بپشکنە. کچەکەی پشکنی دیتی کچ نییەو کراوە بە ژن. گرتیو سەری بڕی. کە سەری بڕی، تەوازۆی بۆ کوڕەکە هێنایەوە کە براکانی کوژراون. ئینجا ژنێکی بۆ هێنا. کوڕەکە لەویٚ ژنەکەی گواستەوەو چووە پەردەو دوو مانگ لەویٚ مایەوە. پاش دوو مانگ کوڕەکە بە سوڵتانی گوت:

– مامە، دەمەویٚ بچمەوە لای کەسو کاری خوٚم.

سوڵتان دیاریو شتی دایی‌و ئیزنی دا. کوڕەکە شتەکانی هەڵگرتو بەخوٚی و بە ژنەکەیەوە ماڵئاواییان کردو ڕوٚیشتن تا گەیشتنەوە ماڵیٚ. کوڕەکە دیتی دایکو باوکی مردوون. تا ما بوون زوٚر بە خوٚشیو خوٚشبەختی ژیان.

لای ئێوە بووینو هاتینەوە.

★ ★ ★

## ٢٠ـ چیای ڕەش

هەبوو نەبوو....

وەزیرێك هەبوو، کوڕێکی هەبوو. کوڕەکەی خوێڕی بوو. ئارەقی دەخواردەوەو پارەیەکی زۆری بە بادەدا.

ڕۆژێ، باوکی نەخۆش کەوت و زۆری نەبرد مرد. کوڕەکە پاش مردنی باوکی چی پارەی بە میرات بۆ مابووەوە، بە ماوەیەکی کەم هەمووی تەخشان و پەخشان کرد. وای لێهات پارەی نەبوو جگەرەیەك بکڕێ. دایکی لە ماڵەوە بە کەساسی و نەداری دەژیا. ڕۆژێ، کوڕەکە لە قاوەخانە دانیشتبوو کابرایەکی جوولەکە هات، گوتی:

. سەفەرێکم هەیە کێ ئەو سەفەرەم لەگەڵ دەکا، پەنجا لیرەی دەدەمێ.

کوڕەکە گوتی:

. من لەگەڵت دێم.

جوولەکەکە گوتی:

. ناوت چییە؟

گوتی:

. ناوم (جاسم)ە.

جوولەکەکە پەنجا لیرەی دایێ. کوڕەکە چووەوە ماڵێ. سی لیرەی دایە دایکی و بیست لیرەی بۆ خۆی گل دایەوە. کابرای جوولەکەو کوڕەکە تەدارەکیان ڕێکخست و چوونە سەفەر. هەر ڕۆیشتن ڕۆیشتن. لە هەورازان هەڵکشان و لە نشێوان داکشان تا گەیشتنە چیایەکی ڕەش. لەوێ لایاندا. جوولەکەکە بە کوڕەکەی گوت:

ـ ها، ئەم دوو نانە بگرە. لە گیرفانت دانێ! ئێستا لە ناو پێستە گایەکت دەدوورم. هەڵۆیەك دێ و هەڵت دەگرێ و دەتبا لەسەر ئەم چیایە داتدەنێ. لەوێ، هەندێ گیای سەر چیام بۆ بدوورەوەو بۆم فڕێ دە خوارەوە. کە لێبوویەوە، ڕێگایەکی وەك پلیکانەت نیشان دەدەم، پێدا وەرە خوارێ.

کوڕەکە گوتی:

ـ باشە.

کابرای جوولەکە پێستە مانگایەکی هێنا. کوڕەکەی لەناو ناو دووری و لە لایەکی دانا. هەڵۆیەك هات پڕی دایەو بردییە سەرچیای ڕەش. کوڕەکە لە ناوەوە پێستەکەی شەق کردو هاتە دەرەوە. دەستی بە گیا کردن کرد. هەر گیای دوورییەوەو بۆ کابرای جوولەکەی فڕێدایە خوارەوە تا بوو بە باری حەفت ئێستران. ئەوسا کوڕەکە گوتی:

ـ ئەوە تێر گیام بۆ بەردایتەوە. ئێستا ئەو ڕێیەم نیشان دە کە دەڵێن وەکوو پلیکانە وایە بۆ ئەوەی لەو چیایە سەختە بێمە خوارێ.

جوولەکەکە پێی گوت:

ـ ڕێی چی؟و پلیکانەی چی؟ بۆ خۆت تا دەمری لەوێ بخەوە!

کوڕەکە پێی گوت:

ـ ئاخ! چۆن تەفرەت دام.

کوڕەکە چووە سەر لێواری هەڵدێری چیاکەو خۆی پێچایەوەو خۆی بانگەرۆژ کردە خوارەوە. بە غلۆر بوونەوە هات تا گەیشتە سەر زەوی. زۆر شەکەت و بێتاقەت بوو. دەستی لە گیرفانی ڕاکرد دیتی دوو نانی تێدایە. دوو نانەکەی خوارد. کە نانەکەی خوارد، پیرەمێردێکی بینی. پیرەمێردەکە لێی پرسی:

ـ کوڕم، ئەوە تۆ لە کوێوە دێی؟ چیت لێ قەوماوە؟

کوڕەکە گوتی:

ـ کابرایەکی جوولەکە منی هێنا. ڕەوانی سەر ئەم چیایەی کردم. ئیشی خۆی پێکردمو لەوێ جێی هێشتم. منیش خۆم بانگەرۆژ کردەوە. ئێستا نازانم چۆن بگەمەوە ماڵێ. پیرەمێردەکە پێی گوت:

ـ دەتەوێ بتگەیەنمەوە ماڵی خۆتان؟

کوڕەکە گوتی:

ـ ئەرێ بەخوا!

پیرەمێردەکە گوتی:

ـ چاوت بنووقێنە!

کوڕەکە چاوی خۆی نووقاند. پیرەمێردەکە مستێکی لە پشتی دا. کوڕەکە چاوی کردەوە دیتی لە ناو خزمو کەس‌و کاری خۆیەتی. چووەوە ماڵێ لە دەرگای دا. دایکی لە خەفەتی کوڕەکەی کوێر ببوو. کە چاوی بە کوڕەکەی کەوت، چاوی چاك بووەوە. کوڕەکە لەگەڵ دایکی دەژیا. لەگەڵ وەستاو عەمەلان دەچووە قوڕکاری. ڕۆژێکی هەینی دیسان لە قاوەخانە دانیشتبوو، جوولەکەی گۆڕین هات‌و گوتی:

ـ سەفەرێك هەیە کێ لەگەڵم دەکا؟ پەنجا لیرەی دەدەمێ!

کوڕەکە، کە چاوی پێکەوت:

ـ ناسییەوەو لە دڵی خۆیدا گوتی:

ـ ئەمە بوو تەفرەی دام. ڕاوەستە، ئەو چی لە من کرد، دەبێ منیش ئاوهای لێبکەم. چووە لای جوولەکەکەو گوتی:

ـ من لەگەڵت دێم.

جوولەکەکە تەماشای کوڕەکەی کرد دیتی شێوەی لەو کوڕە دەکا کە جاری پێشوو لە گەڵیا چوو. لێی پرسی:

ـ پێم بڵێ ئایا تۆ (جاسم) نیت؟

کوڕەکە گوتی:

ـ نا. من ناوم (محەمەد)ە!

ناوی خۆی گۆڕی بۆ ئەوەی نەیناسێتەوە. کابرای جوولەکە پەنجا لیرەی دایێ.
کوڕەکە لێی وەرگرت و چووە لای دایکی و پێی گوت:

. دایکە، لەگەڵ کابرای جوولەکە دەردەچم؟

دایکی گوتی:

. کوڕم مەچوو. دەترسم ئەم جارەیش تەفرەت بداو کەتنێکت پێ بکات.

کوڕەکە بە دایکی گوت:

. نا. دایە، ئەم جارە بە پشتیوانی خوا من ئەو تەفرە دەدەم!

کوڕەکە سی لیرەی دایە دایکی و بیست لیرەی بۆ خۆی گێڕایەوە. ئەوسا لەگەڵ کابرای جوولەکە بۆی دەرچوون. ڕۆیشتن تا گەیشتنە بن چیای ڕەش. کابرای جوولەکە بە کوڕەکەی گوت:

ـ ئێستا لە ناو پێستەی مانگایەکت دەنێم و دەیدوورم. هەڵۆیەك دێ دەتباتە سەر ئەم چیایە. کە چوویتە سەر چیا، پێستەکە شەق کەو وەرە دەرەوە.

کوڕەکە گوتی:

. من نازانم چۆن بچمە ناو پێستی مانگا. تۆ بڕۆ ناوی بۆ ئەوەی ببینم و بزانم شتەکە چۆنە.

کابرای جوولەکە چووە ناو پێستی مانگاکە. هەر هێندە چووە ناوی، کوڕەکە بە تەردەستی پێستەکەی لەسەر دووری و لەولاوە داینا. هەڵۆیەك هات و بردی فڕێی دایە سەر چیا. کابرای جوولەکە پێستەکەی شەق کردو هاتە دەرەوە.

کوڕەکە پێی گوت:

. هەی جوولەکە، من (جاسم)م کە جاری پێشوو تەفرەت دام. کابرای جوولەکە. پێی گوت:

. چۆن هاتیتە خوارێ؟ پلیکانەکە لە کوێیە؟

کوڕەکە گوتی:

ـ جارێ تۆ هەندێ گیای سەر چیام بۆ بکەو بۆم فڕێ دە خوارەوە، ئەوسا ڕێگاکەت نیشان دەدەم. کە وەکوو پلیکانە وایە. کابرای جوولەکە گیایەکی زۆری لە سەر چیاکە کردو بۆ کوڕەکەی فڕێ دایە خوارەوە.

کوڕەکە گیاکەی لە ئێستران بارکرد. جوولەکەکە پێی گوت:

. دەوجا پێم بڵێ پلیکانەکە لە کوێیە؟

کوڕەکە گوتی:

. پلیکانەی چی؟ تا دەمری بۆ خۆت لەوێ بخەوە.

کوڕەکە ئێسترەکانی دایە پێش خۆی هات تا گەیشتە سەر جۆگایەك. خۆی شووشت و ئێسترەکانی بەستەوەو نووست. پاش نەختێ، حەفت کۆتر هاتن. کچ بوون پەڕی کۆترییان پۆشی بوو. جلیان داکەندو دەستیان بە مەلە کرد. کوڕەکە بە ئاگا هات. چاوی بە کچەکان کەوت، ئەشقی کچە بچووکەکە بوو کە ناوی (گوڵبەهار) بوو. کوڕەکە چوو جلی کچە بچووکەکەی دزی و لە نزیك خۆی لە بن تاشە بەردێك شاردییەوە. کچەکان لە مەلەوانی بوونەوە، پەڕو تووکی کۆتریان کردەوە بەرو لە شەققەی باڵیان داو فڕین. بەڵام کچە بچووکەکە ئەوەندەی بە دوای جلەکانیدا گەڕا نەیدۆزییەوە. چاوی گێڕا دیتی کوڕەکە لە ژێر تاتە بەردێك شاردبوویەوە. چووە لای و گوتی:

. جلەکانم بدەوە.

کوڕەکە پێی گوت:

. من جلەکانی تۆم نەدیوە.

کچەکە سەری کوڕەکەی ماچ کرد. کوڕەکە جلەکانی دایەوە. کچەکە جلەکانی کردەوە بەرو لەشەققەی باڵی دا و فڕی. کە ئەو فڕی و ڕۆیشت. کوڕەکە لە هۆش خۆی چوو. پاش نەختێ، پیرەمێردەکە هات دیتی کوڕەکە لە هۆش خۆی چووە. گوڵاوی هێناو لێی پرژاند. کوڕەکە چاوی کردەوە. کە وەخۆ هاتەوە، پیرەمێردەکە لێی پرسی.

– ئەوە مەسەلە چییە؟ چۆنە دیسان هاتووی؟

کوڕەکە گوتی:

ـ بە خوا دووبارە لەگەڵ جوولەکەکە هاتم. ئەم جارە من ئەوم تەفرە داو ئێسترەکانم لێ سەندو هاتم ئێسترەکانم ئاوداو بەستمنەوە. خۆم لە جۆگا شووشت. خەوم هات و نووستم. کە هەستام دیتم حەفت کچ هاتن پەڕی کۆترانییان لەبەر بوو. پەڕەکانیان داکەندو دەستیان بە مەلە کرد. جلی کچە بچووکەکەم دزی و لای خۆم شاردمەوە. کچەکان کە لە مەلەوانی بوونەوە،

پەڕەکانییان کردەوە بەر. کچە بچووکەکە لە جلەکانی خۆی گەڕا، نەیدیتەوە. زانی لێیان شاردوّتەوە. هاتە لای منو سەری ماچ کردم. منیش جلەکانم دایەوە لەبەری کردو لە شەقەی باڵی داو ڕۆیشت. ئێستایش خۆم دەخاڵەتی تۆ کرد. دەمەوێ ڕێنماییم بکەی بۆ لای ئەو کچە. پیرەمێردەکە، کە گوێی لەم قسانە بوو، گوتی:

- هەی بەدبەخت، ئەوە تۆ چیت کردووە؟! ئەو کچە کچی شای ئەجندانە. من بە خێوم کردووە. دەترسم بە باوکی بڵێ باوکی سەری تۆو سەری منیش ببڕێ. هەستە بڕۆوە ماڵی خۆت. کوڕەکە گوتی:

- ناتوانم. هەر ئێستا دەمرم.

کوڕەکە هەستا هەر دوو دەستو هەر دوو پێی پیرەمێردەکی ماچ کرد.

پیرەمێردەکە پێی گوت:

- مادەم حاڵت ئەوهایە تا بەیانی چاوەڕێ بکە. بەیانی دووبارە دێنو دیسان جلەکانی لێ بدزە. بەڵام ئەم جارە جلەکانی مەدەوە. من ڕازی دەکەم. کوڕەکە ئەو شەوە نە هیچ خەوتو نە هیچی خواردو نە هیچی خواردەوە. ڕۆژی پاشی، کە بوو بە نیوەڕۆ کچەکان هاتن جلەکانیان داکەندو مەلەیان کرد. کوڕەکە جلی کچە بچووکەکەی دزی کە ناوی گوڵبەهار بوو. کچەکان، کە لە مەلەوانی بوونەوە، جلەکانییان کردەوە بەرو فڕین. کچە بچووکەکە مایەوە. بە دوای جلەکانیدا گەڕاو کوڕەکە چووە لایو سەری ماچ کردو داوای لێکرد لەگەڵیا بچێ. کچەکە ڕازی نەبوو. داوای جلەکانی خۆی کردەوە. پیرەمێردەکە هاتو پێی گوت:

- شازادە خانم، ئەم کوڕە وەختە بۆ تۆ بمرێ.

کچەکە کاتێ چاوی بە پیرەمێردەکە کەوت، ڕووی سوور هەڵگەڕاو گوتی:

- ئاخ!! هەی گەوواد. ئەوە تۆ پێت گوت وا بکا. بزانە چت لێ بکەم.

پیرەمێرد زۆر ترسا. خەنجەرت لێدابا خوێنی لێنەدەهات. کوڕەکە خۆی پێڕانەگیرا. هەر ڕایماشتە کچەکەو ئەوەی ویستی لەگەڵی کرد. ئیتر کچەکە پێی ڕازی بوو. زۆریش هۆگری بوو. مانگێك لەلای پیرەمێردەکە مانەوە. دوای ئەو مانگە، کوڕەکە بە پیرەمێردەکەی گوت:

. دەمەویّ بچمەوە ولاّتی خوّم.

کوڕەکە بە خوّو بە ژنەوە ڕوّیشتن. ژنەکەی بردەوە ماڵیّو لە دەرگای دا. دایکی دەرگای کردەوە. دایکی تەندروستی زوّر باش بوو. کوڕەکە هەقایەتی خوّی لە سەری هەتا بنی بوّ گێڕایەوە. ڕوّژیّ، کوڕەکە چوو بووە حەمام، گوڵبەهار بە خەسووی گوت:

. پووریّ، لەگەڵ دراوسێکان بوّ سەیران دەچمە ناو باخ!

خەسووی ڕازی نەبوو. جوێنی پێدا. گوڵبەهار پێی گوت:

. جوێنم پێدەدەی؟

هەستا چووە سەربانو پەڕی کوّترانی کردە بەرو لە شەققەی باڵی داو فڕیو بەرز بووەوەو گوتی:

. پووریّ، هوّ پووریّ، ئەگەر کوڕەکەت منی دەویّو بە ڕاستی خوّشی دەویّم، من لە شاری (چین و ماچین)م. ئینجا لە شەققەی باڵی داو فڕی. ئەو فڕی مێردی گەیشتەوە ماڵیّ. دایکی بەسەرهاتەکەی بوّ گێڕایەوە. کوڕەکە جلی لەبەر خوّی دادەدڕیو لە سەرو پوّتەلاکی خوّی دا. توێشووی هەڵگرتو ڕوّیشت تا گەیشتە لای پیرەمێردی برادەری. پیرەمێرد پێی گوت:

. دیسان بوّچی هاتووی؟

کوڕەکە گوتی:

. خوّم هاوێشتە سەر توّرو بەختی توّ! کچەکە هەڵاتووەو بە دایکمی گوتووە: ئەگەر منی دەویّو بە ڕاستی خوّشی دەویّم، با بە دوامدا بێتە شاری (چینو ماچین).

پیرەمێرد، کە ئەمەی بیست، گوتی:

ـ دەك ماڵی خوّتو ماڵی باوکت کاول بیّ!! باوکی لەشکرم دەکاتە سەرو دەمکوژیّ!

کوڕەکە پێی گوت:

. دەخیلت بم! توّ تەنیا شاری (چین و ماچین)م نیشان بدە.

پیرەمێرد گوتی:

- باشە، نیشانت دەدەم. پیرەمێرد نامەیەکی نووسی و گوتی: بڕۆ ئەم ڕێگایە بگرە تا دەگەیتە دێوێك. چەقی ڕێگای گرتووە. ئەم نامەیەی بۆ باوێ. ئەو ڕێگات نیشان دەدا.

کوڕەکە نامەکەی وەرگرت و ڕۆیشت. هەر ڕۆیشت ڕۆیشت. لە هەورازان هەڵکشا و لە نشێوان داکشا تا گەیشتە پەڵە هەورێکی ڕەش. ڕێگای گرتبوو. زانی ئەمە دێوەکەیە. نامەکەی بۆ هاوێشت. دێوەکە نامەکەی گرتەوە و خوێندییەوە. کە خوێندییەوە، بە ڕێزو ڕووەت لەسەر سەری خۆی دانا. ئینجا بانگی هەموو تەیری دونیای کردو گوتی:

- ئەم کوڕە هەڵگرن بیبەن بۆ شاری (چین و ماچین)

تەیرەکان کوڕەکەیان لەسەر باڵی خۆیان دانا و لە حەفت دەریایان پەڕاندییانەوە و لەو بەری، لەسەر کەناری دەریا دایاننا. تەیرەکان ڕۆیشتن. تەنیا یەك تەیری لە لا مایەوە. خورجینەیەکی پێبوو. خواردن و شمشێری تێدا بوو. کوڕەکە کۆشکێکی بلووریی دی. لە دوورەوە دەدرەوشایەوە تیشکەکەی وەکو تیشکی خۆر وابوو. چل دێو لە بەردەرگای کۆشکەکە بوون. شمشێری هەڵکێشا و هەمووی کوشتن دیتی دەرگای کۆشك کلیل دراوە. بە تەیرەکەی گوت:

- هەڵمگرە و لەناو ئەم کۆشکەم دانێ!

تەیرەکە هەڵیگرت و لە ناو حەوشەی کۆشکەکەی دانا. کوڕەکە ژوورێکی دی ناڵە ناڵێکی لێوە دەهات. بەر دەرگای ژوورەکە دەرزی و خەنجەرو چەقۆی لێ چەقاندرا بوو. کوڕەکە بە تەیرەکەی گوت:

- وەرە هەڵمگرە، بمبە ناو ئەم ژوورە. تەیرەکە هەڵی گرت و لە ناو ژوورەکەی دانا. کوڕەکە چاوی بە ژوورێدا گێڕا ژنەکەی خۆی بینی بە قژییەوە هەڵواسرابوو. گوتی:

- تۆ بۆچی واتکرد و بۆچی وات بەسەرهات؟!

ژنەکە گوتی:

- هەر لێی گەڕێ. ئەمە ئەقڵی ژنانە.

کوڕەکە پێی گوت:

- من تۆم زۆر خۆش دەوێ. هاتوومەتە دوای تۆ. هەستە با ڕاکەین.
ژنەکە گوتی:
- جنۆکە خۆمان پێدەگەیەنن و دەمانکوژن. بەڵام بڕۆ لای باوکم داخوازی منی لێ بکە. باوکم داوای سێ شتت لێ دەکا. وەرە لام من شتەکانت فێر دەکەم. کوڕەکە چووە لای باوکی گوڵبەهار، سەیری کرد لەگەڵ دام ودەستەکەی لە دیوەخان دانیشتووە. سەلامی کرد. سەلامیان لێ وەرگرتەوە. گوتی:
- کامە پاشایە؟
گوتیان:
- ئەمە پاشایە.
کوڕەکە ڕووی کردە پاشاو گوتی:
- هاتوومەتە داخوازی گوڵبەهاری کچت.
پاشا گوتی:
- ڕازیم. بەڵام سێ شتم دەوێ. ئەگەر شتەکانت جێبەجێ کرد. کچەکە بۆ خۆت.
کوڕەکە گوتی:
– شتەکان چین؟
پاشا ئەگوستیلەیەکی دەرهێناو گوتی:
– ئەم ئەنگوستیلەیە فڕێ دەدەمە ناو دەریا. دەمەوێ بۆم لە ناو دەریا دەربێنی.
کوڕەکە گوتی:
- باشە، ڕازیم!
پاشا ئەنگوستیلەی خۆی فڕێ دایە ناو دەریا.
کوڕەکە بە پاشای گوت:
- تا سبەی مۆڵەتم بدە ئەنگوستیلەکەت بۆ دەردێنم.
کوڕەکە چووە لای (گوڵبەهار)و پێی گوت:
- باوکت گوتی: ئەنگوستیلەکەم فڕێ دەدەمە ناو دەریا. ئەگەر تا سبەینێ بۆم دەرنەهێنی، لەسەرت دەدەم.
گوڵبەهار گوتی:
- خەم ناکا. ئەمە هەر هیچ نییە!

ژنەکە دوعایەکی لە دەریا خوێند، ماسییەك هاتە سەر کەنارو ئەنگوستیلەی پاشای فڕێ دایە دەرەوە. کوڕە ئەنگوستیلەکەی بۆ پاشا بردەوە. پاشا کە چاوی بە ئەنگوستیلەکە کەوت، هەر واقی وڕما. ئینجا بە کوڕەکەی گوت:

ـ لە هەر جۆرە خواردنێك کیلۆیەك بێنە. کە خواردنەکانی هێنا، پاشا هەمووی تێکەڵ کردو لە پێشی داناو گوتی:

ـ دەمەوێ تا بەیانی هەموو جۆرە خواردنەکان لەیەك جیا بکەیتەوەو هەر یەکەیان بە جیا دابنێی..

کوڕەکە گوتی:

ـ باشە ڕازیم.

کوڕەکە خۆی گەیاندە کچەکەو گوتی:

ـ حاڵو هەقایەت لەوەدایە، چ بکەم؟!

کچەکە گوتی:

ـ خەمی ئەمەتە؟ ئەمە هەر هیچ نییە!

کچەکە دوعایەکی خوێند، هەموو جنۆکەکانی بانگ کردو پێی گوتن:

ـ بڕۆن ئەو هەموو جۆرە خواردنانە لە یەك جیا بکەنەوە. هەر یەکە بە جیا دابنێن. بۆ بەیانی دیتیان هەموو خۆاردنەکان لە یەك جیا کراونەتەوەو هەر یەکە بە جیا داندراوە. پاشا، کە چاوی پێکەوت، واقی وڕما، گوتی:

ـ خوایە ئەمە چییە؟!

ئینجا بە کوڕەکەی گوت:

ـ دەمەوێ وا بکەی ئەم تەندوورە. لە سبەینێ تا ئێوارێ لە خۆیەوە نان پێوە بداو بیبرژێنێ.

کوڕەکە گوتی:

ـ باشە، ڕازیم.

کوڕەکە چووە لای ژنەکەیو گوتی:

ـ باوکت داوای شتێکی ئاوای لێکردووم.

ژنەکە پێی گوت:

ـ ئەمە هەر هیچ نییە. خەمی ئەمەتە؟

ژنەکە دوعایەکی لە تەندوورەکە خوێند. تەندوورەکە لە سبەینێ تا ئێوارێ هەر نانی پێوەداو برژاندی.
پاشا زانی ئەمە ئیشی کچەکەیەتی، گوتی:
- ئاخ! بەخوا تەور کلکی دارە بۆیە زەفەر بە دار دەبا!. ئینجا بە کوڕەکەی گوت:
- ئەوە کچەکەم دەقەبەر کردی.
پاشا چووە بازاڕ، جیازی بووکی کڕی و دەستی کچەکەی لە ناو دەستی کوڕەکە نا.
کوڕەکە دەوری ساڵێك لای پاشا مایەوە. ئەوسا بە پاشای گوت:
- مامە، دەمەوێ بچمەوە وڵاتی خۆمان.
مامی پێی گوت:
- هەقی خۆتە! کەسی مامی!
ئیتر کەل و پەل و پێویستی سەفەری بۆ کڕین و هەرچی پێیان دەویست بۆی دابین کردن.
کوڕەکە و کچەکە ماڵاواییان کرد و ڕۆیشتن. کاتێ کوڕەکە گەیشتە وڵاتی خۆی دیتی دایکی عەمری خوای کردووە. خانوویەکی کڕی و کۆشکێکی ئاوا کرد. کرێکار سێ مانگ ئیشیان تێدا کرد. کە تەواویان کرد، کوڕەکە سەر لە نوێ ئاهەنگی زەماوەندی سازداو چووە پەردەی بووك. بەم جۆرە بە خۆشی و شادی ژیان.
لای ئێوە بووین و بە سەلامەتی هاتینەوە.

* * *

## ٢١ـ بەلەکزادە

هەبوو نەبوو...

کابرایەك هەبوو، ژنێکی هەبوو. ژنەکەی بە هەموو دەمێ نەخۆش بوو. ڕۆژێ، تەبیبێك بەلای ماڵیانەوە داهات و بانگی ڕاهێشت:

- تەبیب...! تەبیب!

هێنایانە سەر ژنەکە. کە تەبیبەکە چاوی بە ژنەکە کەوت، پێی گوت:

- دەرمانێکت دەدەمێ هەموو بەیانیان بیخۆ.

دەرمانەکە وەکوو دۆشاو وابوو. وەکوو دۆشاو شیرین بوو. ژنەکە دەستی بە خواردنەوەی دەرمانەکە کرد. بەڵام تەبیبەکە پێی گوت لێ مەگەڕێ مێردەکەت ئەم دەرمانە بخواتەوە. هەر پیاوێ ئەم دەرمانە بخواتەوە، منداڵی دەبێ. ژنەکە دەرمانەکەی لە ناو شووشەیەك کردو لە دەلاقەی دانا.

ڕۆژێ، ژنەکە چووە سەردانی ماڵی خوشکی. مێردەکەی هاتەوە، لە برسان جووڕەی لێوە دەهات. نانی هێناو گەڕا شتێك بدۆزێتەوە نانەکەی پێ بخوا.

دەرمانەکەی دی وایزانی دۆشاوە. نانەکەی تێکوشی و خواردی. کە خواردی ژنەکەی بەسەردا هاتەوە، گوتی:

- هەی بەدبەخت! ئەوە تۆ چت کرد؟

کابرا گوتی:

- چم کرد؟ نان و دۆشاوم خوارد.

ژنەکە گوتی:

- دۆشاوی چی؟! ئەمە دۆشاو نییە. ئەمە دەرمانە. تۆ بە خواردنی ئەم دەرمانە مندالّت دەبیّ. کابرا، کە ئەمەی بیست، زەندەقی چوو. ڕۆژیّ هەستی کرد نەرمەی بەلەکی ئاووساوە. هەر گەورە بوو تا بەقەد دومەلّێکی گەورەی لێهات. پێشانی دختۆی دا، دختۆر گوتی:

- دەرمانی ئەمەم نییە. ئەگەر دەری بکەی چاك دەبێتەوە. کابرا گوتی:

- ناتوانم دەری بکەم.

شەش مانگ بەم جۆرە مایەوە. ئەوسا کابرا هات و هاواری لیّ هەستا:

- ئای قاچم! ئای قاچم!

پاش ماوەیەکی کەم، نەرمەی بەلەکی ئاوساوی شەقی بردو مندالّێکی لیّ هاتە دەرەوە. مندالّەکە کچ بوو. ئەوەندە جوان گەورەیی هەر بۆ ئەو خوایە چاکە کە دروستی کردبوو. کچەکە هاتە دەرەوە. کابرا داینا. زۆری بەلاوە سەیر بوو. لە پەڕۆیەکی پێچاو فڕێی دایە سەر گووفەك. لەقلەقێك هات دەنووکی لێداو بردی. لەسەردارخورمایەکی دانا. دارخورماکە لەسەر لێوی ڕووبارێك ڕووابوو. لەقلەقەکە بە دەنووکی پەڕۆکەکەی لێکردەوە دیتی ئەمە کچە، فڕی چوو خواردنی بۆ هێنا. لەقلەقەکە کچەکەی بە خێو کرد. تا تەمەنی بوو بە حەوت سالّی. کچەکە ئەوەندە جوان بوو دەتگوت مانگی چواردەیە. کچەکە بوو بە (دە) سالّی. ڕۆژیّ، مەیتەری سولّتان ئەسپەکانی کوڕی سولّتانی بردە سەر ڕووبار ئاویان بدا. ئەسپەکان لە ئاوەکە نزیك کەوتنەوە، وێنەی کچەکەیان لە ناو ئاوەکەدا دی، ترسان و ڕەوینەوەو ئاویان نەخواردەوە. مەیتەر نزیکەی سەعاتێك لە گەلّیان خەریك بوو. جلەوی ئەسپەکانی ڕادەکێشا و پالّی دەدان بۆ

سەر ئاو، ئەسپەکان دەکشانەوەو ئاویان نەدەخواردەوە. مەیتەر ئەسپەکانی بردەوە تەویلە. کوڕی سوڵتان چاوی پێ کەوت و گوتی:

. بۆچی دواکەوتی؟ ئایا ئەسپەکانت ئاودا؟

مەیتەر گوتی:

. نەخێر.

کوڕی سوڵتان گوتی:

. بۆچی؟

گوتی:

ـ ئاویان نەخواردەوە. نازانم چییان لە ناو ئاودا دیبوو. ترسان و ئاویان نەخواردەوە.

کوڕی سوڵتان گوتی:

. بڕۆ ئەسپەکان بێنە با پێکەوە بچین.

مەیتەر ئەسپەکانی هێناو لەگەڵ کوڕی سوڵتان چوونە سەر ئاوەکە. کچەکە لە سەر دارخورماکە ڕاوەستا بوو، وێنەی لە ناو ئاودا دیار بوو. کوڕی سوڵتان خۆی ئەسپەکانی بردە سەر ئاو بۆ ئەوەی ئاویان بدا. ئەسپەکان ترسان و ڕەوینەوە. کوڕی سوڵتان سەیری ئەم لاو ئەولاو سەرەوەی کرد کچێکی لە سەر داخورماکە بینی ئەوەندە جوان بوو دەتگوت خۆری داگیرساوە. گوتی: لەوانەیە ئەسپەکان لە بەر ئەم کچە ئاو نەخۆنەوە.

کوڕی سوڵتان کە چاوی بە کچەکە کەوت، کەیفی ساز بوو. بەسەر دارخورماکە کەوت. کچەکەی هێنایە خوارێ. عەبای خۆی لێ لوول داو بردییەوە ماڵێ و بە دایکی گوت:

ـ دایکە، ئەم کچەم لەسەر دارخورمایەك دۆزییەوە لە منی مارە کە دەیهێنم. دایکە، کچەکەی لە کوڕەکەی مارە کردو کوڕەکە چووە پەردە. دوو مانگ پێچوو، کوڕە بە دایکی گوت:

. دایکە، باوکم نەساخە لە کۆشکی خۆی کەوتووە. با بچین سەرێکی لێبدەین.

کوڕەکە بە خۆیو بە دایکی چوون گەیشتنە کۆشکی سوڵتان. سوڵتان تازە مردبوو. سوڵتان لە ماڵی ژنی دووەمی بوو. سوڵتان دوو ژنی هەبوو. یەکیان

دایکی کوڕەکە بوو. ئەوی تریش ئەوە بوو کە لەم کۆشکەدا لای بوو. کوڕەکە باوکی شووشت و کفنی کردو ناشتی. کە لیّ بووەوە، گەڕایەوە ماڵیّ خۆی.

بیست ڕۆژ پێچوو، کوڕەکە بە دایکی گوت:

. دەمەویّ بچمە دەشتودەر نەختیّ خەم بە با بدەم. حەفتەیەك لە چۆڵاتی و لە ناو خیوەت دەژیم و دێمەوە. دەمەویّ ئاگاداری ژنەکەم بی.

دایکی گوتی:

. سەر سەرو سەر چاوم کوڕم!

بەڵام ژنە لە بنەوە تا مردن ڕقی لە بووکەکەی دەبووەوە. بە کاری خوای بووکەکەی زۆر بە خەسووی دەچوو. کوڕەکە پێویستی سەفەری هەڵگرت و ڕۆیشت. ژنەکەی پێی گوت:

. بۆچی منیش لەگەڵ خۆت نابەی؟

گوتی:

. چۆن دەبیّ؟ شتی وا نابیّ! من زەلام و برادەرم لەگەڵدان. ناتوانم لەگەڵ خۆمت ببەم! شتی وا نابیّ. هەفتەیەکی تر دێمەوە. ژنەکە گوتی:

. مادەم وایە بڕۆ خوات لەگەڵ.

خزمەتکارەکە کەل و پەلەکانی هەڵگرت و بۆی دەرچوون. ڕۆژیّ، دایکی کوڕەکە بە بووکەکەی گوت:

. هەستە تەندوور جۆش دە.

ژنەکە چوو داری هێنا و تەندووری جۆش داو هەویری هێنا. یەکەم ئەنگوتکی پان کردەوە و بە تەندووری وەدا. دووەم نانی برژاند و بۆ نانی سێیەم خەسووی هات پاڵێکی پێوەنا و فڕێی دایە ناو تەندوورەکە. کچەکە سووتا و بوو بە قەرەبرووت. ڕۆژی دووەم، خەسوو خۆڵەمێشی کچەکەی لە ناو تەندوور دەرهێنا و بردی فڕێی دایە ناو باخ. بە کاری خوای ئەم خۆڵەمێشە بوو بە پەین و داریاسێکی لیّ ڕوا.

لەولاوەیش، خەسوو، کاتیّ کچەکەی فڕیّ دایە ناو تەندوورو سوتاندی، جلەکانی کچەکەی لەبەرکردو چووە حەمام. خەسوو زۆر بە بووکەکەی دەچوو.

خەسوو، بانگی موو هەڵگری کرد. مووهەڵگر هات مووی دەمو چاوی هەڵگرتو پوودرەی لێدا. شکڵی وەکوو کچەکە لێهات دەتگوت کچێکی چواردە ساڵییە. دوای چەند ڕۆژێ، کوڕەکە هاتەوە. کە چووە ژوورەوە، دایکی دەستی بە گریان کرد. کوڕەکە، کە چاوی پێکەوت، وایزانی ئەمە ژنەکەی خۆیەتی پێی گوت:

- چ بووە؟ بۆچی دەگری؟

گوتی:

- دایکت مرد.

کوڕەکە گوتی:

- چۆن؟ بە ڕاست؟

گوتی:

- ئەریٚ بە خوا.

کوڕەکە نەیزانی ئەمە دایکییەتی. تێر بۆ دایکی گریا.(دە)ڕۆژ پێچوو، کوڕەکە زۆر پەستو بێتاقەت بوو. دوای مانگێك، داریاسەکە ڕسکاو بوو بە درەختێکی تەواو. کوڕی سوڵتان چووە ناو باخ بۆ ئەوەی دەستنوێژ بشوا. داریاسەکەی دی گەش و تەڕ بوو. گوتی: لای ئەم داریاسە دەستنوێژ هەڵدەگرم. لە کاتی دەستنوێژ شووشتندو لوولەی مەسینەکەی بە دارەکە کەوت. دارەکە، کە لوولەی مەسینەی پێکەوت، بە دەنگ هاتو گوتی:

**- ئۆی! من یاسم، من یاسم. توخوا لە یاس مەدەن! من لە باوکم بووم. لەقلەق بە خێوی کردم. کوڕی سوڵتان عەبای خۆی لێ لوول دام و بردمییەوە. لە خۆی مارە کردمو گواستمیەوە. دایکی کوڕەکە منی کوشتو خۆی کردە ژنی. عەجایبە، من ڕازیم....**

کوڕی سوڵتان باش گوێی لێ نەبوو، ڕۆیشت. ڕۆژی دووەم، دووبارە هات لە نزیك داریاسەکە دستنوێژی شووشت. مەسینەکەی بە دارەکە کەوت. دارەکە بە دەنگ هاتو گوتی:

**– ئۆی! من یاسم، من یاسم. توخوا لە یاس مەدەن! من لە باوکم بووم. لەقلەق، بە خێوی کردم. کوڕی سوڵتان عەبای خۆی لێ لوولدام و بردمییەوە. لە خۆی**

مارە کردمو گواستمیەوە. دایکی کوڕەکە منی کوشتو خۆی کردە ژنی. عەجایبە، من ڕازیم...

کە وای گوت، ئە م جارە کوڕەکە باش گوێی لێ بوو، گوتی:

. بەخوا دەڵێم مەسینەیەکی تری لێبدەم! مەسینەیەکی تری لە دارەکە دا. دارەکە عەینی قسەی بۆ کرد. کوڕەکە گوتی:

. عەجایب!

ئینجا گوتی:

. بەخوا ئەم جارەش مەسینەیەکی تری لێدەدەم.

دیسان مەسینەکەی لە دارەکەدا. دارەکە عەینی قسەی کرد. کوڕەکە پێی گوت:

. وەرە دەرەوە.

دارەکە پێی گوت:

. بڕۆ.

کوڕەکە گوتی:

. خۆم دەکوژم.

دارياسەکە خۆی ڕاوشاندو بوو بە ئافرەت.

کوڕەکە دیتی ئەمە ژنی خۆیەتی. پەنجەی خۆی گەستو گوتی: ئاخ! کەواتە ئەوەکەی تر دایکمە. ژنەکەی بردەوە ماڵێ. دەستی دایە شمشێرو دایکی دایە بەر شمشێرانو کوشتی. ژنەکەی لە ژووری خۆی داناو بەو پەڕی شادو خۆشی ژیان.

لای ئێوە بووینو هاتینەوە.

* * *

## ٢٢ـ كوڕی وەزیرو دۆستەکەی

هەبوو نەبوو...

وەزیرێك هـەبوو، كوڕێكی هـەبوو. كوڕەكە برادەری خوێڕی و گەنـدەڵی هـەبوو. هەر خەریكی بەزمو ڕابواردن بوو. ئەو كوڕە پارەی بە قـەرز دەدانیْ. هـەموو بە قەرزی كوڕەكە دەوڵەمەند بوون و دوكانیان لـە بازاڕەكانی بەغدا كردەوە. وەكوو بازاڕی هەراجخانە و ئەوانە...

ڕۆژێ، باوكی كوڕەكە نـەخۆش كـەوت و ئـەمری هـەقی بـەجێ گەیانـد. كـە بـاوكی مرد، كوڕەكـە دەسـتی لەگـەڵ برادەرەكـانی تێكـەڵ كـرد و دەسـتی بـە تەخشـان و پەخشان كردنی پارەو میراتی باوكی كرد. دایكی لـە خەفـەتی ئـەوەی كوڕەكـەی ئـەم هـەموو پارەیـە بـە هـەدەر دەدا وەزگـی داو مـرد. بیسـت ڕۆژ دوای مردنـی دایكی، كوڕەكە كەوتە سەر ساجی عـەلی و عەشـتەبای نـەما. برادەرەكـانی هـەموو لێی تەكانەوە. هەڵسان و دانیشتنیان لە گەڵدا نـەما. كوڕەكـە بـە جـۆری قـەلۆش و مایەپووچ دەرچـوو یـەك قڕۆش، یـان یـەك فلسـی نـەما. چـووە لای برادەرەكـانی داوای چەند قڕۆشێكی لێكردن. گوتیان:

. برِۆ، بابە، برِۆ! پارەمان لە کوێ بوو بتدەینێ!!
کورِەکە پێداهات کەل‌و پەلی ماڵەوەی فرۆشت. مانگێك بە پارەکەی ژیا. کە پارەکەی تەواو بوو، ئەم جارە خانووەکەی فرۆشت. ماوەیەکی تر بە پارەی خانووەکە ژیا. تا ئەویشی هەموو خەرج کرد. ئەو رِۆژەی هیچی نەما بۆ شەوەکەی چوو لە قاوەخانە پاڵی دایەوە. بەیانی، پارەی جگەرەو فراوینی نەبوو. لە داخان چووە سەر گۆرِی دایك‌و باوکی لە دەرەوەی شار. لەوێ پاڵی دایەوەو خەوی لێ کەوت. خۆی کورِە وەزیرێکی قۆزو دەم وچاو سوورو سپی بوو. کە رِۆژی بەسەردا هەڵات، رِەنگی وەکوو رِەنگی سێوی لێهات. نووستبوو، خانمێك بە خۆو بە قەرەواشەوە بەوێدا هات. خانم چاوی بە کورِەکە کەوت، ئەشقی بوو. بە قەرەواشەکەی گوت:
. برِۆ ئەم گەنجە بە خەبەر بێنە.
کورِەکە، کە بە خەبەر هات. خانم پێی گوت:
. ئەوە بۆچی لێرە نووستووی؟
کورِەکە گوتی:
. رِۆژگار پشتی تێکردووم. بەدبەخت‌و بێچارە بوویم.
خانم پێی گوت:
. بێگومان برسیتەو پارەشت نییە!
کورِەکە گوتی:
ئەرێ بەخوا!
خانم گوتی:
. هەستە بەگەڵم کەوە!
کورِەکە لە گەڵ خانم چوو. خانم بردییەوە ماڵی خۆی. جێی بۆ رِاخست. دەستە بەرگێکی لەبەر کرد. فراوینی بۆ هێنا و دەرخواردی دا. ئینجا پێی گوت:
. هەستە با گەمەو سوحبەت بکەین.
دەستیان بە گەمەو سوحبەت کرد. کورِەکە (دە)جار بە ژنەکە شاد بوو. ژنەکە هەندێ پارەی دایێ‌و پێی گوت:
. ئەمرِۆ برِۆ، بەیانی وەرەوە!

ئەم خانمە ژنی یەکێ لە برادەرەکانی کوڕەکە بوو. ئەوانەی پارەو ماڵیان خواردبوو. بەڵام کوڕەکە نەیدەزانی. کوڕەکە چووە بازاڕ تووشی مێردی خانمەکە هات. سەلامی لێکرد. کابرا لێی وردبووەوە جلو بەرگوزەبوونی خۆی لە بەردا دی. سەری سوڕماو گوتی:

- فلان، ئەم جلوبەرگەت لە کوێ بوو؟ ئەم پارەیەت لە کوێ بوو؟

کوڕەکە گوتی:

- برام هەر لێگەڕێ! خوا بۆی ناردووم! با بۆت باس بکەم: ( لەبەر ئەوەی نانی ئیلەڵڵام نەبوو، لە خەمانو لە بێ پارەییان چوومە گۆڕستانو لە سەر گۆڕی دایبابم خەوتم. نووستبووم، خانمێك هات ئەوهاو ئەوها بوو. منی بردە ماڵی خۆیان پارەو دەستە بەرگێکی دامیو نزیکەی(دە) جاریش پێی شاد بووم.

برادەرەکە گوتی:

- ئەتۆ بە ڕاستیتە؟!

برادەرەکە زانی ئەو خانمەی باسی دەکا، ژنی خۆیەتی! قینی جۆشاو بە کوڕەکەی گوت:

- باشە، پێی نەگوتی سبەینێ بچیتەوە لای؟

کوڕەکە گوتی:

- با، گوتی:

- بەیانی نیوەڕۆ وەرەوە.

ڕۆژی پاشی، مێردی خانم چووە دەرەوە. زۆری پێ نەچوو دۆستەکەی هات. فراوینی خواردو لێ بوونەوە، ئینجا کوڕەکە هەستاو بەربووە گیانی خانم: جارێك، دوو جار... لەو کاتەدا مێردی خانم لە دەرگای دا. خانم کوڕەی دۆستی لە ناو سندووق شاردەوە. مێردی خانم چووە ژوورەوەوە، چاوی لە کوڕەکە گێڕا، نەیدۆزیەوە. دووبارە چووە دەرەوە. کە ئەو چووە دەرەوە، خانم دۆستەکەی لەناو سندووقەکە دەرهێناو تێر لەگەڵ یەك جووت بوون. خانم دیسان هەندێ پارەو دەستە بەرگێکی تازەی دایە کوڕەکە. کوڕەکە چووە دەرەوە، چووە لای برادەرەکەی (واتە: مێردی خانم). کابرا زەبوونو دەستە بەرگێکی تری خۆی لەبەر کوڕەکە بینی، عاجباتی ماو گوتی:

. ئەمڕۆیش چوویتە لای خانمەکە؟

کوڕەکە گوتی:

. ئا. چووم. دوای ئەوەی فراوینمان خوارد، دەستمان بە بەزمی خۆمان کرد. لەو کاتەدا، مێردەکەی هاتەوە، لە دەرگای دا. خانم لەناو سندووقی نام.

برادەرەکەی پێی گوت:

. تۆی لەناو سندووق شاردەوە؟

کوڕەکە گوتی:

. ئا.

کابرا گوتی:

. پێینەگوتی بەیانیش بچیتەوە؟

کوڕەکە گوتی:

. با.

کابرا گوتی:

. سەعات چەند دەچیتە لای؟

کوڕەکە گوتی:

. گوتی: نیوەڕۆ وەرەوە!

مێردی خانم وەخت بوو لەرکان شەق ببا. ڕۆژی پاشی، نیوەڕۆ، کوڕەکە چووە لای خانم. خانم خواردنی بۆ ئامادە کرد. کوڕەکە فراوینی خواردو کە لێ بووەوە هەستا بە خزمەتی خانم گەیشت. لەو سەرو بە ندەدا، مێردی خانم هاتەوەو لە دەرگای دا. خانم دۆستەکەی لەناو حەسیرێك لوول داو لە قوژبنێك بە دیواری هەڵپەسارد. مێردەکەی بە هەشتاوی خۆی بە ژووورێدا کرد. دوو دەبانچەی بە دەستەوە بوو. بە هەردوو دەبانچە تەقەی لە سندووقەکە کرد. ژنەکە پێی گوت:

. ئەیەڕۆ، ئەوە چیتە پیاویژگە؟! بۆچی تەقە لەو سندووقە دەکەی، بیسمیللا!! شێت بووی، چییە؟ دەڵێی ئەقڵت لە سەر نەماوە!

کابرا سندووقی کردەوە، هیچی تێدا نەبوو. کە کەسی نەدیتەوە، بە تووڕەیی چووە دەرەوە. خانم دۆستەکەی لەناو حەسیر دەرهێنا. ئیشی خۆیان تەواو کرد. خانم هەندێ پارەو دەستە بەرگێکی تری دایێ و پێی گوت:

. بەیانیش وەرەوە!

کوڕەکە ڕۆیشت. چووە لای برادەرەکەی. برادەرەکەی دیتی کوڕەکە دیسان دەستە بەرگێکی تری ئەمی لەبەرە. واقی وڕماو گوتی:

. ئەمرۆیش چوویتە لای خانمەکە؟

کوڕەکە گوتی:

. ئا. ئەریٚ بەخوا، ئەمڕۆش بە خزمەتی گەیشتم.

ڕۆژی سێیەم، دیسان لە کاتی گەمەو سوحبەتی خانمو کوڕەکەدا، مێردی خانم بە تەنگاوی هاتەوە. ئەم جارە خانم کوڕەی دۆستی لە ناو حەوزی ئاوی حەوشە شاردەوە. کوڕەکە تەنیا سەری بە دەرەوە بوو. ژنەکە کودوویەکی دەسەر سەری داهێنا. دوو کونی بۆ دیتن‌و کونێکی بۆ زاری تێکردو پێی گوت:

. کە پیاوەکەم هاتە ژورەوە، یارییەکی لەگەڵ دەکەم. ئەم کودووەی سەر سەری تۆ دەکەینە نیشانەو ناوکە میوەی تێدەگرین. کە ئەو تێی گرت، تۆ سەرت لابەرەو لیٚ مەگەڕیٚ نیشانەکەی بپێکیٚو کە من تێم گرت، خۆت مەجوولێنە بۆ ئەوەی نیشانەکە بپێکم.

ئەوسا خانم هەستا دەرگای لە مێردەکەی کردەوە. کابرا هاتە ژورەوە. چەقۆیەکی گەورەی بە دەستەوە بوو. پەلاماری حەسیری داو بە چەقۆ وەریگەڕاییٚ و لەت وپەتی کرد. خانم گوتی:

. ئەیەڕۆ، پسمام، بۆ وا دەکەی؟

کابرا بە تووڕەیی گوتی:

. ویستم ئەو چەقۆیە تاقی بکەمەوە.

ئینجا هەموو ماڵەکە بە دوای کوڕەکەدا گەڕا، نەیدۆزییەوە. خانمیش تەماشای دەکرد. چووە لای کودووەکەی ناو حەوزی حەوشەو گوتی:

. حورمیٚ. ئەمە چییە؟

خانم گوتی:

. هیچ، کودوویەکە لێرەم داناوە. ئەوە تۆ چت بە سەر هاتووە؟ هەرجارەی دێیتە ژورەوە، دەڵێی لە سەر ئاگری! دوێنیٚ سندووقت دابەر دەبانچان‌و ئەمڕۆیش حەسیرت بە چەقۆ ئەنجن ئەنجن کرد. ئەوە تۆ گومانی چی لە من دەکەی؟ مادەم

وای لێهات، ئەم کودووەم لێرە داناوە، وەرە ناوکە میوەی تێ بگرین. ئەگەر تۆ لێت داو من لێم نەدا، تەنیا بە جلی بەرم لەم ماڵە دەرم کە. ئەگەر من لێم داو تۆ لێت نەدا، من تۆ دەر دەکەمو هیچت نادەمێ تەنیا جلی بەرت نەبێ. کابرا گوتی:

- باشە، ڕازیم.

کابرا دەستی دایە ناوکە میوەیەكو هاوێشتی، کە هاوێشتی، دۆستی ژنەکە کودووەکەی لەبەر لاداو کابرا نەیپێکا. خانم پێی گوت:

- هەستە هەی گەواد! بڕۆ دەرەوە!

مێردەکەی دەرکرد. کابرا بە غەمباری چووە دوکانەکەی. خانم چوو دۆستەکەی لە ناو حەوزی ئاو دەرهێناو دەستەبەرگێکی تازەی کردەبەر. کوڕەکە ڕۆیشت. خانم داوای لێکرد بەیانیش بێتەوە. کوڕەکە ڕازی بوو. کوڕەکە یەکسەر چووە لای برادەرەکەی. برادەرەکەی پێی گوت:

- ها، ئەمڕۆیش چوویتە لای؟

کوڕەکە گوتی:

- ئا. کە خەریکی ئیشی خۆمان بووین، مێردەکەی هاتەوە. خانم منی لە ناو حەوزی ئاو شاردەوە. کودوویەکی لەسەر سەرم داناو خانم لەگەڵ مێردەکەی گرەویان کرد. کودووەکە بکەن بە نیشانەو هەر کەسێ کودووەکەی پێکا، ماڵەکە بە هەموو ناو ماڵەوە بۆ ئەو بێ. کە مێردەکەی ناوکە میوەی لە کودووەکە گرت، من خۆم لارکردەوە لێ نەگەڕام کودووەکە بپێکێ. بەڵام کە خانم ناوکە میوەی لە کودووەکە گرت، خۆم ڕاست ڕاگرتو خانم کردووەکەی لە سەر سەری من پێکا. خانم کابرای دەرکردو کابرا بە خەمو خەفەت ماڵی بەجێ هێشتو ڕۆیشت.

مێردی خانم چووە ماڵە باوانی خانمو گوتی: حاڵو مەسەلەی خانم لەوەدایە. پێیان گوت:

- با بۆ بەیانی بێ.

بەیانی، ماڵە باوانی خانم خواردنیان لێناو کوڕەکەیان داوەت کرد. کە داوەتیان کرد، دایکی خانم بانگی خانمی کردو هۆی ئەو داوەتەی بۆ ڕوون کردەوە.

خانم چووە ماڵە باوانی و پشیلەکەی لەگەڵ خۆی برد. کاتێ دۆستەکەی هات و دانیشت، خانم پشیلەکەی بەرەڵلا کردو هەڵیدا بۆ لای دۆستەکەی. کوڕەکە پشیلەکەی ناسییەوەو زانی ئەوە ماڵە باوانی خانمەو ئەمە ئیشی مێردی خانمە. ڕوویان تێکردو گوتیان:

ـ ئێی! دە هەقایەتی دۆستی خۆتمان بۆ بگێڕەوە کە ئەشقت بووەو هەموو ڕۆژێ دەچی بە خزمەتی دەگەی.

کوڕەکە گوتی:

ـ باشە. هەقایەتەکەتان لە سەرەتاوە تا کۆتایی بۆ دەگێڕمەوە:

(ڕۆژێ، مایە پووچ دەرچووم. عەشتەبای خوام نەما. چوومە گۆڕستان و لە سەر گۆڕی دایبابم خەوتم. نەختێ، خەوتم خانمێکی زۆر جوان هات پێی گوتم: ها، ئەوە بۆچی لێرە نووستووی؟ دیارە برسیتەو پارەت نییە!. گوتم: ئەرێ بە خوا. خانمەکە منی بردەوە ماڵی خۆیان. داینام و خواردنی بۆ هێنام. کە نانم خوارد، هەستام ئیشی خۆم لەگەڵ کردو ڕۆیشتم. پێی گوتم: بەیانی وەرەوە. ڕۆژی دووەم، چوومەوە لای فراوینم خواردو ئیشی خۆمم لە گەڵ کرد. مێردەکەی بە سەردا هاتەوە. خانم منی لە ناو سندووق شاردەوە. مێردەکەی هاتە ژوورەوە. گەڕا کەسی نەدۆزییەوەو ڕۆیشت. کە ئەو ڕۆیشت، خانم لە ناو سندووقەکە دەری هێنام. دەستە بەرگێکی نوێی لە بەرکردم و پێی گوتم بەیانی بچمەوە لای. ڕۆژی پاشی، بۆ نیوەڕۆ، چوومەوە لای و فراوینم خواردو لە خواردن بوومەوە. بە خانمەوە خەریك بووم. ئیشی خۆمم لە گەڵ تەواو نەکردبوو، مێردەکەی هاتەوە. خانم ئەم جارە لەناو حەسیر شاردمییەوە. کە مێردەکەی هاتە ژوورەوە، دەتگوت چاوی سوور بووە. هەر ڕایکرد بۆ لای سندووقەکەو دایە بەر دەبانچان و تێکی شکاند. کردییەوە کەسی تێدا نەبوو. ڕۆژی سێیەم، دیسان چوومەوە لای خانم و دەستم پێکرد بە خزمەتی بگەم مێردەکەی هاتەوە. ئەم جارە خانم لە ناو حەوزی ئاو شاردمییەوەو کودوویەکی لەسەر سەرم دانا. مێردەکەی هاتە ژوورەوە، گەڕا کەسی نەدۆزییەوە. هاتە لای کودووەکەو بە ژنەکەی گوت: ئەمە چییە؟ ژنەکە گوتی: هەی گەواد، تۆ هەموو ڕۆژێ دێیتەوە ئەم ماڵە دەپشکنی ئایا هیچ بەدگومانیت لە من دیوە. وەرە گرەو بکەین. ناوکە

میوە بگرینە ئەم کودووە. ئەگەر تۆ لێتداو من لێم نەدا. لەم ماڵە دەرم بکەو چی لەم ماڵە هەیە هەمووی بۆ خۆت. ئەگەر من لێم داو تۆ لێت نەدا، لەم ماڵە دەرت دەکەم. کاتێ کابرا ناوکە میوەی لە کودووەکە گرت، لە پڕ لە خەو ڕاپەڕیم دیتم لەناو گۆڕستانەکەمو ئەمە هەمووی خەونە دەیبینم!)

باوكو براکانی خانم گوتیان:

. یانی ئەمە هەمووی خەون بوو؟

کوڕەکە گوتی:

. ئەی چی بوو؟ ئەوەی دیم هەمووی خەون بوو!

بە مێردی خانمیان گوت:

. هەی گەواد! دەتەوێ ناومان بزڕێنیو ناموسمان ببەی؟

لێی هەستانەوە ئەنجن بە ئەنجنیان کرد. بە کوڕەکەیان گوت:

. تۆ ئەم ژنەت دەوێ؟

گوتی:

بەڵێ.

خانم گوتی:

. منیش ئەم کوڕەم دەوێ.

ژنەکەیان لە کوڕەکە مارە کردو ژنو مێرد بە شادیو خۆشی ژیان. کوڕەکە کەلو پەلی کڕیو دەستی بە مامەڵە کرد. وەکوو جاران کە باوکێکی وەزیری دەوڵەمەندی هەبوو ئەوها دەوڵەمەند بووەوە. کۆشکێکی بۆ خۆی دروست کردو لە گەڵ ژنەکەیدا بە شادیو بەختەوەری ژیان.

لای ئێوە بووینو هاتینەوە.

* * *

## ٢٣ـ كچەی قوفڵدراو

هەبوو نەبوو...

سوڵتانێك هەبوو، سێ کوڕی هەبوو: گەورەو ناوەنجی و بچووك، ڕۆژێ، کوڕی گەورە مۆڵەتی لە باوکی وەرگرت بۆ ئەوەی بچێتە ڕاوو شکار، سوڵتان مۆڵەتی دا. کوڕەکە ڕۆیشت. لەسەر ئەسپەکەیەوە مامزێکی دی شاخێکی زێڕو شاخێکی زیو بوو. ڕاوی نا. لە مامزەکە غارو لەو غار تا مامزەکە گەیشتە خانوویەك. مامزەکە چووە ناو خانووەکە. کە مامزەکە چووە ژوورەوە، کوڕەکە لە سواری ئەسپەکەی دابەزی. ئەسپەکەی لەبەر دەرگای خانووەکە بەستەوەو بە دوای مامزەکەدا چووە ژوورەوە. دیتی خانوو باخێکی خۆشە! قەرەواشێك لەوێ بوو. کە قەرەواشەکە چاوی بە کوڕەکە کەوت، هاتە لایەوەو جگەرەیەکی پێشکەش کردو پێی گوت:

. ئەمر کە چت دەوێ!

کوڕەکە گوتی:

. ئەو مامزەم دەوێ کە تازە هاتە ئێرە!

قەرەواشەکە گوتی:

. ئەمە مامز نییە، ئەمە کچە.

کوڕەکە گوتی:

. من ئەمەم دەوێ.

قەرەواشەکە چووە سەلال بۆ لای کچەکەو خەبەری دایێو هاتەوە گوتی:

. خانم دەڵێ: با بێتە سەلال بۆ لام.

کوڕەکە چووە سەلال بۆ لای کچەکە. کچەکە پێی گوت:

. وەرە یاری شەترەنج بکەین، ئەگەر تۆ بردتەوە، شووت پێدەکەم، ئەگەر منیش بردمەوە، دیسان هەر شووت پێ دەکەم.

کوڕەکە لە دڵی خۆیدا گوتی: باشە، ئەوە بوو!! چ من لەو ببەمەوەو چ ئەو لە من بباتەوە، هەر بۆ منە! کچەکە سەرپۆشی فڕێ دا، قژی دەرکەوت. کوڕەکە کاتێ چاوی بە جوانیی کچەکە کەوت، ئاگای لە یاری نەما. کچەکە لێی بردەوەو بانگی کرد:

. میرغەزەب، وەرە لە سەری ئەم کوڕە بدە.

کوڕەکە هەر هەندەی زانی شیری گەیشتە سەر ملی. سەریان بڕیو سەرەکەیان هەڵواسی.

سوڵتان بە دوای کوڕەکەی گەڕا نەیدۆزیەوە. کوڕەکەی هەر نەهاتەوە، برای ناوەنجی بە دوای برایدا چوو. ئەویش مامزەکەی دی. کە دیتی ڕاوی نا. کوڕەکە ڕاوی دەناو مامزەکە لە پێشی هەڵدەهات تا گەیشتنە خانووەکەو مامزەکە چووە ژوورەوە. کوڕەکە تا بەردەرگای خانووەکە غاری دا. لەوێ لە ئەسپەکەی دابەزی. ئەسپەکەی بەستەوەو چووە ژوورەوە دیتی ئەمە کۆشكو سەراو باخێکی خۆشە. قەرەواشێك بە دەمییەوە هاتو پێی گوت:

. بە خێر بێی! ئەمر کە، چت دەوێ؟

ئینجا جگەرەیەکی پێشکەش کرد. کوڕەکە گوتی:

ئەو مامزەم دەوێ کە تازە هاتە ئێرە.

قەرەواشەکە پێی گوت:

. ئەمە مامز نییە! ئەمە کچە.

کوڕەکە گوتی:

. من ئەمەم دەوێ.

کچەکە لە سەرەوە هاواری کرد:

- لێگەڕێ بێتە سەلال.
کوڕەکە سەرکەوتە سەلال بۆ ژووری کچەکەو کە چاوی بە کچەکە کەوت، لەبەر جوانییەکەی لە هۆش خۆی چوو.
کچەکە پێی گوت:
- وەرە یاری شەترەنج بکەین. ئەگەر تۆ بردتەوە، شووت پێدەکەم‌و ئەگەر منیش بردمەوە، دیسان هەر شووت پێدەکەم.
کوڕەکە گوتی:
- باشە.
ئینجا کچەکە پەچەی لاداو قژی دەرکەوت. دەستیان بە یاری کرد. کوڕەکە هیچ هۆشی لای یارییەکە نەبوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: گوێم لێ نییە چ من لەو ببەمەوە چ ئەو لە من بباتەوە هەر مێردم پێدەکا. زۆر زەینی نەدایە یارییەکە.
کچەکە لێی بردەوەو بانگی کرد:
- میر غەزەب! وەرە لە سەری ئەم کوڕە بدە.
کوڕە هەر هەندەی زانی شیری گەیشتە سەر مل. سەریان بڕی‌و سەرەکەیان هەڵواسی.
دوای چەند ڕۆژێ، سوڵتان گوتی:
- ئەم دوو کوڕە چوونە کوێ؟و چییان لێهات؟ خوایە چ بکەم؟!
کوڕە بچووکەکە سواری ئەسپ بوو و بوێی دەرچوو. گەیشتە ناو جەرگەی بیابان. مامزەکەی دی. کە مامزەکەی دی پەنجەی خۆی گەست‌و گوتی:
- ئاخ! هەبێ‌و نەبێ ئەمە براکانی کوشتووم. با بۆم ڕاوەستێ. کوڕەکە بەری دایە دوای مامزەکە. مامزەکە ڕایکردو هەڵات. لە مامزەکە غار لە پێشەوەو لە کوڕەکە غار لە دوایەوە. تا مامزەکە گەیشتە خانووی گۆڕین‌و چووە ژوورەوە. کوڕەکە بە دوایدا چووە ژوورەوە. کۆشکێکی بە تەنتەنە بوو. قەرەواشەکە بە دەمییەوە هات‌و جگەرەیەکی پێشکەش کردو کوڕەکە جگەرەیەکی کێشاو پشوویەکی دا.
قەرەواشەکە پێی گوت:
- فەرموو! ئەمر کە، چت دەوێ؟!
کوڕەکە گوتی:

- ئەو مامزەم دەوێ کە تازە هات ئێرە.
قەرەواشەکە گوتی:
- ئەمە مامز نییە. ئەمە کچە!
کوڕەکە گوتی:
- من ئەمەم دەوێ.
کچەکە گوێی لێبوو. بانگی قەرەواشەکەی کرد گوتی:
- لێیگەرێ با بێتە سەلال.
کاتێ کوڕەکە ئەمەی گوێ لێبوو، بە قەرەواشەکەی گوت:
- بڕۆ پێی بڵێ: ئایا میوان بۆ خانە خوێ دەچیتە سەلال، یان خانەخوێ بۆ میوان دادەبەزێتە خوارێ؟!
قەرەواشەکە چوو قسەکەی بە کچەکە گوت.
کچەکە گوتی:
- خانەخوێ بۆ میوان دادەبەزێتە خوارێ.
کوڕەکە گوتی:
- کەواتە با ئەو بێتە خوارێ!
کچەکە هاتە خوارەوە، گوتی:
- فەرموو، چت دەوێ؟!
کوڕەکە گوتی:
- تۆم دەوێ.
کچەکە گوتی:
- وەرە یاری شەترەنج بکەین. ئەگەر تۆ بردتەوە، شووت پێدەکەم و ئەگەر منیش بردمەوە، دیسان هەر شووت پێدەکەم.
کوڕەکە زانی دەیەوێ تەفرەی بدا. یاری لەگەڵ کرد بەلام هیچ مێشکی خۆی بە کچەکەو بە جوانیی کچەکەوە خەریك نەکرد. دەستی یەکەمی لێ بردەوە. کە کچەکە دیتی کوڕەکە دەستی یەکەمی لێبردەوە، پەچەی لاداو قژی خۆی دەرخست. کوڕەکە هەر گوێشی پێنەدا. دەستی دووەمیشی لێبردەوە. کچەکە

خـۆی لـە پـێش ڕووت و قـووت کـردەوە. لەگـەڵ ئەمەشـدا کوڕەکـە دەسـتی سێیەمیشی لێبردەوە. کچەکە بانگی کرد:
میرغەزەب، وەرە لە سەری ئەم کوڕە بدە.
میرغـەزەب هـات بـۆ ئـەوەی شـیری لـە ملـی بـدا. کوڕەکـە شـیرەکەی لـە دەسـت دەرهێناو سەری میرغەزەبی بڕی.
کچەکە که ئەمەی بینی، گوتی:
ـ کەوتمە سەر بەختی خواو بەختی تۆ! من لە مرۆوە ژنی تۆم.
کوڕەکە هەستا جلی لەبەر کچەکە داکەند بۆ ئەوەی ئیشی خۆی لەگەڵ بکا دیتی عەورەتی بە حەفت قوفل کلیل دراوە! پێی گوت:
ـ کوا کلیلەکان؟!
کچەکە گوتی:
ـ لای برامن.
کوڕەکە گوتی:
ـ برات لە کوێیە؟
کچەکە گوتی:
ـ برام لە میسرە. بڕۆ لای و کلیلەکانی لە کن بێنە.
کوڕەکـە دەرگـای لەسـەر کچـەکە قوفـڵ داو سـواری ئەسـپ بـوو و ڕۆیشـت. لـە هەورازان هەڵکشاو لە نشێوان داکشا، نزیکەی بیست ڕۆژ ڕۆیشت گەیشتە ناو میسر. لایدایە ماڵی پیرەژنێك. هەندێ زێڕی دایە پیرەژن و لـە جـێ و ڕێـی برای کچەکەی پرسی.
پیرەژن پێی نیشان دا.
کابرا کۆشکێکی لە دەم ڕووبار هەبوو. هەموو ڕۆژێ کورسییەکی لەبەر دەرگای ماڵەوە دادەناو دادەنیشت سەیری ڕووباری دەکرد.
کوڕەکە (دە) لیرەی دایە پیرەژن و پێی گوت:
ـ پیرەژن، بڕۆ دەستە جلێکی ژنانم بۆ بکڕە.
پـیرەژن پارەکـەی وەرگـرت و چـوو قوماشـی کـڕی و جلەکـەی دووری. کـوڕی سوڵتان جلەکەی کردە بەر. ئەوەندە جوان بوو دەتگوت مانگە. ڕیش و سمێڵی

خـۆی تاشـی وەکـوو ژنـانی لێهـات. کـە جلـی ژنـانی کـردە بـەر دەسـتی دایـە گۆزەیەك‌و چوو ئاو لە ڕووبار بێنێ. کابرا دیتی ئەم کچە گۆزە پڕ ئاو دەکاو زۆر ناڕوا، ئاوەکە دەڕێژێ‌و دووبارە دەگەڕێتەوە.

کابرا کۆیلەکەی خۆی نارد‌و گوتی:

- بە دوو ئەم کچەدا بڕۆ، بزانە دەچێتە کوێ؟

کابرا لە دڵی خۆیدا گوتی:

- بە ڕاستی کچێکی جوانە!

کـوڕی سـوڵتان زانـی کـابرا یـەکێکی بـە دوودا نـارد. چـووەوە مـاڵێ. کۆیلەکـە ماڵەکەی پێ زانی‌و بە نیشانی کرد. کوڕی سوڵتان بە پیرەژنی گوت:

- داپیرە! خاوەنی ئەم کۆشکە دەنێریتـە لات، دەڵـێ: دەمـەوێ ئـەو کچـەی خۆتـانم بدەنێ. تـۆ ڕازی بـە. هـا، ئـەوە سـەد لیرەت بدەمێ. لـە شـەوی پـەردەدا بۆ خـۆت ڕاکەو خۆت دەربازکە.

پیرەژنەکە ڕازی بوو!

ڕۆژی پاشـی، بـۆ داخـوازی کچـەکە هاتنـە لای پـیرەژن. پـیرەژن ڕازی بـوو. دوای هەفتەیـەك بـەربوودی هـاتن‌و گواسـتییانەوە. کـابرا چـوو لـە گـەڵیا بخـەوێ. پـێی گوت:

- هەستە جێگا ڕاخە.

(بووك) گوتی:

- پەلەی چیتە؟ وەرە با جارێ بچین تۆزێك پیاسە بکەین.

کابرا گوتی:

- باشە با بچین.

لە ژووری سەرەوە بوون. هاتنە خوارەوە. کچەکە زۆر پرسیاری لە کابرا کرد. تا گەیشتنە لای ئاشێك. (بووك) پرسی:

- ئەمە چییە؟

کابرا گوتی:

- ئەمە ئاشە!

(بووك) پاڵێکی بە کابراوە ناو فڕێی دایە بنی ئاشەکە.

کابرا بەربووەوەو گوتی:

. ئاخ! ئەوە چ بوو؟!

(بووك) گوتی:

. ڕاوەستە جارێ چت دیوە؟ من کچ نیم، کوڕم! ئەگەر کلیلی قوفلەکانی خوشکتم نەدەیتێ، هەر ئێستا دەتکوژم.

کابرا گوتی:

. کلیلەکان لە ژوورەوە، لە ناو دوۆلابدان. بڕۆ بیانبە!

کوڕەکە چووە سەرەوە بۆ ژوورەکە. کلیلەکانی هێناو ڕایکرد.

ماڵی کابرا بەیانی چاوەڕێیان کرد زاوا هەر نەهاتە دەرەوە. چوونە ژوورەوە دیتیان کەسی تێدا نییە. بە دوایدا گەڕان. گەیشتنە لای ئاشەکە، گوێیان لە ناڵە ناڵێك بوو. چوونە خوارەوە، دیتیان کابرا لە بنی ئاشەکە کەوتووە. پێیان گوت:

. ئەوە چییە؟ چت بەسەر هاتووە؟

گوتی:

. بۆ خاتری خوا دەرمبێنن.

کە لە بنی ئاشەکە دەریان هێنا. لە هۆش خۆی چوو. گوڵاویان لە دەم وچاوی پرژاند. بە هۆش خۆی هاتەوەو پێی گوتن:

. (بووك) کچ نەبوو. زرتە زەلامٍ بوو! تەفرەی دام. بڕۆن پیرەژن بگرن.

چوونە ماڵی پیرەژن سەیریان کرد نەماوە. کاتێ کوڕەکە کابرای فڕی دایە بنی ئاش، کلکێکی پێبوو. بە کلکەکە لێی دەداو دەیگوت:

. ئەمە کلکی گایە، یان کلکی نێرییە؟!

کاتێ کوڕی سوڵتان کلیلەکانی هێناو لە شار دەرچوو. ماڵی زاوا گوتیان:

. با کوڕەکەمان ببەینە چوڵەوانی بۆ ئەوەی بای باڵی خۆی بدا.

خیوەتیان بردو لە دەرەوە هەڵیان دا. چەند ڕۆژێك مانەوە. کوڕەکە لەگەڕانەوەدا، تووشی عارەبێك هات. پێی گوت:

. ها، ئەمە (دە) لیرەت بدەمێ. ئەم کلکە بگرەو بڕۆ لای ئەو کابرایەو پێی بڵێ:

. ئەمە کلکی گایە؟ یان کلکی نێرییە؟!

کاتێ کابرا گوێی لەم قسەیە بوو، گوتی:

- ئەمە خۆیەتی بیگرن!

کابرای عارەبیان گرت و تێرو پڕیان لێداو فڕێیاندایە زیندان. کەچی کوڕەکە کلیلەکانی برد. سواری ئەسپەکەی بوو و ملی ڕێی گرت و ڕۆیشت. نزیکەی بیست ڕۆژ ڕۆیشت. گەیشتەوە ماڵی کچەکە. لە دەرگای دا. گوتیان:

- کێیە؟

گوتی:

- منم.

کچەکە پێی گوت:

- بە خێر بێیەوە! کلیلەکانت هێنا؟!

گوتی:

- بەڵێ!

کوڕەکە قوفڵەکانی کردەوە. چۆن بوو وەکوو خۆی بینی. دووبارە قوفڵەکانی لەسەر کلیل دایەوە. نزیکەی مانگێك لە لای مایەوە. ئەوسا بە ژنەکەی گوت:

- هەستە بچینە لای باوکم.

ژنەکەی بردو گەڕایەوە لای باوکی و لە دەرگای دا. باوکە بە دیداری کوڕەکەی شاگەشکە بوو. یەکتریان ماچ کردو باوکی پێی گوت:

- کوڕم، ئەو ماوەیە لە کوێ بووی؟ ئەی براکانت چییان لێهات؟

کوڕەکە گوتی:

- براکانم ئەم کچە کوشتوونی. چ دەڵێی؟ چی لێ بکەین؟ بیکوژین.

باوکە گوتی:

- نا کوڕم. وازی لێ بێنە. ئەوەی چوو چوو!

نزیکەی بیست ڕۆژ، ئاهەنگی زەماوەندیان گێڕاو شایی و هەڵپەڕکێیان کرد. ئینجا ماڵی کوڕەکە کچەکەیان بردە حەمامو شووشتیان و هێنایان لە ژوورەوە دایاننا. شەوی هەینی کوڕەکە چووە پەردەو لەگەڵ کچەکە نووست. بۆ بەیانی دیارییەکی پێشکەش کرد. زیافەتێکی گەورەیان کردو هەموو عالەمیان داوەت کرد. کە زیافەت تەواو بوو، هەموو بڵاوەیان کردو ئەوانیش بە شادی و خۆشی بە یەکەوە ژیان.

کوڕەکە، کە دەهاتەوە ماڵێ، قوفلەکانی ژنەکەی دەکردەوەو کە دەچووە دەرەوە، قوفلەکانی کلیل دەدایەوە. باوکی پێی گوت:

. کوڕم، ئەم قوفڵانە بشکێنە! نەوەک ژنەکەت لەبەر ئەم قوفڵانە ڕا دەکا. ئەگەر قوفڵەکان بشکێنی، بڕوات پێدەکاو ڕاناکا.

کوڕەکە قوفلەکانی شکاند. ژنو مێرد بە شادیو بەختەوەری ژیانیان بردە سەر تا پێمێردیان هاتە سەرو ڕوحی کێشان.

لای ئێوە بووینو هاتینەوە.

* * *

## ٢٤ـ سێ کچە بازرگانی ئۆینباز

هەبوو نەبوو...

بازرگانێك هەبوو، بازرگانێکی بە هێزو تاقەت بوو. هەر خوا بە هێزو تاقەتە!! سێ کچی بە مێردی هەبوو.

ڕۆژێ، باوکیان نەخۆش کەوتو دوای نزیکەی (دە) ڕۆژ، کۆچی دوایی کرد. ناشتیانو پرسەیان بۆ دانا. بازرگانەکە ماڵێکی زۆری هەبوو. کچەکان چوونە لای قازی بۆ ئەوەی ماڵەکەیان بۆ بەش بکا. چوونو گوتیان:

ـ ئەی قازی ئیسلام، پێکمان بێنەو بە پێی شەرع ماڵەکەمان بۆ دابەش بکە.

قازی گوتی:

ـ هیچ پارەم لە ئێوە ناوێ. بەڵام دەبێ یەکەو هەقایەتێکم بۆ بگێڕنەوە بە سەر خۆتان هاتبێ.

کچە گەورەکە گوتی:

ـ جەنابی قازی با یەکەم جار من هەقایەتی خۆمت بۆ بگێڕمەوە:

(جەنابی قازی ، من مێردەکەم زۆری خۆش نەدەویستم. باشە، ئەگەر پیاوێ ژنەکەی خۆی خۆش نەوێ. ژنەکە چ بکا؟ کوێوە بچێ؟ ئایا ئیشی خراپ بکا؟!

قازی گوتی:

ـ نا.

کچەکە گوتی:

- هەرچەندە خۆم دەڕازاندەوە، ئاوڕی لێ نەدەدامەوە. ڕۆژێ، گوتم: بە خوا دەبێ فێڵێکی لێ بکەم. چوومە لای ئەو خاوەن مەیخانەی مێردەکەم شەڕابی لێ دەخواردەوە. پێم گوت:

- مەیخانەچی، سەد لیرەت دەدەمێ ڕێم بدە دەرگایەك بۆ ناو ئەم شوێنە بکەمەوە.

گوتی:

- باشە.

کرێکارم هێناو دەرگام کردەوە. ئینجا بە مەیخانەچیم گوت:

- مەیخانەچی، دەمەوێ نۆینێك لە ژێر زەوی لێ بدەم. لە ماڵی خۆمەوە بۆ ناو مەیخانەی تۆ.

مەیخانەچی گوتی:

- باشە.

چووم وەستام هێناو پێم گوت:

- وەرە لەم ماڵەوە تا مەیخانەی فلانە جوولەکە نۆینێکم بۆ لێ دە. ها، بگرە! ئەمە دوو سەد لیرە.

وەستا گوتی:

- باشە.

وەستا چوو کەرپووچی کڕی‌و دەستی بە هەڵکۆڵین‌و هەڵبەستنی نۆینەکە کرد. نزیکەی چوار مانگ بە ئیشەکەوە خەریك بوو. ئەوسا لێ بووەوە. لە ماڵی خۆمانەوە بە ناو نۆینەکەدا چوومە ناو مەیخانەی جوولەکەکەو پێم گوت:

- ئەی جوولەکە، ها، ئەمە بیست لیرە! کە مێردەکەم هات، من لێرە دێمە دەرێ. لە بەردەمیدا سەما دەکەم. پێی مەڵێ کە من ژنی ئەوم، با نەزانێ!

جوولەکەکە گوتی:

- نا. پێی ناڵێم.

ئەوسا چوومە ژووری خۆم. خۆم بە حەفت قەڵەم ئارایشت دا. پۆدرەم لە دەم وچاومداو جلم کردە بەرو چووم لە ناو مەیخانەکە دەستم بە سەما کرد. مێردەکەم هاتە مەیخانەو منی بینی. کە منی بینی گوتی:

- عەجايب ئەمە ژنی منە؟!

ئەوەندەی لێم وردبووەوە ديتی وەكوو ژنی ئەوم. زۆر تووڕە بوو. هەستا چووە دەرەوە. جەنابی قازی، كە ئەو چووە دەرەوە، زانيم دەچێتەوە ماڵێ. خێرا بە ناو نۆينەكەدا گەڕامەوە ماڵێ. جلی سەمام داكەندو خۆم بە چێشت لێنانەوە خەريك كرد.

مێردەكەم بە پرتاوی هاتە ژوورەوەو گوتی:

- عەجايب ئەوە مەسەلە چييە؟!!

دووبارە چووە دەرەوە. جەنابی قازی، كە ئەو چووە دەرەوە، ديسان جلی خۆم گۆڕی‌و بە ناو نۆينەكەدا چوومەوە مەيخانەو دەستم بە سەما كرد. مێردەكەم هاتە مەيخانەو كە چاوی بە من كەوت، گوتی:

- عەجايب! ئەوە مەسەلە چييە؟!!

زۆر تووڕە بوو. هەستا گەڕايەوە ماڵێ. منيش بە ناو نۆينەكەدا چوومەوە ماڵێ. جلی سەمام داكەندو خۆم بە جل شووشتنەوە خەريك كرد. كە هاتەوە، ديتی دانيشتووم جل دەشۆم، گوتی:

- عەجايب! ئەوە مەسەلە چييە؟!!

دووبارە چووە دەرەوە. چووەوە مەيخانە. تا ئەو گەيشتە ئەوێ، من بە ناو نۆينەكەدا چووە مەيخانەو دەستم بە سەما كرد. كە منی بينی سەما دەكەم، چەقۆی دەرهێنا ويستی لە خۆی بدا. بەڵام ساردبووەوەو چووە دەرەوە. كە ئەو چووە دەرەوە، منيش چوومەوە ماڵێ. مێردەكەم ئەم جارە نەهاتەوە ماڵی خۆمان. چووە ماڵی باوكم‌و پێی گوتن:

- وەرن سەير كەن، كچەكەتان بۆتە سەماكەر!

هاتن كەسيان نەدی. جوولەكەی ئارەقفرۆشيان سوێند دا داخۆ ئەوەی ئەو پياوە دەڵێ ڕاستە؟ يان ڕاست نييە؟!

كابرای جوولەكە گوتی:

- نەخێر، خوا نەكا. ئەم قسەيە چييە؟ كێ شتی وای بيستووە؟

ماڵی باوكم هاتنە لام لە ماڵەوە ديتيان هەموو گيانم تەنی مەنجەڵە. خەريكی چێشت لێنانم. بە پياوەكەيان گوت:

. هەی تەرەس، دەتەوێ ناموسمان ببەی و شەرەفمان بشکێنی؟!
وەریگەڕانێ ئەوەندەیان لێدا تا قنیاتیان لەبەر بڕی. جەنابی قازی، ئەمە بوو هەقایەتی من!)
قازی گوتی:
. وەی خوایە لەم چیرۆکە عاجباتییە!! هەموو ماڵەکە....
ویستی بڵێ: بۆ تۆیە. کچی ناوەنجی گوتی:
. ڕاوەستە جەنابی قازی با منیش هەقایەتی خۆمت بۆ بگێڕمەوە:
(جەنابی قازی، مێردی منیش منی خۆش نەدەویست. لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەو دەیووسە بۆچی منی خۆش ناوێ؟! چووم تیپێ چاڵغیم بە کرێ گرتو هێنام. جەنابی قازی، تیپەکە دەستیان بە مۆسقا لێدان کرد. مێردەکەم هاتەوە گوتی: ئەمە چییە؟! یەکسەر چووە دەرەوە. زانیم دەچێ کەسو کاری من دێنێ. بە تیپی چاڵغیم گوت:
. هەستن بڕۆن.
ئەوانیش ڕۆیشتن. ماڵم شووشتو خۆم بە نان کردنەوە خەریك کرد. کەسو کارم هاتن. دیتیان سەرقاڵی نان کردنم. بە مێردەکەمیان گوت:
. تۆ چۆن قسەی وا لە سەر کچی ئێمە دەکەی؟
تێی وڕووکان تا فەراقی حەنتەی لەبەر بڕا لێیان دا. جەنابی قازی، ئەمە بوو هەقایەتی من. هەقایەتەکەت پێ چۆنە؟!! )
قازی گوتی:
. بەڕاستی هەقایەتێکی سەیرە!
ئینجا گوتی:
. هەموو ماڵەکە...
ویستی بڵێ: بۆ تۆیە. کچی گچکە هەڵیدایێ:
. ڕاوەستە جەنابی قازی، با منیش هەقایەتی خۆم بکەم:
(جەنابی قازی، منیش مێردەکەم خۆشی نەدەویستم. گوتم: چ بکەم؟ چ نەکەم؟ چۆن فێڵێکی لێ دابمەزرێنم؟ مێردەکەم دەچووە خانو بازرگانی دەکرد. شتی دەکڕیو دەفرۆشتەوە. جەنابی قازی، ڕۆژێ مێردەکەم چووە دەرەوە. گەڕام

یەکێ بدۆزمەوە کتو مت بە مێردەکەم بچێ. ڕێم کەوتە بەر دوکانی بەربەرێك. بەربەرەکە لە دوکانی خۆی کاری دەکرد. کتو مت مێردەکەم بوو. پێم گوت: کاکە، زەحمەت نەبی وەرە قسەیەکم هەیە دەمەوێ لە گەڵت بکەم. پێی گوتم: ئافرەت چت دەوێ؟ پێم گوت: وەرە لە گەڵم بچین ئیشێکم پێتە. هێنامەوە ماڵێ‌و پێم گوت: با پێت بڵێم:

- یەکەم جار تۆ وەکوو برامی. سوێندت بە گۆڕی پێغەمبەر بۆ دەخۆم شتێ هەیە دەمەوێ بیکەم بۆیە تۆم هێناوەتە ئێرە. ها، فەرموو ئەمە سەد لیرە. دەمەوێ خۆت فێری کارو هەڵسوکەوتی مێردەکەم بکەی. دەبێ فێری لەبەرکردنی جلەکانی ببی‌و بچیتە خان‌و خۆت فێری ژمێریاریی بکەیت‌و بزانی کێ شتی لێ دەکڕێ‌و کێ شتی پێ دەفرۆشێ. گوتی: باشە!

لە ماڵەوە ژوورێکم دایێ بە سەر ڕێگادا دەیڕوانی بۆ ئەوەی فێری ڕەفت‌و ڕۆینی مێردەکەم ببێ. بەربەر بە دوو مانگ فێری هەموو شتەکانی مێردەکەم بوو. ڕۆژی پاشی، بەربەرم نارده حەمام. دەستە بەرگێکی پۆشتەم لەبەرکرد. ڕێك وەك مێردەکەمی لێهات. هیچ کەس. زۆرو کەم لە مێردەکەمی جیا نەدەکردەوە. پێم گوت: ها، ئەمە کلیل! بڕۆ دوکانی مێردەکەم بکەوەو ئیش بکە. ئەو چووە خان بۆ ئەوەی ئیش بکا، منیش دەرمانی بێهۆشیم دەرخواردی مێردەکەم دا. هەڵمگرت‌و بردمە چۆڵ‌و بیابان. جلە پۆشتەو بە نرخەکانم لە بەر داکەندو کەچە جلێکی پیسی دڕا دڕام لەبەرکرد. چوومە لای کاروانچییەك‌و پێم گوت:

- ها، فەرموو سەد لیرەت بدەمێ. ئەم پیاوە لەگەڵ خۆت ببە شارێکی دوورو تا سالێکی تر نەیهێنیتەوە. ئەو سا کە هێناتەوە سەد لیرەی تریشت دەدەمێ. ئێستا بێ هۆش بووە. کە بە خەبەرت هێنا پێلەقەیەکی لێدەو بڵێ: هەستە! کاروانچییەکە پێلەقەیەکی لێداو گوتی: هەستە! مێردەکەم بە شڵەژاوی هەستا. چاوی هەڵگلۆفت. کاروانچی مستێکی لە تیلەقەی پشتی دا. مێردەکەم چاوی کردەوە سەیرێکی خۆی کرد. دیتی لە چۆڵ‌و بیاباندایەو جلێکی شڕو وڕی لەبەرە. گوتی: ئەمە چییە؟!! کاروانچی کوڵە مستێکی تری لێدا. مێردەکەم گوتی: کاکە، من فلانە بازرگانم. زۆر دەوڵەمەندم. کاروانچی پێی گوت: هەستە

هەی مەلعوونی کوڕی مەلعوون! پاڵی پێوەناو سواری کەرێکی کردو لەگەڵ خۆی برد. هەر لێی دەداو دەیگوت: کوێرە. لەزکە. خێرا بڕۆ!

مێردەکەم تەنتەنەو سەنتەنەی پێشووی لە بیر چووەوە. تووشی دەردەسەرییەکی دژوار هات. دوای ساڵێك، کاروانچی هاتەوەو لە بیابان خستی. مێردەکەم لەبەر شەکەتی و لێدان و شەونخوونی خەوێکی قووڵی لێکەوت. کاتێ کاروانچی دیتی خەوتووە، هاتە لام. پێم گوت: هێناتەوە؟!

(هەموو جارێ کە کاروانچی لە بازرگانەکەی دەدا. بازرگانەکە دەیگوت: بۆچی لێم دەدەی؟! کاروانچی دەیگوت: ئەوە (حوبە)ی خێزانتە. بۆچی خۆشت ناوێ.)

کە کاروانچی گوتی: هێناومەتەوە، چووم بەنجم لێداو هێنامەوە ماڵێ و وەکوو جاران نوێنم بۆ ڕاخست. مێردەکەم بردە حەمام و شووشتم و پاکم کردەوە. کە شووشتم جلەکانی خۆیم کردەوە بەرو هێنامەوە لە ناو نوێن دامناو دەرمانی هۆشیار بوونەوەم دایێ. بەنجەکە بەری دا. بەڵام هەر لە خەودا بوو. بە ئاگام هێنا. کە بە خەبەر هات دیتی لە ماڵ و شوێنی خۆیەتی. بە حەپەساوی پێی گوتم:

ـ ئەمە چییە؟!

گوتم:

ـ چ چییە؟خەونت دیوە؟

چاوی هەڵگلۆفت و گوتی:

ـ نەخێر خەون نییە. پێش ئێستایش کاروانچی لێیدەدام و دەیگوت: خەونت دیوە. بەڵام بە خوا خەونم نەدیوە!!

ئەوسا خەبەرم بۆ بەربەر ناردو گوتم:

ـ برام، ماوەکە تەواو بوو. فەرموو بڕۆرەوە. ها، ئەمەیش سەد لیرەی تر!

بەربەر ڕۆیشت. چوومە لای مێردەکەم و پێم گوت:

ـ هەستە بڕۆ خان بۆ سەر ئیشی خۆت!

مێردم هەستا چووە خان و دوکانی کردەوەو لەسەر دوکان دانیشت. کۆمپیاڵەیەکی بۆ هات. کابرا بە دەستی خۆی کمپیاڵەکەی دایێ و پێی گوت:

. پارەکەم بدەرێ.

مێردەکەم گوتی:

. پارەی چی؟

گوتی:

ـ خۆت دوێنێ کۆمپیاڵەکەت مۆرکرد. کابرا هەر واقی وڕما. مێردەکەم، کە هاتەوە، چی ڕوویدا بوو، بۆی گێڕامەوە. جەنابی قازی، ئەمە بوو هەقایەتی من. هەقایەتەکەت پێ چۆنە؟ ئێستا پارەکە بۆ کێ دەبێ؟)

قازی گوتی:

. کچم، پارەی باوکتو پارەی منو هەرچی هەمە، هەمووی بۆ تۆ!

کچەکان گەڕانەوە ماڵێ. کچە بچووکەکە لە گەڵ مێردەکەیدا بە شادیو گوشادی ژیان.

لای ئێوە بووینو هاتینەوە.

* * *

# ٢٥ـ كچی چیلکەکەر

هەبوو نەبوو...

سوڵتانێك هەبوو، کوڕێکی هەبوو دایكو باوکی زۆر خۆشیان دەویست. ڕۆژێ، باوکی پێی گوت:

. کوڕم، وەرە با دۆتمامی خۆتت بۆ بخوازم.

کوڕەکە گوتی:

. نا، باوکە من نامەوێ دۆتمامی خۆم بێنم.

ئینجا چووە دەرەوە. سێ پەڕی هێنا بە دایکی گوت:

. دایکە ژنێکم بۆ بخوازە وەکوو ئەم پەڕانە بێ. پەڕەکان یەکیان سپیو یەکیان سوورو یەکیان ڕەش بوو. گوتی: ژنێکم دەوێ وەکوو ئەم پەڕە سپییە سپی بێ. چاوو برۆی وەکوو ئەم پەڕە ڕەشە ڕەش بێو ڕوومەتی وەکوو ئەم پەڕە سوورە سوور بێ.

دایکی گوتی:

. کوڕم تۆ کۆمەڵە دۆتمامێکت هەیە، دۆتمامێکت بێنە.

کوڕەکە گوتی:

. شتی وا نابێ. ژنێکم دەوێ ڕەنگی ئەم سێ پەڕەی تێدابێ.

دایکی عەبای لە خۆی داو چووە دەرەوە. یەك مانگ گەڕا. گەیشتە ماڵی چیلکەکەرێك. کچێکیان هەبوو ئەو مەرجانەی تێدا بوو کە کوڕەکە دەیەویست. دایکە گەڕایەوە بە کوڕەکەی گوت:

. کچێکم لە ماڵی چیلکەکەرێك دۆزیوەتەوە. ئەوەیە کە تۆ دەتەوێ.

کوڕەکە گوتی:

. گرنگ نییە. باوکی چیلکەکەرە. بڕۆ داخوازیی بکەو مارەیی بیڕە.

دایکە پارەی بردو کچەکەی لە کوڕی خۆی مارەکرد. پاش چەند ڕۆژێ، کەس‌و کاری کچەکە جیازی بووکیان هێناو لە ژوورەوە دایاننا. ڕۆژی پاشی، بووکیان گواستەوە. کە دۆتمامەکانی کوڕەکە زانییان پسمامەکەیان کچێکی هێناوە خەسیەتەکانی ئەوهاو ئاوهایە! بانگی قووڵەڕەشی کوڕی سوڵتانیان کرد. بیست لیرەیان دایێ‌و پێیان گوت:

. بڕۆ لای پسمامەکەمان‌و پێی بڵێ:

. جەناب! ئەم ژنە چییە بۆیان هێناوی؟ ئافرەتێکی ڕەشی وەکوو من وایە!

قووڵەڕەشەکە چووە لای ئاغاکەی‌و پێی گوت:

. جەناب، ئەم ژنە چییە بۆیان هێناوی؟ ئافرەتێکی ڕەشی وەکوو من وایە!

کوڕەکە گوتی:

. بەڕاستیتە؟!

قوولەڕەشەکە گوتی:

. ئەرێ بەخوا!

کوڕی سوڵتان زۆر تووڕە بوو. بە قووڵەڕەشەکەی گوت:

ـ بڕۆ بە ماڵەوەمان بڵێ من شەوی زاوایی نایەمەوە ماڵێ. دەستە نوێنێکم بۆ بنێرنە ناو باخ!

قوولەڕەشەکە یەکەم جار گەڕایەوە لای دۆتمامەکانی کوڕەکەو پێیراگەیاندن کە قسەکەی بە کوڕەکە گوتووە. ئینجا چووە ماڵی سوڵتان. دایکی کوڕەکە خەریکی ڕێکخستنی جیازی بووك بوو. قوولەڕەشەکە پێی گوت:

. کوڕەکەت دەڵێ شەوی زاوایی نایەمەوە ماڵێ. دەستە نوێنێکم بۆ ڕەوانەی ناو باخ بکەن.

دایکە، کە ئەم قسەیەی بیست، زۆری پێ ناخۆش بوو. زانی ئەمە کاری بوختانی دوژمنەکانی کوڕەکەیەتی. زۆر بە چاکی ماڵی ڕێك خستو دەستە نوێنێکی بۆ کوڕەکەی ناردە ناو باخ.

کوڕی سوڵتان نزیکەی بیست مانگ لە ناو باخ مایەوە.

دایکی لە پەستا خەبەری بۆ دەنارد: کوڕم وەرەوە! ژنەکەت جوانو جحێڵە! چاوەڕێت دەکا. وەرەوە سەیری کە! ئەگەر وا نەبوو بمکوژە!

کوڕەکەیش هەموو جارێ وەڵامی بۆ دەناردەوە، دەیگوت:

. من ئەو ژنەم ناوێ!

ڕۆژێ، کچەکە لە خەسووی پرسی:

. پووری، کوڕەکەت لە کوێیە؟

ژنەکە گوتی:

. لە ناو باخە!

کچەکە گوتی:

. کام باخ

ژنەکە گوتی:

. لە ناو باخی خۆمانە! باخەکەمان دەوری چارەگە سەعاتێك لێرە دوورە.

کچەکە کاتێ بەمەی زانی، دەستەبەرگێکی پیاوانی کردەبەرو عەگالێکی زوبێری لەسەرناو سواری ئەسپ بوو. ڕۆیشت تا گەیشتە باخەکە. دەرگای پاڵ دا سەیری کرد کراوەتەوە. بانگی کرد:

باخەوان، وەرە وەرە، دەرگا بکەوە!

گوڵی سوورم بدەرێ، زێری سوورت دەدەمێ!

باخەوان دەرگای کردەوە. چوونە ژوورەوە. کچەکە هەندێ پارەی دایە باخەوانو چووە ناو باخ. لە دوو مێردەکەی گەڕا نەیدۆزییەوە. مێردی چوو بووە ڕاو. کە کچەکە مێردەکەی نەدیتەوە، (ئاخر چوو بووە ڕاو) دەستی دایە تەورێكو هەموو نەمامەکانی ژێر دارخورماکانی داپاچیو چووە دەرەوە. سواری ئەسپەکەی بوو و گەڕایەوە. کوڕی سوڵتان لە ڕاو هاتەوە. چووە ناو باخ دیتی هەمووی داپاچراوە. گوتی: ئەوە مەسەلە چییە؟ هەموو نەمامەکان داپاچراون؟! بانگی باخەوانی کردو پێی گوت:

ـ کورە، وەرە. ئەوە مەسەلە چییە؟!

باخەوان گوتی:

ـ ئەفەندی کوڕێك هات لە دەرگای باخی داو گوتی:

باخەوان، وەرە وەرە، دەرگا بکەوە!

گوڵی سوورم بدەریێ، زێڕی سوورت دەدەمیێ!

دەرگام لێکردەوە. گەنجێکی قۆز بوو. دەتگوت مانگە. دەتگوت گورجییە.

کوڕی سوڵتان گوتی:

ـ بەیانی من خۆم دەشارمەوە. ئەگەر هات دەرگای لێبکەوە. دەیگرم!

ڕۆژی پاشی، کچەکە دەستەبەرگێکی نوێی کردە بەر هەمووی ئاوزێڕ بوو. سوار بوو و چوو. کوڕی سوڵتان زۆر چاوەڕێی کرد. کە سەیری کرد کەس نەهات چووە ڕاوو شکار. کە ئەو ڕۆیشت کچەکە هات. دەرگای پاڵ دا دیتی کراوەتەوە. لە دەرگای داو بانگی کرد:

باخەوان، وەرە وەرە، دەرگا بکەوە!

گوڵی سوورم بدەریێ. زێڕی سوورت دەدەمیێ!

باخەوان دەرگای کردەوە. کچەکە ئەوەندە جوان بوو. کە باخەوان چاوی پێ کەوت، هۆشی لە خۆی نەما. کچەکە چووە ناو باخ و بە دوای مێردەکەیدا گەڕا. گەڕا نەیدۆزییەوە. هەموو دارخورماکانی بڕییەوەو گەڕایەوە ماڵێ. پاش قەیرێ، کوڕی سوڵتان هاتەوە سەیری کرد دەرگا کراوەتەوەو باخەوان لە هۆش خۆی چووە. بە ئاگای هێناو پێی گوت:

ـ ئەوە مەسەلە چییە؟

گوتی:

ـ ئەفەندی کوڕەکە هات. کە چاوم پێکەوت، ئەوەندە جوان بوو، هۆشم لە خۆم نەماو بەربوومەوە.

کوڕەکە گوتی:

ـ بەیانی ناچمە ڕاو!

ڕۆژی سێیەم، کاتی چێشتەنگاو، کچەکە سواری ئەسپ بوو و هات لە دەرگای داو گوتی:

باخەوان، وەرە وەرە، دەرگا بکەوە!

گوڵی سەوزم بدەرێ. زێڕی سوورت دەدەمێ!
باخەوان دەرگای کردەوە. کچەکە چووە ژوورەوە. کوڕی سوڵتان گرتی و گوتی:
- تۆ کێی؟ (وایزانی پیاوە) بۆچی هەموو ڕۆژێ دێی دارو درەختی ئەم باخە دەبڕیتەوە؟
کچەکە گوتی:
- دێم و دەبینم کەس نییە. بۆیە درەختەکان دەبڕمەوە.
کوڕی سوڵتان، کە چاوی بە کچەکە کەوت وایزانی کوڕە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەشقی بوو. کچەکە پێی گوت:
- وەرە یاری شەترەنج بکەین.
سەعاتێك یارییان کرد. ئەوسا کچەکە بە پیاسە دەستی بە هاتوچۆکرد. پەلزڕێکی دارخورمای لە پێ ڕاچوو برینداری کرد. کوڕی سوڵتان دەسەسڕی خۆی دەرهێناو برینەکەی بۆ بەستەوە. ئەو دەمەی کوڕی سوڵتان خەریکی بەستنەوەی برینی کچەکە بوو، کچەکە بە دزی سەعاتی لە گیرفانی کوڕەکە دەرهێناو شاردییەوە. ئینجا ڕوخسەتی لێ خواست و گوتی:
- بە خاتریێ تە!
کچەکە چووە ماڵەوەو بە خەسووی گوت:
- پووری، ڕاوەستە بزانە چۆن کوڕەکەت دێنمەوە ئێرە؟!
کوڕی سوڵتان چاوەڕێی سوارەی گۆرینی کرد، نەهات. لە شروان نەخۆش کەوت و خەبەری بۆ کەس و کاری نارد و گوتی:
- جل وبەرگەکانم بۆ بنێرن.
دەزگیرانەکەی جلەکانی کوڕەکەی هێناو دەسەسڕەکەی لە ناو ناو دایە قوڵەڕەشەکە بۆی ببا. کوڕەکە، کاتێ جلەکانی کردەوەو چاوی بە دەسەسڕەکەی خۆی کەوت، هەر واقی وڕما. گوتی:
- ئەم دەسەسڕە لە کوێ هات؟ بە قوڵەڕەشەکەی گوت. قوڵەڕەشەکە گوتی: نازانم!
حەفتەی پاشی، کوڕەکە ناردی جلی خاوێنی تری بۆ بنێرن. دەزگیرانەکەی ئەم جارە سەعاتەکەی بۆ لە ناو جلەکان ناو قوڵەڕەشەکە جلەکانی بۆ کوڕەکە برد. کوڕەکە جلەکانی کردەوە. کە چاوی بە سەعاتەکە کەوت گوتی:

. عەجایب! ئەوە مەسەلە چییە؟

خەبەری بۆ دایکی نارد. حاڵو مەسەلەیەکی ئاوها هەیە. ئەوە چییە؟ ئەوە کێیە لە لاتان؟

دایکی خەبەری بۆ ناردەوە. گوتی:

. دەزگیرانەکەی تۆیە لە لامان.

کوڕەکە باخەکەی جێ هێشتو یەکسەر گەڕایەوە ماڵێ. کە چاوی بە دەزگیرانەکەی کەوت. گوتی:

. ئای عەجایب! ئەی بۆچی قوڵەڕەشەکە ئەم قسەیەی بۆ کردمو گوتی: کچەکە هیچ جوان نییە. وەکوو من ڕەشە!!

لە دوای قوڵەڕەشەکەی نارد. قوڵەڕەشەکە هات. کوڕەکە پێی گوت:

. ئەوە کێ ئەو قسەیەی فێرکردی؟ کە هاتی پێت گوتم. پێم نەڵێی هەر ئێستا دەتکوژم.

قوڵەڕەشەکە گوتی:

. ئەفەندی دۆتمامەکانی خۆت ئەمەیان فێرکردم!

کوڕەکە لە سەری قوڵەڕەشەکەی داو لە دوو دۆتمامەکانی ناردو هەمووی کوشتن. سەر لە نوێ ئاهەنگی زەماوەندی سازدا. بوو بە شاییو هەڵپەڕکێ.

چووە لای کچەو پێی گوت:

. ئەوە تۆ بووی دەهاتیتە ناو باخ؟

گوتی:

. بەڵێ. من بووم!

کوڕەکە کچەکەی چەند خۆش دەویست، سەد هەندەی تری خۆش ویست و بە شادیو بەختەوەری ژیان.

لای ئێوە بووینو هاتینەوە.

* * *

## ٢٦ـ کچی سوڵتان و کوڕی شێخی عارەبان

هەبوو نەبوو...

سوڵتانێك هەبوو، کچێکی هەبوو. کچەکە پسمامێکی گۆشتفرۆشی هەبوو. ئەو گۆشتفرۆشە کوڕە جنۆکە بوو. دەیتوانی خۆی بخاتە سەر شکلی هەر شتێکی کە بیەوێ.

ڕۆژێ، پسمامی ناردییە هەجبینی دۆتمامەکەی. کچەکە ڕازی نەبوو شووی پێ بکا. گۆشتفرۆشەکە گوتی:

ـ ئاخ!! لەو جندەیە!! خۆ شووی پێنەکردم. ڕاوەستە چی لێ بکەم؟!

شێخێکی عارەبان هەبوو. سێ کوڕی هەبوو. ڕۆژێ کوڕە گەورەکە گوتی:

ـ بۆ هەوا گۆڕین دەچمە شارێکی ترو بای باڵی خۆم دەدەم.

ڕۆیشت چووە ئەو شارە. کە چووە ناو شار. یەکەم جار منارەیەکی دی. کەللەسەری بنیادەمی پێوە هەڵواسرابوو. پرسی:

ـ ئەمە چییە؟

گوتیان:

ـ ئەمە ئیشی کچی سوڵتانە. هەرکەسێ بچێتە داخوازی. داوای لێ دەکا هەقایەتێکی بۆ بگێڕێتەوە بە سەرخۆی هاتبێ. ئەگەر کابرا هەقایەتەکەی گێڕایەوە و کچەکە بە قسە هات، شووی پێدەکات. ئەگەرنا لە سەری دەدا.

کوڕەکە کاتێ بەم مەسەلەی زانی. چووە ماڵی کچەکەو باوکی کچەکەی بینی. سەلامی کرد. باوکی کچەکە گوتی:

. فەرموو چت دەوێ؟

گوتی:

. هاتوومەتە داخوازی کچەکەت.

باوکی کچەکە گوتی:

. کچەکەم ئەوەتا دانیشتووەو مۆمدانی لە لایە. بڕۆ هەقایەتێکی بۆ بگێڕەوەو بە قسەی بێنەو بۆ خۆت بیهێنە. کوڕەکە گوتی:

. باشە.

کوڕەکە چووە لای کچەکە. هەقایەتێکی بۆ گێڕایەوە بەو مەبەستەی بە دەنگی بێنێ. بەڵام کچەکە هیچ متەقی لێوە نەهات. کچەکە فەرمانی دا لەسەری کوڕەکە بدەن.

پاش ساڵێك، برای ناوەنجی بۆی دەرچوو. ئەویش چووە هەمان شار. چووە ناو شار. یەکەم جار منارەکەی دی‌و بە مەسەلەکەی زانی‌و گوتی:

. من هەقایەتی بۆ دەگێڕمەوە.

چووە لای کچەکە. دەستی پێکرد. هەر هەقایەتی گێڕایەوەو گێڕایەوە. بەڵام کچەکە قوڵماتی نەکرد. کوڕەکە هەر هەندەی زانی شیری لەسەر ملە! سەریان بڕی‌و کەللەکەیان بە منارەکەوە هەڵواسی.

مانگێکی بەسەر داچوو، برای گچکە بۆی دەرچوو. بە کەشتی چووە سەفەر. کە گەیشتە ناوەڕاستی دەریا. گەرداوێك هەڵیکرد. هەموو کەشتییەکانی کاروانەکە تێك‌و پێك شکان‌و هەچ کەسی لە کەشتیەکان دابوون هەموو خنکان. تەنیا برا گچکەکەو دوو پیاوی تر نەجاتیان بوو. هەر سێکیان وەکوو برایانیان لێهات. کەوتنە سەر تەختە دارێك‌و بە مەلە چوونە دەرەوە بۆ سەر دوورگەیەکی گەورەی پڕ دارو بارو خێرو بێر. کە شەو داهات، گوتیان:

. با لە ترسی جانەوەری دڕندە بە نۆرە ئێشك بگرین. یەکەم کەس کە ئێشکی گرت دارتاش بوو. دارتاش کە دانیشت ئێشك بگرێ، پارچە دارێکی هێناو پەیکەری کچێکی گەورەی لێ داتاشی. دارتاشەکە نۆرەی تەواو بوو. نەفەری

دووەمی بە ئاگا هێنا خۆی نووست. نەفەری دووەم قوماشفرۆش بوو. کە پەیکەرە دارەکەی دی لەسەر شکڵی کچێکی گەورە بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: با دەستە بەرگێکی بۆ بدوورم. قوماشی بڕیو دووریو جلەکەی کردە بەر پەیکەرەکە. ئا ئەمەی کرد، نۆرەی تەواو بوو. نەفەری سێیەمی بە خەبەر هێناو خۆی نووست. نەفەری سێیەم مەلا بوو. کە مەلا بە خەبەر هات. دیتی ژنێك لەوێ وەستاوە. چووە لایەوە، نەجوولایەوە. دەستی لێدا سەیری کرد ئافرەتێکی دارە. گوتی: بەخوا دوو ڕکات نوێژ بۆ خودا دەکەمو لە خودا دەپاڕێمەوە بەڵکو ڕۆحی بە بەردا بکا. دەستنوێژی شووشتو نوێژی دابەستو دوو ڕکات نوێژی کردو لە خوا پاڕایەوە. کە ڕۆح بە بەر پەیکەری داری ژنەکەدا بێنێ.

بۆ سبەینێ دیتیان پەیکەرەکە ڕۆحی لەبەر دایە. مەلا لە خۆی مارەکردو چووە کنی. لەوێ ڕۆیشتن. دوای چەند ڕۆژێك، گەیشتنە هەمان شار. لە شار ماڵاوایینان لە یەکدی کردو لێك دابڕان. کوڕەکە منارەیەکی دی کەللەسەری پێوە هەڵواسرابوون. کەللەسەری هەردوو براکە ئەمیشی پێوە بوو. گوتی:

. ئای های! هەوارتە لە منێ! ئەمانە سەری براکانی منن بێرە هەڵواسراون.

پرسی ئەمانە بۆچی کوژراون؟

گوتیان:

- هەرکەسێ بچێتە خوازبێنی کچی پاشا، دەبێ هەقایەتێکی بۆ بگێڕێتەوە بە سەر خۆی هاتبێ و بە قسەی بێنێ. ئەگەر کچەکە بە قسە هات، شووی پێدەکاتو ئەگەر بە قسە نەهات، لەسەری کابرا دەدەن.

کوڕەکە گوتی:

. ئاخو سەد داخ! ئەم جندەیە دوو براکەی کوشتووم. چۆن بیکوژم؟

کوڕەکە چوو لە خانێك دابەزی. دەوری (دە) ڕۆژێك لەوێ مایەوە. لەگەڵ گۆشتفرۆشی پسمامی کچەکە بوو بە برادەر. ئەو پسمامە بوو یەکەم جار داوای لە کچەکە کرد شووی پێبکاو کچەکە ڕەتی کردەوە. کوڕەکە بوو بە هاوڕێی پسمامی کچەکەو وەکوو برایانیان لێهات. یەك دەقیقە چییە لە یەك دانەدەبڕان. ڕۆژێ، کوڕەکە بە پسمامی کچەکەی گوت:

ـ دەمەوێ بچمە لای ئەو جندەیە کە دوو براکەی کوشتووم. دەمەوێ هەقایەتێکی بۆ بگێڕمەوەو شایەتیێ هەبێ. ئەوسا دەیهێنمو دەیکوژم. پسمامی کچەکە گوتی:

. هەقایەتەکە چییە؟

کوڕەکە هەقایەتەکەی لە سەری هەتا بنی بۆ گێڕایەوە. پسمامی کچەکە گوتی:

. بەڵێ هەقایەتێکی باشە!

ئینجا گوتی:

. هەر خۆیشم دەبم بە شایەت. من خۆم دەکەم بە چۆلەکەو دەچم خۆم لە ناو مۆمدانەکەی دەشارمەوە. تۆ هەرچەندە بەشێکی هەقایەتەکەت گێڕایەوە. بڵێ: وایە؟ یان نا، مۆمدان؟ منیش دەڵێم: بەڵێ وایە!

ڕۆژی پاشی، کوڕەکە چووە ماڵی سولتان. لە دەرگای دا. دەرگایان کردەوە. سەلامی کرد. سەلامیان وەرگرتەوە. گوتیان:

. فەرموو، ئەمر کە!

گوتی:

. هاتوومەتە خوازبێنی کچەکەتان.

گوتیان:

. برۆ هەقایەتێکی بۆ بگێڕەوەوە بە سەر خۆت هاتبێو شایەتت هەبێ. ئەگەر قسەی کرد، مێردت پێ دەکاو ئەگەر هیچ قسەی نەکرد، بزانە سەرت بە بڕین دەچێ.

کوڕەکە گوتی:

. باشە ڕازیم!

کوڕەکە لەگەڵ خەڵکەکە چووە لای کچەکە. کچەکە لە ژوورەوە دانیشتبوو. مۆمدانەکەیشی لە نزیك دەرگا بوو. کوڕەکە چوو لە تەنیشت مۆمدانەکە دانیشت. خەڵکەکەش لە سەر تەخت دانیشتن. خەڵکەکە پێیان گوت:

. فەرموو بگێڕەوە.

کوڕەکە گوتی:

. باشە بۆتان دەگێڕمەوە. فەرموون گوێ بگرن:

(ڕۆژێ، بە کەشتی چوومە سەفەر گەیشتینە ناوەڕاستی دەریا. گەردوایێك هەڵیکردو هەموو کەشتییەکانی تێکشکاندو نەفەرەکان هەموو خنکان. تەنیا ئێمە سێ کەس نەجاتمان بوو. کەوتینە سەر پارچە دارێکی وەکوو کەلەك. ئەو سێیەمان یەکێ دارتاشو یەکێ مەلاو منیش قوماشفرۆش بووم. تەختەدارەکەمان هاژوا تا گەیشتینە دوورگەیەکی چۆڵ. کەسی تێدا نەبوو. ئێوارێ نانمان خواردو دانیشتین. دەستمان بە قسەو دەمەتەقێ کرد. لێرەدا کوڕەکە ڕووی کردە مۆمدانەکەو گوتی:

. وا نییە مۆمدان؟

مۆمدانەکە گوتی:

. با. وایە.

کە مۆمدانەکە وەڵامی دایەوە. خەڵکەکە هەموو سەریان سوڕما. کچەکە ئاگای لە هەموو شتەکە هەبوو کە کوڕەکە دەیگێڕایەوە. بەڵام کاتێ گوێی لە مۆمدانەکە بوو گوتی: با. وایە. بە وردی گوێی لە هەقایەتەکە گرت. ئەوسا کوڕەکە بەردەوام بوو. گوتی:

ـ ویستمان بخەوین. لە بەینی خۆمانەوە گوتمان ئەگەر هەموومان بخەوین، جانەوەرێك بێ هەموومان دەخوا. دارتاشمان ڕاسپاردو گوتمان:

ــ تۆ ماوەیەك پاسەوانیمان بکە. ئەوسا قوماشفرۆش بە ئاگا بێنە. قوماشفرۆشیش ماوەیەك پاسەوانی بکاو مەلا بە ئاگا بێنی. لەسەر ئەمە ڕێکەوتین.

دارتاش ئێشکی گرتو ئێمە خەوتین. دارتاش لە ماوەی ئێشکی خۆیدا، دارێکی هێناو دایتاشیو پەیکەری کچێکی لێ دروست کردو قیت داینا. ماوەی ئێشکی تەواو بوو. قوماشفرۆشی بە ئاگا هێناو خۆی نووست. کە قوماشفرۆش بە ئاگا هات. گەڕا جێگایەك بدۆزێتەوە، پێویستی خۆی جێبەجێ بکا. شتێکی دی قیت وەستا بوو. چووە لایەوە دیتی پەیکەرە دارێکە لە شێوەی ئافرەتدا. لە دڵی خۆیدا گوتی: بێ شك ئەمە دارتاش دروستی کردووە. منیش جلی بۆ دەکەمو لەبەری دەکەم. قوماشی هێناو هەڵیبڕیو دووریو جلەکەی کردە بەر. تا ئەو ئەم سەینو بەینەی کرد، نۆرەی ئێشکی تەواو بوو.

مەلای لە خەو هەستاندو خۆی نووست. مەلا هەستا بۆراتییەکی دی. وایزانی جانەوەرە. دەستی دایە شمشێرو ڕایماشتیٚ بۆ ئەوەی بیکوژێ. سەیری کرد پەیکەرە دارێکە قیت وەستاوەو جلی لەبەرکراوە. لە دلّی خۆیدا گوتی: ئەمە کاری هەردوو هاوڕێکەمە. ئەوان دروستیان کردووە. منیش دوو ڕکات نوێژ دەکەمو لە خوا دەپاڕێمەوە. بەڵکو خوا ڕۆحی بە بەردا بکا.

ئەوسا ڕووی کردە مۆمدانەکەو گوتی:

- وا بوو؟ یان نا مۆمدان؟!

مۆمدانەکە گوتی:

- بەڵێ وا بوو.

کچەکە وەخت بوو دلّی شەق ببا بۆ قسەیەك. ئینجا کوڕەکە بەردەوام بوو: مەلا هەستا دوو ڕکات نوێژی کرد. تا نوێژی بەیانی لە خوا پاڕایەوە. پەیکەرەکە پژمی و ڕۆحی چووە بەر. کچێکی ئەوەندە جوان بوو هەر مەپرسە. گەورەیی هەر بۆ ئەو خودایەی دروستی کردووە!! سبەینێ دوو هاوڕێکەی چاویان بە کچەکە کەوت، سەریان سوڕما.

کوڕەکە دیسان ڕووی کردە مۆمدانەکەو گوتی:

- مۆمدان، پرسیارێکت لیٚ دەکەم: ئەو کچە بۆ کامەیان دەبیٚ؟!!

کچی سوڵتان خۆی پێنەگیراو گوتی:

- بۆ مەلا دەبیٚ!

کە ئەو گوتی بۆ مەلا دەبیٚ، کوڕەکە گوتی:

- ئەوە قسەت کرد. قسەت کرد!!

خەڵکەکە گوتیان:

- خوا پیرۆزی کا! ئەوە تۆ چۆن بە قسەت هێنا؟

خەڵکەکە چوونە لای باوکی کچەکەو گوتیان:

- کچەکەت قسەی کرد.

باوکی کچەکە گوتی:

- بە ڕاست؟!

گوتیان:

- ئەریّ بەخوا!!

باوکی کچەکە کچەکەی لە ژووریّ هێنایە دەریّو دەستی لە ناو دەستی کوڕەکە نا. کوڕەکە ئاگری لە هەناوی دەسووتا. چونکە ئەو کچە دوو براکەی کوشتبوو. کچەکەی بردە خانەکە. دیتی پسمامی کچەکە لەویّ دانیشتووە. هەر یەکە قاچێکی کچەکەیان گرتو لێکیان هەڵزڕاندو کوشتیان.

گۆشتفرۆشی پسمامی کچەکە بە کوڕەکەی گوت:

- تۆ تازە وەکوو برای منت لێهاتووە. وەرە لەگەڵ ئێمە بەو لەگەڵ ئێمەیش بژی. کوڕەکە چووە ماڵی گۆشتفرۆشەکە. گۆشتفرۆشەکە کچێکی بۆ خواستو ژنێکی بە دڵی خۆی بۆ هێناو بە شادیو بەختەوەری ژیان. دوای دوو مانگ یان زیاتر، کابرای گۆشتفرۆش نەخۆش کەوت. کوڕەکە زۆر خزمەتی کرد. پاش دوو مانگی تر، کابرای گۆشتفرۆش کۆچی دوایی کرد. کوڕەکە کفنو دفنی کردو لەگەڵ ژنەکەی خۆی بە شادیو گوشادی ژیان.

لای ئێوە بووینو هاتینەوە.

* * *

## ٢٧- كوڕی وەزیرو باوەژنی

هەبوو نەبوو...

وەزیرێك هەبوو، كوڕێكی هەبوو، زۆری خۆش دەویست. كوڕەكە ماینێكی هەبوو چێشتو شیری دەرخوارد دەدا. زۆر خزمەتی دەكرد. هەموو ڕۆژێ بە ئاوو سابوون دەیشووشت. نەیدەزانی ماینەكە كچە جنۆكەیە. كە كوڕەكە دەچووەوە ماڵی، ماینەكە بۆی دەپڕماندو ئەویش دەچووە لایەوەو لە كنی دادەنیشت. بە كورتی كوڕەكە ماینەكەی زۆر خۆش دەویست. كوڕەكە لە لای مەلای دەخوێند.

ڕۆژێ، كوڕەكە، دایكی نەخۆش كەوتو دوای چەند ڕۆژێ خوا ئەمانەتی خۆی لێوەرگرتەوە. كوڕەكە زۆری بۆ گریا.

ساڵ تێ سوڕایەوە، باوكە هەوای ژنهێنان لە سەریدا. ژنێكی داخوازی كردو هێنای. ئەم باوەژنە تا مردن ڕقی لە كوڕەكەو لە ماینەكەی دەبووەوە چونكە كوڕەكە برنجو شیری دەرخواردی ماینەكە دەدا.

ڕۆژێ، ژنەكە لە دڵی خۆیدا گوتی: دەبێ ئەم كوڕە ژەهر خواردوو بكەمو ئەم ماینەش بكوژم. ژەهری بۆ كوڕەكە لە چێشت كرد. كاتێ كوڕەكە هاتەوە، ماینەكە گازی كردو پێی گوت:

. ئاگادار بە! باوەژن ژەهری بۆ لە خواردن كردووی. خواردنەكە مەخۆ!

كاتێ كوڕەكە هات، زڕدایكی پێی گوت:

. وەرە شیوت بخۆ.

کوڕەکە گوتی:

. برسیم نییە. ئیشتیای خواردنم نییە!

باوەژن زانی ماینەکەی پێی گوتووە. ئەم جارە ژەهری لە ناو جلەکانی کوڕەکە کرد بۆ ئەوەی کە جلی کردە بەر، لەشی هەموو هەلا هەلا بیّ. دیسان ماینەکە خەبەری دایێ. باوەژن لە دڵی خۆیدا گوتی:

. چ لەم ماینە بکەم؟ چۆنی بفەوتێنم؟!

ئینجا گوتی:

. دەبێ بە فێلێك ئەم ماینە بکوژم.

چووە لای تەبیب و پێی گوت:

ـ ها، ئەمە سەد لیرەت بدەمێ. من خۆم نەخۆش دەخەم و مێردەکەم دەنێرمە دووت. لەگەڵیا وەرەو فەحسم بکەو بڵێ: دەرمانی دەردی ئەم ژنە تەنیا گۆشتی ماینی ماڵەکەتانە. گۆشتی ئەو ماینە بخوا چاك دەبێتەوە.

تەبیب گوتی:

. باشە.

باوەژن بایی دوو درهەم زەعفەرانی کڕی و لە دەم وچاوی خۆی دا. هەندێ نانی ڕەقیشی لە بن نوێنی دانا. خۆی نەخۆش کرد و ڕاکشا و دەستی بە ناڵە ناڵ کرد. مێردی هاتەوە و پێی گوت:

. فلانەکەس، ئەوە چ خێرتە؟!

ژنەکە گوتی:

. نەخۆشم!

لە دیار مێردی کەلەکەی وەرگێڕا. نانە ڕەقەکە لە ژێرەوەی تەقەتەقی لێوە هات وەك ئەوەی ئێسکی بێ بشکێ. مێردەکەی وەخت بوو شێت ببێ. پێی گوت:

فلانەکەس، ئەوە چیتە؟

ژنەکە گوتی:

. خێرا بڕۆ تەبیبم بۆ بێنە تا نەمردووم.

کابرا چووە لای تەبیب و داوای لێکرد لەگەڵیا بچێ ژنەکەی فەحس بکا. تەبیب لەگەڵیا چوو بۆ ئەوەی ژنەکەی فەحس بکا. کە ژنەکەی دی بە کابرای گوت:

ـ دەرمانی دەردی ژنەکەت ئەوەیە سەری ماینەکەتان بېڕی و گۆشتەکەی دەرخوارد بدەی.
مێردی ژنەکە گوتی:
ـ ئەمە هەر زۆر ئاسانە !
لە دڵی خۆیدا گوتی: کە کوڕەکەم لە کن مەلا هاتەوە. لیرەیەکی دەدەمێ و ڕازی دەکەم ماینەکەی سەر بېڕین.
تەبیب ڕۆیشت. عەسرێ، کوڕەکە لە لای مەلا هاتەوە. باوکی مەسەلەکەی پێ گوت. کوڕەکە دەستی بە گریان کردو لە سەرو گوێلاکی خۆی دا. چووە لای ماینەکەو ماچی کردو پێی گوت:
ـ چ بکەم؟ دەیانەوێ سەرت بېڕن!
ماینەکە گوتی:
ـ بڕۆ بە باوکت بڵێ: باوکە، ڕازیم سەری ماینەکە بېڕی، بەڵام دەبێ ڕێم بدەی بۆ دواجار سواری بمو نەختێ لەو دەشتە سوارسوارانێ بکەم. کە تێر سواری بووم، دەیهێنمەوە. ئەوسا سەری ببڕە. کە سواری پشتم بووی دەتبەمو دەڕۆین.
کوڕەکە چووە لای باوکی و قسەکەی پێ گوت. باوکی گوتی:
ـ باشە!
کوڕەکە ماینی زین کرد. سوار بوو چووە دەرەوە بۆ دەشت و دەر. ماینەکە ڕفاندی و تێی تەقاند هەڵات. لە هەورازان هەڵکشاو لە نشێوان داکشا گەیشتنە شارێك. پێش ئەوەی بچنە ناو شار. ماینەکە بە کوڕەکەی گوت:
ـ من دەبێ بڕۆم. ها، ئەم حەفت تاڵە مووەی خۆمت بدەمێ. هەر کاتێ کەوتیتە تەنگانە، تاڵە موویەك هەڵکڕوزێنە. من دەگەمە لات.
کوڕەکە گوتی:
ـ باشە.
کوڕەکە چووە شار. دەوری بیست لیرەی پێ بوو. هەمووی خەرج کرد. ئەوسا چوو بوو بە خزمەتکاریماڵی سوڵتان. نێرگەلەی بۆ سوڵتان دادەگرت.

کوڕەکە کوڕێکی قۆز بوو. ئەو سوڵتانەیش کچێکی هەبوو. کاتێ کچەکە چاوی بە کوڕەکە کەوت، ئەشقی بوو. کچەکە هەر فەرمانێکی بە کوڕەکە بسپاردبا کوڕەکە بە پوختەیی بۆی دەکرد. ڕۆژێ، کچەکە بە کوڕەکەی گوت:

. ژنت هێناوە؟

کوڕەکە گوتی:

. نەخێر!

کچەکە گوتی:

. من دەمەوێ شووت پێ بکەم.

کوڕەکە شەوقی بۆ کچەکە بزووت و ئەشقی بوو. کچەکە ڕۆژێ چووە خزمەت باوکی و پێی گوت:

ـ باوکە ئەم کوڕە دەرگەوانە کوڕە سوڵتانە. من خۆشم دەوێ و ئەویش منی خۆش دەوێ. خوێندەواریشی هەیە. دەمەوێ شووی پێ بکەم. تکایە بە میرزا لای خۆت دایبمەزرێنە!

باوکی گوتی:

. باشە بیرێکی لێ دەکەمەوە. برۆ بانگی کە.

کچەکە چوو بانگی کوڕەکەی کرد. کوڕەکە چووە خزمەت سوڵتان. سوڵتان لێی پرسی:

تۆ کوڕی کێی؟

کوڕەکە گوتی:

من کوڕی فلانە وەزیرم!

سوڵتان وەزیری ناسی. نامەیەکی بۆ نووسی:

(ئایا ڕاستە کوڕێکت هەیە. سەری هەڵگرتووەو وڵاتی جێهێشتووە؟) بێ ئەوەی کوڕەکە پێ بزانێ نامەکەی بۆ باوکی نارد.

وەزیر وەڵامی دایەوە: بەڵێ برام، ئەوەی دەیڵێی کوڕی منە. لە دەستم هەڵاتووە. تکایە بۆمی ڕەوانە بکەوە. سوڵتان نامەکەی خوێندەوە زانی کوڕەکە ڕاست دەکا. کچەکەی خۆی لە کوڕەکە مارەکردو چەند ڕۆژێك ئاهەنگی زەماوەندی سازداو دەستی کچەکەی لە ناو دەستی کوڕەکە نا.

ڕۆژێ، کوڕەکە غەریبی ماڵەوەی هەستا. تاڵە موویەکی مایندکەی هەڵکڕوزاند. مایندکە دەلحاز گەیشتە لای و پێی گوت:

- زەماوەندت پیرۆز بێ!

کوڕەکە چووە لای سوڵتانی خەزووری و پێی گوت:

- مامە، دەمەوێ بچمەوە لای باوکم. بچمەوە وڵاتی خۆم.

سوڵتان گوتی:

- باشە، فەرموو!

ئینجا کەل و پەلی کڕی و توێشووی ڕێی بۆ ئامادە کرد. کوڕەکە و کچەکە ماڵاواییان لە سوڵتان کرد. سواری ماین بوون و ڕۆیشتن تا گەیشتنە شاری کوڕەکە. چوونە ناو شار. کوڕەکە چووەوە ماڵی باوکی و لە دەرگای دا. دەرگایان کردەوە. چووە ژوورەوە دیتی باوەژنی مردووە. زۆری کەیف هات. کوڕەکە بە خۆشی و شادی و بەختەوەری لەگەڵ ژنەکەی و لەگەڵ باوکیدا ژیا.

لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

* * *

## ٢٨ـ بولبولی هەزار

هەبوو نەبوو...

کابرایەکی بازرگان هەبوو، سێ کچی هەبوو. ڕۆژێ، کچەکان لە شانشین دانیشتبوون، کوڕی سوڵتان بەوێدا تێپەڕی و تەماشای کردن. کچەکان دەرگای قسەیان بۆ کرایەوە. یەکەم جار کچە گەورەکە گوتی:

. ئەگەر کوڕی سوڵتان بمخوازێ، نانێکی بۆ دەکەم خۆی و هەموو لەشکرەکەی لێی بخۆن و خلاسیش نەبێ!

کچی ناوەنجی گوتی:

. ئەگەر کوڕی سوڵتان بمخوازێ. قالیچەیەکی بۆ دروست دەکەم، جێی خۆی و هەموو لەشکرەکەی لە سەر ببێتەوە.

کچە بچووکەکەش گوتی:

. ئەگەر کوڕی سوڵتان من بخوازێ. کوڕو کچێکی لە من دەبێ. کوڕێکی کاکۆڵ زێڕو کچێکی کاکۆڵ زیو!!

کوڕی سوڵتان گوێی لە قسەکانیان بوو. گوتی: بەخوا ئەمە شتی چاکە!!

کوڕی سوڵتان چووەوە ماڵێ. ڕۆژی پاشی، ناردییە داخوازی کچە گەورەکە. مارەی کردو گواستییەوەو چووە پاڵی. بۆ سبەینێ، پێی گوت:

. هەستە نانەکە بکە.

کچەکە گوتی:

. زۆر چاکە تۆ بڕۆ دوو کیلۆ گەنمم بۆ بێنە.

کوڕەکـە چـوو گەنمەکـەی هێنـا. کچـەکە گەنمەکـەی هـاڕیو کردییـە ئـارد. ئاردەکەی کردە هەویرو دوو هۆقە خوێی زیاتر تێکرد. نانەکە ئەوەندە سوێر دەرچوو دەتگوت ئاگرە!! نانەکەی برژاندو بۆ لەشکری نارد.

کوڕی سوڵتان، کە ئەمەی بینی گوتی:

. ئافەرین! بە خوا ڕاستگۆیە!!

سـەربازەکان نانەکـەیان تـام دەکـرد. دەیانـدی سـوێرەو بـە دەقـە خـوێ لێـی دەگەڕان.

هـەموو لەشـکر بـە سـەر نانەکەدا ڕۆیشـت. بـە هـەموویان نانەکـەیان پـێ تـەواو نـەکرا. نانەکـە لـە جێـی خـوێ مایـەوە. کـوڕی سـوڵتان دیتـی نانەکـە بـە دەقـە خوێیەتی، گوتی: سەیرە! بەخوا دەبێ منیش لەو نانە بخۆم. نانەکەی تام کرد سەیری کرد ئەوەندە سوێرە دەڵێی ئاگرە. گوتی:

. ئەم کچە بنێرنە مدبەق با ببێ بە چێشتکەر.

ڕۆژی پاشی، ناردییە خوازبێنی کچی ناوەنجی. هێنایو چووە پالی. بەیانی پێی گوت:

. هەستە قالیچەکە دروست بکە!

کچەکە گوتی:

. ئەو قاڵیچەیە دوو ساڵی دەوێ تا دروستی دەکەم. بۆ چیتە؟!

کوڕی سوڵتان گوتی:

. ئەم کچەیش ڕەوانەی مدبەق بکەن. با لەگەڵ خوشکی چێشتکەریی بکا. دوای هەفتەیەك، ناردیە هەجبینی کچی گچکەو هێنایو بەیانی پێی گوت:

. کوا ئەو کوڕو کچەی بەڵێنت دابوو؟!!

کچەکە پێی گوت:

. بەم دەمو دەستە چۆن دەبێ؟ ڕاوەستە با سکم ببێو سکەکە دابنێم. ئەوسا کوڕو کچەکەم دەبێ.

کوڕەکە گوتی:

- باشە، با بزانین!

کچی گچکە بە خۆشبەختی لای کوڕی سوڵتان مایەوە. کەچی دوو خوشکەکەی تر خزمەتیان دەکردو خواردنیان بۆ دەهێناو بەخیلیان پێ دەبرد. ژنەکە حەفت مانگی ژمارد. دوو ڕۆژ مابوو منداڵی ببێ، دوو خوشکەکەی زانییان پاش دوو ڕۆژی دی منداڵی دەبێ، چوونە لای مامانو پێیان گوت:

- داپیرە، ها، بگرە ئەمە بیست لیرە. بەیانی دوو گوجیلە سەگ لەگەڵ خۆت ببە بڕۆ لای خوشکەکەمان. کە خوشکەکەمان کوڕو کچێکی بوو. منداڵەکان هەڵگرەو دوو گوجیلەکەی لە بن دابنێ. ئێمەش بڵاو دەکەینەوە دەڵێین: خوشکمان دوو گوجیلە سەگی بووە.

مامان گوتی:

- باشە!

ژنەی دوو گیانی کوڕی سوڵتان کەوتە بەر ژانی منداڵبوون. کوڕی سوڵتان چووە قاوەخانە. لە دوو مامانیان نارد. مامان هات. ژنەکە سکەکەی دانا کوڕو کچێکی بوو. ئەوەندە جوان بوون دڵت نەدەهات تەماشایان بکەی! گەورەیی بۆ ئەو خودایە باشە کە دروستی کردوون! کچەکە بە دەم ژانو ئازاری خۆیەوە دەتلایەوەو گینگڵی دەدا، ئاگای لێنەبوو خوشکەکانی دوو گوجیلەیان لەبن دانا و کوڕو کچەکەیان بردو لە دەنگیان دا، گوتیان:

- ژنی سوڵتان دوو گوجیلە سەگی بووە.

سوڵتان هاتەوە چوون پێیان گوت:

- ژنەکەت دوو گوجیلە سەگی بووە. گوتی:

- بڕۆن فڕێی دەنە بەندیخانەو ڕۆژێ تەنیا یەك پارووە نانی بدەنێ.

مامان دوو منداڵەکەی برد لە ناو سندووقێکی نانو سندووقەکەی فڕێ دایە ناو دەریا. سندووقەکە نقووم نەبوو. لەسەر ئاو دەگەڕا ماسیگرێك تۆڕی هاوێشتبوو ماسی دەگرت. سندووقەکە کەوتە ناو تۆڕی ماسیگرەکە. ماسیگرەکە سندووقەکەی دەرهێناو کردییەوە دیتی کوڕو کچێکی تێدایە بە ئازاری دەخنێنەوەو دەمکێنەوە. لە ناو سندووقەکە دەوروبەریان هەمووی زێڕە. منداڵەکانی بردەوە ماڵێ و مەسەلەکەی بۆ ژنەکەی گێڕایەوە. منداڵەکان

هەموو ڕۆژێ کیسە زێڕیکیان لە بن سەری بوو. منداڵەکان گەورە بوون و تەمەنیان گەیشتە دوازدە ساڵی. چوون خانوویەکیان لە تەنیشت ماڵی سوڵتانی باوکیان کڕی. ماڵی سوڵتان بیستیان دراوسێیەکیان هاتووە، خوشك و برایەکن. پوورێکی منداڵەکان (خوشکێکی دایکیان) چووە ماڵی منداڵەکان دیتی لەسەر خواردن بوون. ئەوەندە جوان بوون دەتگوت مانگی چواردەن. پێی گوتن:

- ئێوە کێن؟

گوتیان:

- ئێمە خوشك و براین.

ژنەکە لێی پرسین:

- خەڵکی کوێن؟

کوڕەکە گوتی:

- خۆیشمان نازانین. ماسیگرێك ئێمەی لە ناو دەریا گرتبووەوە و بە خێری خۆی بەخێوی کردبووین.

پوورەکەیان کە ئەمەی بیست، وەخت بوو شێت بێ. ڕایکرد بۆ لای خوشکەکەی تری و پێی گوت:

- دوو منداڵەکەی خوشکمان ماون و نەمردوون. هاتوونەتەوە، دەترسم باوکیان بیانناسێتەوە و بە مەسەلەکە بزانێ. ئەو حەلە هەر دەمانکوژێ. هەستە بڕۆ لای داپیرە. بەڵکو ئەو چارەیەکمان بکا.

ژنەکە بانگی داپیرەی کرد و هەقایەتەکەی بۆ گێڕایەوە. داپیرە گوتی:

- هیچ مەترسن! وا دەکەم کچەکە برای بە دوای شتێکدا بنێرێتە ڕێگایەکی وا چوونی هەبێ و هاتنەوەی نەبێ.

داپیرە چووە لای منداڵەکان. کە چوو، کوڕەکە تازە چووبووە دەرەوە بۆ قاوەخانە. داپیرە، کە چاوی بە کچەکە کەوت، گوتی:

- (اللهم صلی علی محمد)! ئای خوایە لەم ماڵە خۆشە! ماڵی وا خۆش نییە! ئەم ماڵە تەنیا لە یەك شتی کەمە.

کچەکە گوتی:

- لە چی کەمە داپیرە؟

داپیرە گوتی:

. لە دارهەنارێکی کەمە کە سەما دەکا و گەڵاکانی چەپڵە لێ دەدەن.

کچەکە گوتی:

. داپیرە، ئەوەی دەڵێی لە کوێ هەیە؟

داپیرە گوتی:

. لەو دیوی حەفت دەریایە. کە برات هاتەوە، زۆری لێ بکە بچێ بۆت بێنێ.

داپیرە نەختێ لەوێ مایەوە و چووەوە. ئێواری برای کچەکە هاتەوە. ئەو برایە خوشکی خۆی زۆر خۆش دەویست. کە هاتەوە، دیتی خوشکی پەست و عادزە. پێی گوت:

. خوشکم ئەوە چیتە؟

خوشکی پێی گوت:

- ڕاستە تۆ ئەم خانووەت بۆ دروست کردووم. بەڵام دەمەوێ دارهەنارێکی تێدابێ سەما بکا و گەڵاکانی چەپڵە لێبدەن. کوڕەکە گوتی:

. ئەمە لە کوێ دەست دەکەوێ.

کچەکە گوتی:

. لەو دیوی حەفت دەریا.

کوڕەکە گوتی:

. هەستە توێشووی ڕێگام بۆ ئامادە کە.

کچەکە هەستا توێشووی ئامادە کرد. کوڕەکە ملی ڕێی گرت و ڕۆیشت. لە هەورازان هەڵکشا و لە نشێوان داکشا گەیشتە پیرەمێردێک لە چەقی ڕێگا دانیشتبوو. سەلامی لێ کرد. پیرەمێرد سەلامی لێ وەرگرتەوە و پێی گوت:

. ئۆغر بی؟! کوڕم!

کوڕەکە گوتی:

- بە خوا مامە، لەو هەنارە دەگەڕێم کە خۆی سەما دەکات و گەڵاکانی چەپڵە لێدەدەن.

پیرەمێرد گوتی:

ـ کورِم، بە گویم دەکەی دەگەڕێیتەوە. ئەو کەسەی ئەم قسەیەی پیٚ گوتی دوژمنی تۆیە.
کوڕەکە گوتی:
ـ خوشکم داوای لێکردووم، ناتوانم بگەڕێمەوە. ناکریٚ بە دەست بە تاڵی بگەڕێمەوە.
پیرەمێرد پێی گوت:
ـ لێرە بڕۆ دەگەیتە جێگایەك هەمووی چڕەدووکەڵە. چاوت بنووقێنەو مل لەو چڕەدووکەڵە بنیٚ. کە دووکەڵەکەت بڕی دەگەیتە دەڵە دێوێك دەستاڕ لێدەکا. پەلاماری بدەو مەمکی بمژەو ئاردی هەڵلووشە! ئەو ڕێنماییت دەکا.
کوڕەکە قسەی پیرەمێردی وەرگرت و هەستا ڕۆیشت. لە هەورازان هەڵکشا و لە نشێوان داکشا. گەیشتە چڕەدووکەڵەکە چاوی قووچاندو ملی پێوەنا. کە لە چڕەدووکەڵەکە دەرچوو، دەڵە دێوەکەی دی پەلاماری داو مەمکی مژی و ئاردەکەی هەڵلووشی. دەڵە دێوەکە پێی گوت:
ـ تۆ تازە بوویتە کوڕی من. فەرموو، بڵیٚ چت دەویٚ؟
کوڕەکە گوتی:
ـ ئەو هەنارەم دەویٚ کە سەما دەکا و گەڵاکانی چەپڵە لێدەدەن.
دەڵە دێوەکە گوتی:
ـ کوڕم، دەترسم پێت نەییٚ.
کوڕەکە گوتی:
ـ خوا یاربیٚ دەیهێنم!
دەڵە دێوەکە گوتی:
ـ هەندیٚ لۆکە ببەو بڕۆ دەگەیتە بەردەگای کۆشکێك. دەرگاکە هەندیٚ زەنگوڵی پێدا هەڵواسراوە. لۆکە لە ناو زەنگوڵەکان بنیٚو دەرگاکە بکەوەو بڕۆ ژوورەوە. چل دێو دەبینی خەوتوون. بڕۆ سەلال و هەنارەکان لەدار بکەوەوەو وەرەوە. لیٚ مەگەڕیٚ کەس هەستت پیٚ بکا.
کوڕەکە گوتی:
ـ باشە!

کوڕەکە هەندێ لۆکەی بردو ڕۆیشت. چوو هەنارەکەی هێناو بەلای دێوەکەدا هاتەوە. دەڵە دێوەکە گوتی:

. پەیدات کرد؟

کوڕەکە گوتی:

. بەڵێ

دەڵە دێوەکە گوتی:

. بڕۆ خوات لەگەڵ! زۆر بە خێر هاتی کوڕم!

کوڕەکە ڕۆیشت تا گەیشتە لای پیرەمێردەکەو پێی گوت:

. مامە پەیدام کرد.

پیرەمێرد گوتی:

. بە ڕاست؟

کوڕەکە گوتی:

. ئەرێ بەخوا!!

لەولایش کاتێ کچەکە دیتی برای دواکەوت، دەستی بە گریان کرد. دوو باوەژنەکەی، کە پووری خۆی بوون، گوێیان لێبوو، گوتیان:

. دیارە کوڕەکە مردووە.

لە خەنی خۆشییان پێیان نەدەگەیشتە عەردی! ئەو ڕۆژەیان بەلاوە وەکوو ڕۆژی زەماوەند وابوو. کوڕەکە مالاوایی لە پیرەمێردەکە کردو ڕۆیشت. گەیشتەوە شاری خۆیان. چووەوە ماڵێ و لە دەرگای دا. خوشکی گوتی:

. کێیە؟

گوتی:

. منم.

کچەکە گوێی لە دەنگی برای بوو. شاگەشکە بوو. هەستا دەرگای کردەوەو برای ماچ کرد.

ڕۆژی پاشی، هەنارەکەیان لەسەر مێز دانا. هەنارەکە دەستی پێ کرد، ئەو سەمای دەکردو گەلاکانیش چەپڵەیان لێدەدا.

بەیانی کوڕەکە چووە دەرەوە بۆ قاوەخانەو خوشکی ڕاسپاردو گوتی:

ـ خوشکم، بۆ فراوین کفتەمان بۆ لێ بنێ. ئینجا چووە دەرەوە. کە ئەو چووە دەرەوە دوو باوەژنەکەی (پوورەکانی خۆی) چاویان پێکەوت. پەنجەی خۆیان گەست و گوتیان:

ـ ئای خوایە! چووە ئەو ڕێگایە پڕ مەترسییە بە سەلامەتیش هاتەوە.

چوونە لای پیرەژن و پێیان گوت:

ـ داپیرە، وەرە سەیرکە! ئەو کوڕە بە سەلامەتی هاتۆتەوە.

داپیرە چووە ماڵی کوڕەکە. دیتی هەنارەکە سەما دەکاو گەڵاکانی چەپڵە لێدەدەن. گوتی:

ـ ماشاڵڵا!!ماشاڵڵا! لەو موعجیزەیە!! بەڵام کچم، ئێوە لە شتێکی ترتان کەمە؟

کچەکە گوتی:

ـ لە چیمان کەمە داپیرە!

گوتی:

ـ لە (بولبولی هەزار)تان کەمە. لە سەر چڵی دار هەنارەکە هەڵنیشێ و هەنارەکە سەما بکا. گەڵاکانی چەپڵە لێ بدەن.

کچەکە گوتی:

ـ بەخوا ڕاستە داپیرە! باشە ئەم (بولبولی هەزار)ە لە کوێ دەست دەکەوێ.

پیرەژن گوتی:

لەودیوی حەوت دەریا.

داپیرە ئەمەی گوت و ماڵاوایی کرد و ڕۆیشت.

دوای نیوەڕۆ، کوڕەکە چووەوە دیتی خوشکی پەست و غەمبار و کز و داماوە. پێی گوت:

ـ خوشکم، بۆچی وا پەست و داماوی؟

گوتی:

ـ هەنارەکەمان (بولبولی هەزار)ی کەمە.

برای گوتی:

ـ باشە (بولبولی هەزار) لە کوێ دەست دەکەوێ؟

کچەکە گوتی:

- لەو دیوی حەوت دەریا

برای گوتی:

- هەستە توێشووی ڕێم بۆ ئامادە کە!

کچەکە توێشووی ڕێی بۆ ئامادە کرد.

برای ڕۆیشت. لە هەورازان هەڵکشا و لە نشێوان داکشا، گەیشتەوە لای پیرەمێردی گۆڕین. پیرەمێرد کە چاوی پێکەوت، گوتی:

- ها، کوڕم! چۆنە هاتیتەوە؟

کوڕەکە گوتی:

- بەخوا چت لێ بشارمەوە! لە (بولبولی هەزار) دەگەڕێم!

پیرەمێرد گوتی:

- کوڕم، بە قسەی مامی خۆت دەکەی دەگەڕێیتەوە! تا هەنارەکەت پەیداکرد تووشی چ مەترسی و دەردەسەرییەك بووی! (بولبولی هەزار)ت بە ئاسانی دەست ناکەوێ.

کوڕەکە گوتی:

- چارە نییە هەردەبێ پەیدای بکەم! خوا حافیز مامە!

کوڕەکە هەیبیەی لێکرد و ڕۆیشت. هەر ڕۆیشت و ڕۆیشت تا گەیشتە دەڵە دێوەکە. کە دەڵە دێوەکە چاوی پێکەوت، گوتی:

- بە خێر بێی! بە خێر بێی! خێرە هاتووی!؟

کوڕەکە گوتی:

- هاتووم لە (بولبولی هەزار) دەگەڕێم.

دەڵە دێوەکە گوتی:

- بۆ چیتە؟ دەترسم سەرت بخوا!

کوڕەکە گوتی:

- باکم پێی نییە! سەرم دەخوا با بخوا! سەرێکە هێناومەو نایبەمەوە.

دەڵە دێوەکە گوتی:

- لێرە بڕۆ دەگەیتە کۆشکێك درەختێکی کەتەو پان و پۆڕو بەرزی تێدایە. بولبولەکە لەسەر ئەو درەختەیە. بەڵام تۆ مەچووە ناو کۆشکەکە. لە پشت

دەرگاوە سەیری بکە. ئەگەر (بولبولی هەزار) تۆی نەویٚ، بە کوشتن دەچی. دێوەکانت لیٚ ئاگادار دەکاتەوە، لێت دەردەپەڕن و زیوار بە زیوارت دەکەن. کوڕەکە پشت بە خوا ڕۆیشت تا گەیشتە کۆشکەکە. سەیری درەختەکەی کرد دیتی (بولبولی هەزار)ی لە سەرە. کە بولبولەکە چاوی پێکەوت، لەسەر درەختەکەی هەڵفڕی چوو لەسەر دەستی کوڕەکە نیشت و دەستی بە چەهچەهە کرد. کاتیٚ کوڕەکە بولبولەکەی لەسەر دەستی خۆی بینی، هەر ڕایکرد بردی گەیشتەوە لای دەڵە دێوەکەو پێی گوت:

- هێنام!

دەڵە دێوەکە گوتی:

- پیرۆز بیٚ!

کوڕەکە لەویٚ ڕۆیشت گەیشتەوە لای پیرەمێردی گۆڕین. کاتیٚ پیرەمێرد چاوی پێکەوت، گوتی:

- ها، پەیدات کرد؟!

گوتی:

- بەڵیٚ ئەوەتانیٚ.

پیرەمێرد گوتی:

- بڕۆ خێری تێدابیٚ کوڕم!

کوڕەکە ڕۆیشت گەیشتەوە ماڵیٚ. لە دەرگای دا خوشکی گوتی:

- کێیە؟

گوتی:

- منم!

کچەکە گوێی لە دەنگی برای بوو، هەر ڕایکرد چوو دەرگای کردەوە. باوەشی بە برایدا کردو ماچی کردو پێی گوت:

- برام هێنات؟

گوتی:

- بەڵیٚ.

کوڕەکە (بولبولی هەزار)ی لە سەر هەنارەکە دانا. بولبولەکە دەستی بە چەهچەهە کردو چریکەی گۆرانی بەرز بووەوە. تومەز بولبولەکە منداڵە جنۆکەیەو بە هەقایەتی کوڕو کچەکە دەزانیٚ. ڕۆژیٚ، کوڕی سوڵتان لە ماڵەوە چووە دەریٚ، گوێی لە چریکەی (بولبولی هەزار) بوو. زۆری کەیف پیٚ هات. چووە ماڵیٚ بە دوو ژنەکەی گوت:

- ئەم دراوسێیانە خەڵکی کوێن؟ دەمەویٚ داوەتیان بکەم.

کاتیٚ دوو ژنەکە ئەمەیان بیست، وەخت بوو لە خەفەتان بمرن. لە بەینی خۆیانەوە گوتیان:

- ئەگەر کوڕەکەی داوەت کرد، ژەهری بۆ لە ناو خواردن دەکەین.

کوڕی سوڵتان نامەیەکی بۆ کوڕەکە نووسی و گوتی:

- پێم خۆشە بەیانی بێی قاوەیەك بە یەکەوە بخۆینەوە. ئەمە مانای ئەوە بوو داوەتی کردووە. کوڕەکە نامەکەی خوێندەوە، ڕازی بوو بچیٚ. نامەکەی بۆ خوشکی خوێندەوە. (بولبولی هەزار) گوێی لێبوو. کە گوێی لیٚ بوو، خۆی خستە سەر شکڵی مرۆڤ و بە کوڕەکەی گوت:

- جەناب، ئەگەر بچی ژەهرت بۆ لە خواردن دەکەن! ئەگەر چووی پشیلەیەك لەگەڵ خۆت ببە. یەکەم جار پاروویەك فڕیٚ دە بەر پشیلەکە. ئەگەر خواردی و پیٚ تۆپی، تۆ خواردنەکە مەخۆ. خێرا هەستە وەرە.

کوڕەکە گوتی:

- باشە وا دەکەم!

ڕۆژی پاشی، بەرەبەری ڕۆژئاوا، کوڕەکە جلی خۆی گۆڕی. چووە ماڵی سوڵتان دانیشت. خواردن هات. پاروویەکی هەڵگرت و فڕێی دایە بەر پشیلەکەی. پشیلەکە خواردی و یەکسەر ئاوسا و تۆپی. کوڕەکە ئەمەی بینی و یەکسەر هەستا و ڕۆیشت. کوڕی سوڵتان لە خۆی تەریق بووەوە. بانگی دوو ژنەکەی کردو گوتی:

- پێم بڵێن ئەمە چییە؟ ئەمە شتێکی تێدایە دەبیٚ پێم بڵێن.

ئەوسا لە دوو کوڕەکەی نارد. گوتیان:

- کوڕی سوڵتان تۆی دەویٚ.

گوتی:

- نایەم.

(بولبولی هەزار) پێی گوت:

- بڕۆ، منیش لە گەڵتا دێم.

کوڕەکە چووە لای کوڕی سوڵتان و پێی گوت:

- چت دەوێ؟ ویستتان بمکوژن و دیسان لە دووم دەنێری؟!

کوڕی سوڵتان گوتی:

- دەمەوێ بزانم مەسەلە چییە؟ پێم بڵێ ئەوەی ڕوویدا لە سوێنگەی چی بوو؟

کوڕەکە گوتی:

- بەخوا نازانم من کابرایەکی لایدەم. چوزانم چ شتێ لە ماڵی تۆ ڕوودەدا.

(بولبولی هەزار) گوتی:

- ڕوخسەتم بدەن من بۆتان باس بکەم.

گوتیان:

- فەرموو، باس بکە.

(بولبولی هەزار) گوتی:

- جەنابی کوڕی سوڵتان، بەر لە هەموو شتێ دوو ژنەکەت و داپیرەکە فڕێ دە زیندان.

کوڕی سوڵتان سەری لەم قسەیە سوڕما و گوتی:

- بۆچی؟ مەسەلە چییە؟

لە دوو داپیرەی نارد و لەگەڵ دوو ژنەکەی لە ناو کۆشك بەندی کردن و گوتی:

- ماوەیان بدەن لە پەنجەرەوە تەماشای (بولبولی هەزار) بکەن و گوێیان لە قسەکانی بێ.

ئینجا (بولبولی هەزار) دەستی بە گێڕانەوەی هەقایەتەکە کرد و گوتی:

(کوڕی سوڵتان، گوێ بگرە هەقایەتێکت بۆ بگێڕمەوە: بازرگانێك هەبوو، سێ کچی هەبوو. ڕۆژێ، کچەکان لە شانشین دانیشتبوون، کوڕی سوڵتان بەوێدا تێپەڕی، کچە گەورەکە گوتی: ئەگەر کوڕی سوڵتان بمخوازێ نانێکی بۆ دەکەم خۆی و هەموو لەشکرەکەی لێی بخۆن و خلاسیش نەبێ! کچی ناوەنجی گوتی:

ئەگەر کوڕی سوڵتان بمخوازێ، قالیچەیەکی بۆ دروست دەکەم، جێی خۆیو هەموو لەشکرەکەی لەسەر ببێتەوە. کچە بچووکەکەش گوتی: ئەگەر کوڕی سوڵتان من بخوازێ، کوڕو کچێکی لە من دەبێ. کوڕێکی کاکۆڵ زێڕو کچێکی کاکۆڵ زیو!!

کوڕی سوڵتان گوێی لە قسەکانیان بوو. ڕۆژی پاشی ناردییە داخوازی کچە گەورەکەو هێنای بۆ سبەینێ پێی گوت: هەستە نانەکە بکە. کچەکە گوتی: زۆر چاکە تۆ بڕۆ دوو کیلۆ گەنمم بۆ بێنە. کوڕەکە چوو گەنمەکەی هێنا. کچەکە گەنمەکەی هاڕیو کردییە ئارد. ئاردەکەی کردە هەویرو هەویرەکەی کردە نانو دوو هۆقە خوێی تێکرد. خەبەری بۆ لەشکر نارد بێن نانەکە بخۆن. هەر سەربازێك دەهات نانەکەی تام دەکرد دەیدی سوێرەو نەیدەخوارد تا هەموو تەواو بوون. کوڕی سوڵتان دیتی ئەم نانە بەشی هەموو لەشکری کرد، لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەمە شتێکی چاکە با منیش ئەم نانە تام بکەم. کە تامی کرد دیتی زۆر سوێرەو ناخورێ. گوتی: ئەم ژنە بنێرنە مدبەق!)

کوڕی سوڵتان، کە ئەم قسەیەی (بولبولی هەزار)ی بیست، پەنجەی خۆی گەستو گوتی:

– ئێی (بولبولی هەزار)!

(بولبولی هەزار) بەردەوام بوو:

کوڕی سوڵتان، هەقایەتەکەت بۆ تەواو دەکەم:

( ڕۆژی پاشی، کوڕی سوڵتان ناردییە خوازبێنی کچی ناوەنجیو چووە پاڵیو بۆ بەیانی پێی گوت: هەستە قالیچەکە دروست بکە! کچەکە گوتی: ئەو قاڵیچەیە دوو ساڵی دەوێ تا تەواوی دەکەم، بۆ چیتە؟! کوڕی سوڵتان ئەویشی ناردە مدبەق.

دوای سێ ڕۆژ، کوڕی سوڵتان ناردییە هەجبینی کچی گچکەو هێنای. کە دایکی ئەم کوڕە ئەم کچەیە!!!)

کوڕی سوڵتان ئەم قسەیەی بیستو گوتی:

. بەڵێ؟ کوڕی سوڵتان منداڵەکانی ناسی.

(بولبولی هەزار) گوتی:

( کە کوڕی سوڵتان کچە بچووکەکەی خواستو چووە کنی، بۆ بەیانی پێی گوت: کوا ئەو کوڕو کچەی کە بەڵێنت دابوو؟ کچەکە گوتی: بەم دەم و دەستە چۆن دەبێ؟ ڕاوەستە با سکم ببێو سکەکە دابنێم. ئەوسا کوڕو کچەکەم دەبێ. شتەکە بە دەستە خۆم نییە. کوڕی سوڵتان گوتی: باشە با بزانین.
کچەکە بە سەربەرزی لای کوڕی سوڵتان مایەوە. ئەو دوو خوشکەی لە مدبەق کاریان دەکردو بەخیلیان پێ دەبرد. کە ژنەکە هاتە سەر مانگو ڕۆژی خۆی، دوو خوشکەکەی چوونە لای مامانو پێیان گوت: داپیرە، ها، بگرە ئەم بیست لیرەیە. بەیانی دو گوجیلە سەگ لە گەڵ خۆت ببە. بڕۆ لای خوشکەکەمان. کە خوشکمان کوڕو کچەکەی بوو، منداڵەکان هەڵگرەو دوو گوجیلەکەی لە بن دابنێ. ئێمەش بڵاوی دەکەینەوە دەڵێین: خوشکمان دوو گوجیلە سەگی بووەو کوڕ و کچەکەی لێ دەستێنین. لە دوو مامانیان نارد. مامان هات. بۆ یارمەتی منداڵبوونی کچەکە. کچەکە سکەکەی دانا. کوڕو کچێکی بوو. کوڕێکی کاکۆڵ زێڕو کچێکی پەرچەم زیو. پیرەژن هەردووکی بردن لە ناو سندووقێکی نانو سندووقەکەی فڕێ دایە ناو دەریاو دوو گوجیلە سەگی لە بن ژنەکە دانا.
بڵاویان کردەوە کە ژنی سوڵتان دوو گوجیلە سەگی بووە. کوڕی سوڵتانیش ئەمری کرد ژنەکە بخەنە زیندان کە دایکی ئەم دوو منداڵەیە. دوو منداڵەکە لە ناو سندووق بوون. سندووقەکە نقووم نەبوو، لەسەر ئاو گەڕا تا ماسیگرێك تۆڕی هەڵکردەوەو سندووقەکە کەوتە ناو تۆڕەکەی. تۆڕەکەی ڕاکێشایەوە، سندووقەکەی دەرهێناو کردییەوە دیتی کوڕو کچێکی تێدایە گڕوگاڵ دەکەنو یاری دەکەن. بە کاری خوای ماسیگرەکە دیتی سندووقەکە پڕە لە زێڕو زیوە. منداڵەکانی بردەوە ماڵێو بە خێوی کردن. ئەو دوو منداڵە هەموو ڕۆژێ زێڕو زیویان لێ هەڵدەوەرا. ماسیگرەکە زۆر دەوڵەمەند بوو. ڕۆژێ، ماسیگرەکە مردو کوڕو کچەکە هاتنە ناو خانوویەکی دراوسێی تۆ. ئەم کوڕە کوڕی تۆیە. کچەکەی خوشکیشی کچی تۆیە. دوو ژنەکەت ویستیان بە فێڵێك ژەهریان دەرخوارد بدەن).
کوڕی سوڵتان باوەشی بە کوڕەکەی داکردو ماچی کرد. هامێزی لە کچەکەی وەرهێناو ماچی کرد. ئینجا جارچی ناردە ناو شار پێی گوت جاڕ بدا

هەرکەسێ کوڕی سوڵتانی خۆش دەویٚ و پێی ڕازییە با داری قەلاشکەری کۆ کاتەوەو بۆی بێنێ. داریان کۆکردەوەو نەفتیان پێداکردو ئاگریان تێبەرداو دوو ژنەکەو داپیرەیان سووتاند. ئینجا کوڕی سوڵتان ناردی ژنەکەی، کە دایکی دوو منداڵەکە بوو، لە زیندان دەری بێنن. ژنەکەیان بردە حەمامو شووشتیانو پاکیان کردەوە. کوڕی سوڵتانو ژنەکەیو دوومنداڵەکەیو (بولبولی هەزار)و هەنارەکە بە خۆشیو سەلامەتی مانەوە.

لای ئێوەبووینو هاتینەوە.

****

## ٢٩ـ کچە بەقاڵ

هەبوو نەبوو...

کابرایەکی بەقاڵ هەبوو، کچێکی هەبوو. کچێکی زۆر جوان بوو! کوڕی سوڵتان چاوی پێکەوت و ئەشقی بوو و گەڕی پێگرت. کچە پێڵاوێکی لێدا. کوڕەکە پەنجەی خۆی گەست و گوتی:

. بەخوا دەبێ ئەم کچە بخوازم. بیهێنم و پاشان بەرەڵای بکەم.

کوڕەکە چووە لای دایبابی و پێی گوتن:

– دەمەوێ کچی ئەم بەقالە بێنم.

باوکی زۆر دەوڵەمەند بوو. کە کوڕەکە نیازی خۆی بە دایبابی گوت، پێیان گوت:

. شتی وا چۆن دەبێ؟ ئەوان بەقاڵن. تۆ کوڕە سوڵتانی، چۆن ئەو کچە دێنی؟

کوڕەکە گوتی:

. هەر دەیهێنم!

دایکی چووە ماڵی بەقاڵەکە. دراوسێی ماڵ بە ماڵیوە بوون. ماڵی بەقاڵەکە، کاتێ دیتیان ژنی سوڵتان هات، هەموو لەبەری هەستان و چوونە پێشوازی و جێیان بۆ دانا. ژنی سوڵتان بە دایکی کچەکەی گوت:

. هاتووم کچی خۆتان بدەنە کوڕی من.

باوکی کچەکە پێی گوت:

. خانم، ئێوە ماڵە سوڵتانن، چۆن بە کچی من ڕازی دەبن‌و داوای دەکەن؟
بەڵام کچەکە بە باوکی گوت:
. باوکە، تکایە ڕازی بە!
باوکی ڕازی بوو.
ڕۆژی پاشی، ماڵی سوڵتان پارەی مارەییان هێناو کەس‌و کاری کچەکە جیازیان کڕی‌و بردیانە ماڵی سوڵتان. بووکیان گواستەوەو نیوەشەو کوڕەکە چووە کن کچەکەو لەگەڵیا نووست. ئینجا تفێکی لە دوڕ چاوی کردو گوتی:
. کچە بەقاڵ، لەگەڵ چێشتکەرەکان برۆ مدبەق.
کچەکە هەستا جلی بووکێنی داکەندو چووە مدبەق بۆ ئەوەی چێشت لێ بنێ. خەسووی ژوورێکی دایە کچەکە دیواری بە دیواری ماڵی باوکییەوە بوو. کچەکە دەرگایەکی لە ماڵی باوکی کردەوە، چی ڕوویدا بوو بۆ دایکی گێڕایەوە. ئەو کچە بەقاڵە (دە) دۆتامی هەبوو. ڕۆژێ، کچەکە دیتی ماڵی سوڵتان پەشۆکاون. هەموو مقۆمقۆو گوێکوڕ گویکوڕیانە. پرسی:
. ئەوە بۆچی ماڵی سوڵتان پەشۆکاون؟ بۆچی پەست‌و غەمبارن؟
پێیان گوت:
. سوڵتان لەگەڵ قراڵی فەرەنگ تووشی شەڕ هاتووە.
کچەکە پرسی:
. کێ دەچێتە شەڕی دوژمن؟
گوتیان:
. کوڕی سوڵتان، کە مێردی خۆتە!
کچەکە پرسی:
. کەی بەڕێ دەکەون؟
گوتیان:
. ڕۆژی شەممە.
کچی بەقاڵ چووە لای باوکی‌و گوتی:
. باوکە (دە) خیوەتم لە تۆ دەوێ. هەر خیوەتی لە ڕەنگێک!

ئینجا دەستە بەرگێکی پیاوانی کردە بەر. هەر(دە) دۆتمامی لەگەڵ خۆی برد. ئەوانیش یەکەو دەستەبەرگی پیاوانیان کردەبەر. ڕۆژێ پێش دەرچوونی کوڕی سوڵتان، چوونە دەرەوە. خیوەتیان لەسەر ڕێی کوڕی سوڵتان هەڵدا. ڕۆژی شەممە کوڕی سوڵتان بە خۆیو بە لەشکرەوە چووە دەرەوە. خیوەتەکانی کچی بەقاڵو دۆتمامەکانی دیو گوتی:

. ئەمە چییە؟

خەبەری بۆ خاوەنی خیوەتەکان ناردو گوتی:

. ئێوە کێن؟و سەرکردەتان کێیە؟

کچەکە خەبەری دایەوەو گوتی:

. من کوڕی سوڵتانی مەغریب زەمینم.

کوڕەکە لە دڵی خۆیدا گوتی: دیارە بێجگە لە باوکم سوڵتانی تریش لە دونیادا هەیە!

ڕۆژی پاشی، لەگەڵ قراڵی فەرەنگ گەیشتنە ڕێکەوتو ئاشتی بەرقەرار بوو. کوڕی سوڵتان خەبەری ناردو گوتی:

. بە کوڕی سوڵتانی مەغریب زەمین بڵێن تەشریفی بفەرمویٚ میوانی من من.

قاسید چوو خەبەری دایە کچەکە. کچەکە شادو گوشاد بوو. گوتی:

. باشە دێمە دیداری!

ئێوارێ، کچەکە چووە لای کوڕی سوڵتانو شیوی ئێوارەی لەلا خوارد. کە تەواو بوون بە کوڕی سولتانی گوت:

. وەرە یاری شەترەنج بکەین. ئەگەر تۆ لێت بردمەوە، من قەرەواشی خۆمت بۆ دەنێرم لەگەڵی ڕابوێرەو ئەگەر منیش لە تۆم بردەوە دەبێ تۆ قەرەواشی خۆتم بدەیتێ. کوڕەکە گوتی:

. باشە.

دەستیان بە یاری کرد. کچەکە بە ئەنقەست دۆڕاندییە کوڕی سوڵتان. کچەکە گوتی:

. دەچم هەر ئێستا قەرەواشی خۆمت بۆ دەنێرم.

گەڕایەوە ناو خیوەتی خۆی. جلی ژنانەی خۆی کردە بەرو خۆی ئارایشداو چووە لای کوڕی سوڵتان‌و تا بەیانی لەگەڵیا نووست. کچەکە سەعاتەکەی لە کوڕەکە دزی‌و گەڕایەوە شوێنی خۆی. خیوەتەکانیان پێچایەوەو گەڕایەوە لای کەس‌و کاری خۆی. کچەکە سکی لە کوڕی سوڵتان بوو، کە مێردی خۆی بوو، کوڕێکی بوو دەتگوت مانگە!

دوای چەند مانگێك، شەڕ لە بەینی سوڵتان‌و هەندێ عارەبی کۆچەری هەڵگیرسا. کچەکە لەو کارەکەرەی پرسی کە لە مدبەق لەگەڵیا بوو، گوتی:

. ئەوە چ قەوماوە؟

کارەکەرەکە گوتی:

. شەڕە لەگەڵ عارەبی کۆچەری.

کچەکە پرسی:

. کێ دەچێتە ئەو شەڕە؟

کارەکەرەکە گوتی:

. کوڕی سوڵتان، کە مێردی خۆتە.

کچەکە پرسی:

. کەی بە ڕێ دەکەون؟

کارەکەرەکە گوتی:

. ڕۆژی دووشەممە.

کچی بە قاڵ چووە لای باوکی‌و پێی گوت:

. باوکە، (دە) خیوەتم لە تۆ دەوێ. لە ئاوریشمی سوورو سەوزو زەرد!

باوکی خیوەتەکانی بۆ ئامادە کرد. کچەکە بە خۆو بە دۆتمامەکانی چوون. هەموو بەرگی پیاوانیان کردە بەرو خیوەتیان بردو لە دەرەوە، لە سەر ڕێی کوڕی سولتان هەڵیان دا. پاش چەند ڕۆژێ، کوڕی سوڵتان بە خۆو بە هەموو لەشکرەوە چووە دەرەوە. دیتی چەند خیوەتێك هەڵدراوە وەك زێڕ دەبریقێنەوە. گوتی:

. ئەم خیوەتانە هی کێن؟

گوتیان:

- ئەمانە خیوەتی کوڕی سوڵتانی مەغریب زەمینن.
گوتی:
- بڕۆن داوەتی بکەن.
کە کچەکەیان داوەت کرد. کچە چووە لای کوڕی سوڵتان. بێگومان بەرگی پیاوانی لەبەر بوو. کوڕی سوڵتان بە خێری هێناو شیویان خوارد. ئینجا کچەکە پێی گوت:
- وەرە یاری شەترەنج بکەین.
کوڕەکە گوتی:
- باشە، وەرە یاری بکەین!
گرەویان کرد: ئەگەر کچەکە بردییەوە قەرەواشی کوڕی سوڵتان بۆ خۆی ببا و ئەگەر کوڕی سوڵتان بردییەوە کچەکە قەرەواشی خۆی بۆ بنێرێ. دەستیان بە یاری کرد. زۆری نەبرد کچەکە دۆڕاندییە کوڕی سوڵتان. کە دۆڕاندی، گوتی:
- جاری خوا حافیز! دەچم قەرەواشەکەمت بۆ دەنێرم.
کچەکە گەڕایەوە خیوەتەکەی. خۆی شووشت و سووراو سپیاوی لە خۆی داو مووی ڕوخساری هەڵگرت و لێوی سوورکردو جلی ژنانەی خۆی کردە بەرو وەکوو مانگی لێ هات. چووە لای کوڕی سوڵتان و تا نوێژی بەیانی لە لای مایەوە. بەیانی زوو گەڕایەوە خیوەتەکەی خۆی. کەل و پەلی خۆی هەڵگرت و خیوەتەکەی پێچایەوە. گەڕایەوە ناو کەس و کاری خۆی و خیوەتەکانی لە ماڵی باوکی شاردەوەو چووە ناو مدبەق. ئەوەیش بڵێین کچەکە کاتێ لە خیوەتی کوڕی سوڵتان چووە دەرەوە، ئەنگوستیلەیەکی لە کوڕەکە دزی و بردی. کچەکە، پاش ماوەیەك، سکی بوو. کوڕێکی بوو دەتگوت مانگە. وەکوو کوڕی یەکەمی لە ماڵی باوکی خۆی دانا. منداڵەکان گەورە بوون: یەکەم بوو بە پێنج ساڵی و دووەم بوو بە دوو ساڵی. پاش نزیکەی ساڵێك کوڕی سوڵتان گوتی:
- دەمەوێ بە سەیران بچمە دەشت و بایەکی باڵی خۆم بدەم.
کاتێ کچەکە بە مەی زانی، چووە لای باوکی و پێی گوت:
- باوکە، (دە)خیوەتم لە تۆ دەوێ هەمووی زێڕکفت.
باوکی گوتی:

- باشە.

چوو خیوەتەکانی بۆ کڕی. کچەکەو دۆتمامەکانی هەمووی بەرگی پیاوانیان کردە بەرو ڕۆیشتن چوونە دەشتو دەرو خیوەتیان لەو چۆڵەوانییە هەڵدا. دوای چەند ڕۆژێ، کوڕی سوڵتان هاتو ئەویش خیوەتی لە چۆڵەوانی هەڵدا. لە دوورەوە هەندێ خیوەتی وەکوو زێڕی بینی. خەبەری نارد:

- ئەوە کێیە هاتووە؟

قاسید چوو پرسی:

- ئێوە کێن؟

گوتی:

- من کوڕی سوڵتان مەغریب زەمینم.

پاش چەند ڕۆژێ، کوڕی سوڵتان کچەکەی داوەت کرد. کچەکە چوو شیوی لە لا خوارد. لە شیو خواردن بوونەوە. کچەکە پێی گوت. وەرە یاری شەترەنج بکەین. ئەگەر تۆ لە منت بردەوە خوشکی خۆمت بۆ دەنێرمو ئەگەر من لە تۆم بردەوە تۆ خوشکی خۆتم بۆ بنێرە. کوڕەکە گوتی:

- باشە.

دەوری یەك سەعات یارییان کرد. کچەکە بە ئەنقەست دۆراندییە کوڕی سوڵتان. ئینجا ڕۆیشتو گوتی:

- دەچم خوشکی خۆمت بۆ دەنێرم.

چوو جلی ژنانەی خۆی لەبەر کردو خۆی ئارایش داو خۆی زۆر جوان کردو بۆ کوڕی سوڵتان چووە ناو خیوەتو تا بەیانی لەگەڵی مایەوە. بەیانی، دەسەسرێ لە کوڕی سوڵتان دزیو گەڕایەوە خیوەتەکەی. کەلو پەلەکانی کۆکردەو خیوەتەکانیان پێچایەوە. کچەکە گەڕایەوە ماڵی باوکیو خیوەتەکانییان شاردەوە. کچەکە، دوای ماوەیەك، سکی بوو. ئەم جارە کچێکی بوو زۆر بە دایكو باوکی دەچوو. دەتگوت مانگە! دوای چەند ساڵێك، کوڕی یەکەم تەمەنی بوو بە هەشت ساڵو کوڕی دووەم بوو بە پێنج ساڵی کچەکەش بوو بە چوار ساڵی. دوای چەند مانگێك، سوڵتانی باوکی کوڕەکە ڕۆژێ بە کوڕەکەی گوت:

- کوڕم، تۆ بۆچی بێ ژنی؟ دۆتمامەکەت بخوازەو بۆ خۆت بیهێنە.

کچی بەقاڵ زانی بەیانی ڕۆژی زەماوەندە، چووە لای منداڵەکانی، سەری شووشتن‌و سەعاتەکەی بە کوڕی گەورەوە کردو ئەنگوستیلەکەی دایە کوڕی دووەم‌و دەسەسرەکەشی لە ملی کچەکەی بەست. هەمووی هێنان لە ژووری بووك دانیان‌و پێی گوتن:

. ئەگەر یەکێ پێی گوتن هەستن بڕۆنە دەرەوە. بڵێن:

بڕۆن، ماڵ ماڵی باوکی خۆمانە،

بۆچی لە گەڵمان شەڕو شۆڕتانە؟

کاتێ بووکیان هێناو بردیانە ژوورەوە، کچەکە منداڵەکانی لەگەڵ بووك بردە ژوورەوە. ڕۆژئاوا، ژنان چوونە دەرەوە. منداڵەکان مانەوە. گوتیان:

بڕۆن، ماڵ ماڵی باوکی خۆمانە،

بۆچی لە گەڵمان شەڕو شۆڕتانە؟

ویستیان دەریان بکەن نەیانتوانی. دایکی کوڕی سوڵتان منداڵەکانی زۆر کەوتبووە بەردڵ چونکە کە منداڵەکان چوونە ژوورەوە، ژوورەکە لەبەر شەوقی جوانییان ڕووناك ببووەوە. دایکی کوڕی سوڵتان گوتی:

. وازیان لێ بێنن تا زاوا دێت، با بزانین ئەم دوو کوڕو کچە منداڵی کێن.

دوای نەختێ، کوڕی سوڵتان هات دوو کوڕو کچەکەی کردیانە هات‌و هاوار گوتیان:

باوکمان هات. باوکمان هات!

کوڕی سوڵتان کە چاوی پێکەوتن، واقی وڕما. ماچی کردن. کوڕە گەورەکەی لەسەر ڕانێك‌و کوڕی دووەمی لەسەر ڕانەکەی تر داناو کچەکەیشی لە کۆشی خۆی دانا. منداڵەکان ئەوەندە جوان بوون کوڕەکە بێ دەستی خۆی دڵی کەوتە سەریان‌و پێی گوتن:

. منداڵینە ئێوە منداڵی کێن؟

گوتیان:

. ئێمە منداڵی تۆین. دایکمان کچە بەقاڵەکەیە.

کوڕی سوڵتان هۆپێکی لە خۆی زانی و لە دڵی خۆیدا گوتی: یانی چی؟ ئەو ژنە ئەم منداڵانەی لە کوێ هێنا؟! لە دوو کچی بەقاڵیان نارد. کچەکە هات هەموو سەربردەی خۆی بۆ گێڕایەوەو گوتی:

– ئەمانە منداڵی خۆتن! ئەمە سەعاتەکەت و ئەمە ئەنگوستیلەکەت و ئەمەیش دەستەسڕەکەت!!

کوڕەکە شتەکانی خۆی دی. زۆر شادو بە کەیف بوو. پێی گوت:

. ئەی کچی بەقاڵ، قەت نەمدەزانی تۆ ئەوەندە لێهاتووی!

ئیتر دۆتمامی خۆی تەڵاق داو کچەکە گەڕایەوە ماڵی خۆیان. کوڕی سوڵتانیش لەگەڵ ژن و منداڵەکانی بە شادی و بەختەوەری ژیان.

لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

* * *

## ٣٠ـ دۆتمام و پسمام

هەبوو نەبوو...

سوڵتانێك هـەبوو، کچێکی جـوانی وەك مـانگی هـەبوو. هـەموو ڕۆژێ داخـوازی دەهات بەڵام باوکی بە شووی نەدەدا. سوڵتان لە دڵی خۆیدا دەیگوت: مـادەم خـۆم بـرازام هەیـە بۆچـی کچەکەم بدەمە بێگانـان! (پـاروو بـەر بێتـەوە، بکەوێتـە کۆشی بە قازانج حیسابە.)

ئەم سوڵتانە برایەکی سوڵتانی هەبوو، بەڵام لەشارێکی دوور بوو. باوکی کچەکە نامەیەکی بۆ برای نووسی و گوتی:

(برام، کچەکەم هەموو ڕۆژێ داخوازی دێ و من نایدەم، بۆ کوڕی تۆ بێ باشترە، نەك بۆ یەکێکی بێگانە! چ دەڵێی؟)

نامەکەی بۆ نارد. برای، کە نامەکەی پێگەیشت، تەگبیرەکەی بەگەن کرد. بە کوڕەکەی گوت:

- کوڕم، مامت قسەیەکی ئەوها دەکا. حەز دەکا کچەکەی خۆیت بداتێ، چ دەڵێی؟

کوڕەکە بە باوکی گوت:

- من نامەوێ.

کوڕەکە بە زمانی باوکی نامەیەکی بۆ مامی نووسی و گوتی: (نەخێر، برام، من کچی تۆم ناوێ). نامەیەکیشی بە ناوی خۆی بۆ دۆتمامی نووسی و گوتی: (من تۆم ناوێ)! تەلە زەعفەرانێك و داوەدەزوویەك و کڵۆ خەڵووزێکیشی لە ناو نامەکە ناو ناردی. مامی نامەکەی کردەوەو خوێندییەوە. کە زانی چی تێدایە، تووڕە بوو و بە کچەکەی گوت:

ـ کچم، مامت شتێکی ئەوهای بۆ نووسیوم.

کچەکە بە باوکی گوت کە پسمامەکەی نامەیەکیشی بۆ ئەو ناردووەو ئەو شتانەیشی لەگەڵ نامەکە بۆ ناردووە. ئینجا خەڵووزەکەو زەعفەرانەکەو دەزووەکەی نیشان دا.

کچەکە گوتی:

ـ بەڵێ پسمام بەم شتانەی ناردوویەتی دەیەوێ بڵێ. ئەگەر لە ئەشقان وەکوو ئەم زەعفەرانەت لێبێ نات هێنم، ئەگەر لە ئەشقان وەکوو ئەم داوە دەزووە باریك ببی ناتهێنم. ئەگەر بە دەردی ئەشق و ئەوینەوە وەکوو ئەم خەڵووزە ڕەش ببی نات هێنم. کچەکە چەند مانگێك قەهرو خەمی خوارد. ئەوسا ڕۆژێ، بە باوکی گوت:

ـ دەچمە ماڵی مامم. کیسە پارەیەکم دەوێ.

باوکی پێی گوت:

ـ کچم، چۆن بە تەنیا دەچی؟

کچەکە گوتی:

ـ نا، بە تەنیا ناچم. دایەنەکەم لەگەڵ خۆم دەبەم.

باوکە گوتی:

ـ باشە بڕۆ!

هەفتەیەك پێچوو، کچەکە کیسەیەك پارەکەی وەرگرت و لەگەڵ دایەنەکەی بۆی دەرچوو. لە هەورازان هەڵکشان و لە نشێوان داکشان. ماوەی مانگێك ڕۆیشتن. گەیشتنە شارێك. لەوێ پارەیان تەواو بوو. ڕۆژێ، بەبێ خواردن مانەوە. کچەکە بە دایەنەکەی گوت:

. وەرە بچینە بازاڕ. بمفرۆشەو خانوویەك لە شار بە کرێ بگرە. بەڵکو خوا ڕوحم بکا ئازاد ببم و بێمەوە لات. دایەن کچەکەی دایە دەست جاڕچی. جاڕچی جاڕی داو یەکێ هات بە سەد دەرهەم کڕی. دایەن پارەکەی وەرگرت و کابرا کچەکەی هەڵگرت و بەیانی بردییەوە ماڵێ. کچەکە چووە ناو ماڵەکە دیتی ئەو ماڵە هەمووی ڕەش کراوە. خەڵکی ماڵەوەش هەموو تازیەیانەو بە دەست غەم و پەژارەو گریانەوە دەتلێنەوە. پرسی ئەوە مەسەلە چییە؟

گوتیان:

. تۆ هەت چییە؟ تۆ خزمەتی خۆت بکە.

شەو دایەنی کوڕەکەو ژنی بازرگانەکە هاتن. دانیشتن و تێرو پڕ گریان. کە تێر گریان خەوتن. کچەکە گوتی: بەخوا من ناتوانم بنووم. ئێشك دەگرم بزانم چ ڕوودەدا. کە ژنی بازرگانەکە خەوی لێکەوت، دایەن هەستا پارچە نانێك و هەندێك ئاوی هێنا و چووە خانوویەك. بازرگانەکە حەفت خانووی هەبوو. هەموو تێکیان دەکردەوە. کاتێ دایەن چووە ناو خانووەکە، کچەکە بە دوایدا چوو. دایەن ڕۆیشت گەیشتە ژێر زەمینێك. دەرگای کردەوە. کە دەرگای کردەوە، کچەکە گوێی لە دەنگێك بوو هاواری دەکرد:

. ئاخ!ئاخ! دایەنەکەم بۆ خاتری خوا بەس لێم بدە.

هەقایەتی ئەم دایەنەو ئەم کوڕە بەم جۆرە بوو:

ئەو بازرگانەی کچەکەی کڕی کوڕێکی هەبوو. کوڕەکە تەمەنی پێنج ساڵ بوو. دایەن زۆر ڕقی لێدەبووەوە. کوڕەکەی دزی بوو، لە ژێر زەمین شاردبوویەوە. هەموو ڕۆژێ نەختێ نان و ئاوی دەدایێ. کچە کاتێ ئەمەی لە دایەنەکە بینی گەڕایەوە شوێنی خۆی و نووست. پاش نەختێ دایەنەکەیش هاتەوەو نووست. بەیانی دایەنەکە چووە حەمام. کە ئەو چووە حەمام، کچەکە چووە لای دایکی کوڕەکەو گوتی:

. چت بزرکردووەو لە چ دەگەڕێی؟

ژنەکە گوتی:

. کچم، تۆ چیت داوە لە شتی وا؟ کوڕێکەو بزربووە!

کچەکە گوتی:

. ئەگەر جێگای کوڕەکەتان نیشان بدەم، ئازادم دەکەن. گوتی:
. کوا بۆ ئەوێ ڕۆژێ! ئەرێ وەڵا ئازادت دەکەین و زیاتریش. کچەکە ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە و بردییە لای کوڕەکەی. کوڕەکەیان هێنایە دەرەوە. ئەوەندە لاواز ببوو وەکوو داری لێهاتبوو. بردیانە حەمام و شووشتیان. کە دایەن هاتەوە، گرتیان و سووتاندییان. دایکی کوڕەکە بە کچەکەی گوت:
. بخوازە ماڵی دونیایێ!
کچەکە گوتی:
. هیچم ناوێ تەنیا ئەوەندەم دەوێ ئازادم بکەن.
کابرا کچەکەی ئازاد کرد و کیسە لیرەیەکی گەورەیشی دایێ. کچەکە کیسە لیرەکەی وەرگرت و گەڕایەوە لای دایەنەکەی و پێی گوت:
. با گەشتەکەمان تەواو بکەین!
ملی ڕێیان گرت و ڕۆیشتن. لە هەورازان هەڵکشان و لە نشێوان داکشان تا گەیشتنە شارێکی تر. دیسان پارەیان لێبڕا. وایان لێهات نانی ئێوارەیان نەبوو. کچەکە بە دایەنەکەی گوت:
ـ دایەن گیان، هەستە بمبە بازاڕ بمفرۆشە. دایەن کچەکەی بردە بازاڕ و فرۆشتی. بە هەزار درهەمی دا. دایەنەکە خانوویەکی بە کرێ گرت و تێیدا ژیا.
ئەو کابرایەی کە کچەکەی کڕی، کچێکی شێتی هەبوو. هەموو ڕۆژێ کچێکیان بۆ دەکڕی و دەیخوارد. ئەو ڕۆژەی کابرا کچەکەی لە دایەنەکە کڕی و بردییەوە ماڵێ و شەو پێی گوت:
. دەست دە چراو بڕۆ ژێر زەمین بۆ لای کچەکەم.
کچەکە دەستی دایە چراو یەکەم پایە چووە خوارێ بۆ ناو ژێر زەمین، چراکە کوژایەوە و ماڵ تاریک داهات. کچەکە هەر رایکرد بە سەربان کەوت. تروسکاییەکی دی. لەسەر بان هاتە خوارێ. چووە دەرەوە ملی ڕێی گرت. ڕۆیشت تا گەیشتە لای ئاگرەکە. سەیری کرد جوولەکەیەك دۆشاو دەکوڵێنێ. ئەو دۆشاوە بوو کچی ماڵەکەی شێت کردبوو. کە جوولەکە ئاگری دەکردەوە و دۆشاوی دەکوڵاند، کچی ماڵەکە شێت دەبوو. کچەکە چووە سەر مەنجەڵەکە و وەریگێڕا و دۆشاوەکە ڕژا. کچەکە چراکەی داگیرساند و گەڕایەوە ماڵێ. دەرگای

کردەوەو چووە ژوورەوەو چووە خواریٚ بۆ ژێر زەمین. سەیری کرد. کچی ماڵەکە دانیشتووە. کاتیٚ کچی ماڵەکە چاوی پێکەوت، هەستا ماچی کردو پێی گوت:

. خوشکم، تۆ خەڵکی کوێی؟

تومەز کچی ماڵەکە ئەقڵی هاتبووەوە سەر. کچەی قەرەواش بانگی کەس و کاری کچی ماڵەکەی کردو گوتی:

. وەرن کچەکەتان چاك بۆتەوە. داوای جل وبەرگ دەکا و دەیەویٚ بتان بینیٚ.

ماڵەکە وایانزانی کچەکە دەترسیٚ بچێتە خواریٚ. پێیان گوت:

. برۆ خوارەوە بۆ لای، مەترسە، هیچ نییە!

کچەکە گوتی:

. توخوا وەرن سەیرکەن.

هاتن!! هەبوو باوەڕی دەکرد، هەبوو قسەکەی پیٚ درۆ بوو. هاتن دیتیان کچەکەیان ئاقڵ و شادومانە بەوەی ئەو کچەیان لە ماڵدایە. کە دیتیان کچەکەیان چاك بۆتەوە، هەلهەلەیان لێداو هاواریان کرد: کچەکەمان بە دەستی ئەم کچە چاك بووەوە!!

کچی خۆیان لە ژێر زەمین هێنایە دەرەوەو چڵك و قرێژیان لیٚ شووشت و دەستە جلێکی تازەو جوانیان کردە بەر. باوکی کچەکە هاتەوە دیتی کچەکەی لە شێتی چاك بۆتەوە. بەو کچەی گوت کە کڕیبووی:

– وەرە کچم، بخوازە، چت دەویٚ؟ من تەنیا ئەم کچەم هەبوو. زۆر زۆرم خۆش دەویست. تووشی ئەم نەخۆشییە ببوو. لەسەر دەستی تۆ چاك بووەوە.

کچە قەرەواشەکە گوتی:

. دەمەویٚ ئازادم بکەی و کیسە پارەیەکم بدەیتیٚ.

کابرا ئازادی کردو کیسە پارەیەکی دایێ. کچەکە پارەکەی وەرگرت و گەڕایەوە لای دایەنەکەی و پێی گوت:

. دایەن گیان، هەستە گەشتەکەمان تەواو بکەین!

کەوتنە ڕێ. لە هەورازان هەڵکشان و لە نشێوان داکشان تا گەیشتنە شارێکی گەورە. پووری کچەکە، واتە خوشکی باوکی،ماڵیان لەو شارە بوو. بەڵام کچەکە نەیدەزانی. کە گەیشتنە شار، پارەیان تەواو بوو. کچەکە بە دایەنەکەی گوت:

. هەستە بمبە بازاڕ بمفرۆشە.

دایەن کچەکەی بردە بازاڕو فرۆشتی. بە ڕێکەوت مێردی پووری هات کڕی. کە بردییەوە ماڵێ، پووری سەیری کرد ئەوەندە جوان بوو دەتگوت مانگە! ڕۆژی یەکەم قسەی لەگەڵ نەکرد. ڕۆژی دووەمیش هیچ. ڕۆژی سێیەم پووری پێی گوت:

. نەمانزانی ئەم کچە جوانە کچی کێیە؟

کچەکە گوتی:

. من کچی فلانە سوڵتانم. هەموو ڕۆژێ داخوازییەکم دەهات. پسمامێکم لە فلانە شار هەبوو. باوکم نامەیەکی بۆ مامم نووسی و پێی گوت حەزدەکەم کچەکەم بدەم بە کوڕەکەت. مامم وەڵامی دایەوە. کچی تۆم ناوێ. کوڕەکەیش خەبەری بۆ من نارد گوتی: من تۆم ناوێ. سێ شتی بۆ ناردم. تاڵە زەعفەرانێك و کەڵبە ڕەژوویەك و داوەدەزوویەك. مەبەستی ئەوە بوو بڵێ: ئەگەر لە داخان ڕەنگت وەك زەعفەران زەرد ببێ تۆم ناوێ. ئەگەر لە خەفەتان وەکوو ئەم کەڵبە ڕەژووە ڕەش هەڵبگەڕێ تۆم ناوێ. ئەگەر لەبەر ئەشق و ئەوین وەك ئەم داوەدەزووە لەڕولاوازو باریك ببی تۆم ناوێ. کە ئەمەم بیست لەگەڵ دایەنەکەم سوار بووین و ملی ڕێگامان گرت و هاتین. هەر جارەی پارەمان نەدەما، دایەن لە شارێك دەیفرۆشتم و بە پارەکە دەژیاین. جاری یەکەم فرۆشتمی و ئازاد کرام. جاری دووەم گەیشتینە شارێکی تر. دایەن فرۆشتمییە ماڵێك. ماڵەکە خێریان لە کڕینی من بینی و ئازادیان کردم. ئەمە جاری سێیەمە هاتینە ئەو شارەو ئێوە منتان کڕی و ئێستا وا لەگەڵ ئێوەدام.

پووری ناسییەوەو پێی گوت:

. تۆ کچی فلانە سوڵتانی؟

کچەکە گوتی:

. بەڵێ!

پووری گرتی و ماچی کردو گوتی:

- من پووری تۆم.

ئینجا گوتی:

- پسمامەکەت مانگیٚ جاریٚك سەرم لیٚدەدا. ئەگەر ئەم جارە هات بزانە چی لیٚ دەکەم!

کچەکە دەوری حەفتەیەك لای پووری مایەوە. پسمامی هات سەلامی لە پووری کرد. چاوی بە کچەکە کەوت. (دۆتمامی خۆی بوو بەلاٚم نەیناسی) بە پووری گوت:

- پووریٚ، ئەم کچەت لە کویٚ بوو؟

پووری گوتی:

- کڕیمان.

کوڕەکە گوتی:

- پیٚی بلٚیٚ ئاوم بۆ بیٚنیٚ.

پووری بە کچەکەی گوت:

- کە پەرداخەکەت دایێ، پەرداخەکە بەردەوە با بشکیٚ. من جویٚنت پیٚدەدەم، بزانین چ دەلٚیٚ.

کە کچەکە چوو پەرداخە ئاوەکەی بۆ برد. کوڕەکە وەریگرت و خواردییەوە. هەر تەماشای کچەکەی دەکرد. کچەکە پەرداخەکەی لە دەست وەرگرتەوەو بە ئەنقەست بەری دایەوە. کە بەری دایەوە، پووری تیٚبەر بوو، گوتی:

- دەك ملت شکیٚ. کویٚر بووی چییە؟!

کوڕەکە گوتی:

- حا!حا! پووریٚ، قسەی وا مەکە.

کوڕەکە چووە بازاڕو شەش پەرداخی کڕی و هیٚنای دایە پووری. ئینجا بە پووری گوت:

- پووریٚ، من دەڕوم حەفتەیەکی تر دیٚمەوە. کوڕەکە ڕۆیشت. دوای حەفتەیەك هاتەوە. پووری زانی ئەشقی کچەکە بووە. پووری کچەکە بە کچەکەی گوت:

- برازا، ئەو چۆن تۆی ئەزیەت دا، منیش ئەوها ئەو ئەزیەت دەدەم.

ئەوسا پووری لە کوڕەکەی پرسی:

- کوڕم، چۆن بوو ئەم جارە وا زوو هاتیت؟ جاران وا نەبووی!

کوڕەکە گوتی:

- غەریبیم کردی.

کچەکە چووە ژێر زەمین. کوڕەکە چاوی بەم لاو بەولادا گێڕا، گوتی:

- پووریٚ، کوا کچەکە.

پووری گوتی:

- لە ژێر زەمینە.

- پێی بڵیٚ قاوەم بۆ بێنیٚ.

پووری چووە لای کچەکەو پێی گوت:

- قاوەی بۆ ببە. کە خواردییەوە، فنجانەکە بەردەوەو بیشکێنە.

کچەکە، کە فنجانە قاوەکەی بۆ کوڕەکە بردو پێشکەشی کرد، کوڕەکە قاوەکەی خواردەوەو فنجانەکەی دایەوە. کچەکە بە ئەنقەست فنجانەکەی بەردایەوەو شکاندی.

پووری گوتی:

- بۆ؟ بۆ؟ چ خێرەکی خوای بوو؟ ئەوە بۆچی شکاندت؟ هەی عەمرت نەمێنیٚ؟!!

کوڕەکە بە پووری گوت:

- بۆچی قسەی پیٚ دەڵێی پووریٚ؟ کوڕەکە چووە بازاڕ دەستە فنجانێکی کڕیو هێنایو گوتی:

- ئەمە لە باتی فنجانەکە. ئینجا بە پووری گوت:

- پووریٚ، من دەڕۆم!

کە کوڕەکە ڕۆیشت، پووری بە کچی برای گوت:

- ڕاوەستە، فێڵێکی لیٚ دەکەم. خەمێکی وای دەدەمیٚ وەك ئەو خەمەی ئەو دایە تۆ. پووری چوو تاڵە زەعفەرانێکی کڕی کوتای لە دەم وچاوی کچەکەی دا. ئینجا چوو نانە ڕەقێکیشی هێنا لەناو نوێن لەبن پشتی کچەکەی نا. کوڕە براکەی هات سەیری کرد کچە دیار نییە. گوتی:

- پووریٚ، ئەدی کوا کچەکە؟!

گوتی:

. ئای چەند نەخۆشە! تا بڵێی نەخۆشە!

کوڕەکە کە زانی کچەکە نەخۆشە زۆری خەفەت بۆ خوارد. چووە سەلال بۆ ژوورەکەی. سەیری کرد خەوتووە. داهاتەوە سەری و ماچی کرد. پووری دیتی و پێی گوت:

. با پێت بڵێم ئەگەر بڕۆی و ئەم جارە بێیتەوە، ئەم کچەت لێ مارە دەکەم.

کوڕەکە گوتی:

. ڕەحمەت لە دایك و باوکت!! بەخوا پووری، منیش ئەمەم دەویست.

کوڕەکە نزیکەی سێ ڕۆژ لای پووری مایەوە و ڕۆیشت. پاش حەفتەیەك، هاتەوە. کچەکەی دیت لە مانگ جوانترە. وەك گەوهەر دەدرەوشێتەوە. پووری کچەکەی لێ مارەکرد و جیازی بووکی ئامادە کرد. خشڵ و زێڕی بە کچەکەوە کرد وەکوو قاپ قورئان و نەترك و بسکۆکە و خەزێم و عەرانە و ترانجی.. هەمووی زێڕ و یاقوت بوو. خڕخاڵێکی زێڕیشی لە پێ کرد و لە ژوورەوە داینا. شەوی هەینی، کوڕەکە چووە حەمام. هات بچێتە لای بووك. کچە دەرگای لە ڕووی داخست و کلیلی دا. کوڕەکە گوتی:

. توخوا دەرگام لێ بکەوە! ئەگەر هەرئێستا دەرگام لێنەکەیتەوە، دەمرم!

کچەکە پێی گوت:

. تا وەکوو زەعفەران ڕەنگت زەرد نەبێ دەرگات لێناکەمەوە. تا وەکوو خەڵووز ڕەش دانەگەڕێی دەرگات لێناکەمەوە. تا وەکوو داوە دەزوو لەڕ و لاواز و باریك نەبی دەرگات لێناکەمەوە. کاتێ کچەکە وای گوت، کوڕەکە زانی ئەمە دۆتمامی خۆیەتی. گوتی:

. خانم، بە خوا نەمزانی تۆ ئەوەندە جوانی.

کچەکە هەستا دەرگای لێ کردەوە و کوڕەکە چووە باوەشی. ڕەوشت وایە کە زاوا دەچێتە لای بووك. دەستی ڕاستەی دەرگرێ و پێی لەسەر پێی چەپی دادەنێ و نیوچەوانی ماچ دەکا و ئینجا دەچێتە دەرەوە و دەستی برادەرەکانی دەگوشێ و دەستی دایکی ماچ دەکا. ئەوسا دەگەڕێتەوە لای بووك. جل و خشڵی لەبەر دادەکەنێ و دەرپێی لە پێ دەکاتەوە و قاچی ڕاستەی بڵند دەکا و دەیخاتە سەر

شانی چەپەی‌و قاچی چەپەی دەخاتە سەر شانی ڕاستەی‌و بۆی تێدەخا. کوڕەکەیش بەم جۆرە چووە لای کچەکە. هەندێ ماچی کردو چووە دەرەوە. دەستی برادەرەکانی گوشی‌و پێیان گوت: بە خێرو خۆشی! بە خێرو خۆشی! ئینجا چووەوە ژوورێ بۆ لای کچەکەو ئیشی خۆی لەگەڵ کرد. بۆ سبەینێ، پووری کچەکەو کوڕەکە نامەیەکی بۆ باوکی کچەکە نووسی‌و گوتی:

. (خەمت نەبێ کچەکەت گەیشتە لای من‌و مێردی بە پسمامەکەی کرد.)

کاتێ باوکی کچەکە نامەکەی پێگەیشت زۆر شادو کەیف خۆش بوو. دوو هەزار لیرەی وەکوو دیاری زەماوەند بۆ ناردن. ئینجا پوورە نامەیەکی بۆ براکەی تری نووسی‌و گوتی:

. (فلانی، پێت سەیر نەبێ دۆتمامی کوڕەکەتم بۆ کوڕەکەت هێنا.)

باوکی کوڕەکە نامەکەی وەرگرت‌و خوێندییەوە. زۆر پێ شادو دڵشاد بوو. جل وبەرگ‌و دیاری بۆ بووک‌و زاوا نارد. ئینجا پوورەکەیان کۆشکێکی لە تەک کۆشکی خۆی بۆ دروست کردن. بە خۆشی‌و شادی‌و بەختەوەری لای پووریان مانەوە.

لای ئێوە بووین‌و هاتینەوە.

* * *

## ٣١ـ مانگی مانگان

هەبوو نەبوو...

سوڵتانێك هەبوو، کوڕێکی هەبوو. ڕۆژێ، کوڕەکە لە بازاڕ دەڕۆیشت پیرەژنێکی دی گۆزەیەکی لەسەر شان بوو. شانێکێ لە پیرەژنەکە دا. پیرەژن گۆزەکەی لە سەر شان بەر بووەوەو شکا. پیرەژن دوعای لە کوڕەکە کرد، گوتی:

ـ بۆچی گۆزەکەت شکاندم؟ یاخوا تووشی ئەشقی(مانگی مانگان) بی!

کوڕەکە، کە ئەمەی بیست، هۆشی لەسەردا نەما. بە پیرەژنی گوت:

ـ داپیرە، پێم بڵێ (مانگی مانگان) لە کوێیە؟

پیرەژن گوتی:

ـ لە بنی دنیایە

کوڕەکە بە کزو غەمباری چووەوە ماڵێ. ڕۆژ بە ڕۆژ ڕەنگی زەرد دەبوو و دەبنسا. باریك وەکوو داری لێهات. باوکی پێی گوت:

ـ کوڕم، ئەوە چیتە؟

گوتی:

ـ هیچ!

باوکی چووە لای دارتاش و پێی گوت:

ـ چوارپایەکمان بۆ دروست بکە.

دارتاش گوتی:

. ئەمرۆ ناتوانم بۆت دروست بکەم.

سولتان لە دارتاش تووڕە بوو. سورگومی کرد بۆ شارێکی دی. دارتاشەکە چووە شارەکە. لەوێ برادەرێکی پەیدا کرد. ڕۆژێ، برادەرەکە پێی گوت:

. ئەرێ ئەوە تۆ بۆچی کەوتوویتە ئێرە؟

گوتی:

. سولتان لێم تووڕە بوو سورگومی کردم. ماڵو منداڵم لەوێ بەجێماون. نازانم چ دەخۆنو چ دەخۆنەوە؟ کوو بەڕێوە دەچن؟

برادەرەکەی پێی گوت:

. تۆ ئیشت چییە؟

گوتی:

. دارتاشم.

گوتی:

. مادام دارتاشی، ها، ئەم دارانە بگرە دوڵابێك دروست کە بۆ خۆت. خواردنو خواردنەوەی لە ناو دانێ. هەر شتێ لایەکی بۆ تەرخان بکە. من دێم مەکینەیەکت بۆ تێدەخەم. لە ناو دوڵابەکە دانیشەو مەنگەنەی مەکینەکە بسووڕێنە. دوڵابەکە دەفڕێو کوێت بوێ لەوێ دێتە خوارەوە. دارتاشەکە کە ئەمەی بیست، دوڵابێکی جوانی دروست کرد. برادەرەکەی هات مەکینەو مەنگەنەی تێخست. دارتاشەکە چوو لە ناو دولابەکە دانیشتو مەنگەنەکەی بادا. دوڵابەکە فڕی چوو لە سەر بانی ماڵی خۆیان هاتە خوارێ. کەسو کاری هاواریان کرد:

. ئەوە کێیە؟ ئەوە کێیە؟

گوتی:

. وس وس! منم.

کوڕەکانی کە گوێیان لە دەنگی باوکیان بوو، شاگەشکە بوونو هاواریان کرد:

. باوکمان هاتەوە!

ژنەکەی بە کابرای گوت:

- ئەوە چۆن هاتیتەوە؟

کابرا هەقایەتی دۆلابەکەی بۆ گێڕایەوە. بۆ بەیانی دارتاش دۆلابەکەی بۆ کوڕی سولتان بردو بۆی باسکردو فێری کرد چۆن پێی بفڕێ. کوڕی سولتان خواردنی مانگێکی لە ناو دۆلابەکە دانا و چوو لە ناوی دانیشت و مەنگەنەکەی بادا. دۆلابەکە فڕی و کوڕەکەی برد. کوڕەکە هەر هەندەی زانی لە شاری (مانگی مانگان)ە. لایدا مالی پیرەژنێک و لەگەڵ پیرەژن ژیا. هەموو ڕۆژێ لیرەیەکی دەدایە پیرەژنەکە. ڕۆژی یەکەم پشووی دا. ڕۆژی دووەم چووە حەمام خۆی شووشت و چوو لە قاوەخانە دانیشت. کوڕی سولتان گەنجێکی قۆزو ڕێک و پێک بوو. براکانی (مانگی مانگان) بوون بە برادەری و داوەتیان کرد بۆ ماڵەوە. (مانگی مانگان) لەناو حەفت ژووری لە ناو یەکدا دەژیا. هەر ژوورە و قەرەواشێک لەبەر دەرگا دەخەوت. ژووری کچەکە پەنجەرەیەکی تێدابوو. کوڕی سولتان کە بە داوەت لەگەڵ براکانی کچەکە چووە ماڵیان، کچەکە چووە دەرەوە سەری هەڵکێشا و چاوی پێ کەوت و ئەشقی بوو. کوڕەکە نانی ئێوارەی خوارد و ڕۆیشت. کوڕی سولتان نزیکەی ساڵێک برادەری براکانی مانگی مانگان بوو. ڕۆژێ، لە دڵی خۆیدا گوتی: من بۆچی هاتمە ئێرە؟ ئەی بۆ (مانگی مانگان) نەهاتم؟!

سواری دۆلابەکە بوو. لەبەردەرگای ژووری (مانگی مانگان) هاتەخوارێ سەیری کرد دەرگای ژوورەوە کلیلدراوە. لە پەنجەر چووە ژوورێ. کچەکە، کە چاوی پێکەوت گوتی:

- لە عاسمانانم دەویستی لە عەردانم دەستکەوتی. لەوەتی تۆم دیوە ئەو ڕۆژەی بە داوەت هاتیتە ماڵمان، چاوم نەچۆتە خەو. کوڕەکە لەگەڵ کچەکە نووست و ئیشی خۆی لە گەڵ کرد. بەیانی سواری دۆلابەکە بوو ڕۆیشت. شەش مانگ بەو جۆرە لەگەڵ کچەکە ڕایبوارد. بە شەو لەگەڵ کچەکە دەنووست و بە ڕۆژ لەگەڵ براکانی کچەکە هەڵدەستا و دادەنیشت. کچەکە سکی بوو. ترسا نەوەکوو کەس و کاری پێی بزانن. هەستا خۆی نەخۆش خست. ئەگەر میوانیان بهاتایە و پێیان گوتبا وەرە خوارێ، دەیگوت: نەخۆشم پێم ناکرێ. دایکی کچەکە چوو لای مێردەکەی و پێی گوت:

. پیاویژگە، ئێمە ئەوەندە کچەمان هەیە. نەخۆشە، بۆچی تەبیبی ناهێنیتە سەر. باوکە چوو تەبیبی هێنا. تەبیب فەحسی کرد. هیچ نەخۆشی لێنەدی. زانی دووگیانە پێی گوتن:

. کچەکەتان چ بەلای لێ نییە.

گوتیان:

. ئەی ئەو ئازارو ژانەی لە چییە؟

گوتی:

. دووگیانە!!

دایبابی کچەکە، کە ئەم قسەیان بیست، واقیان ورما و پرسیان:

. باشە، کێ سکی پڕ کردووە؟

دایکە بە وردی سەیری کچەکەی کرد دیتی ڕاستە دووگیانەو لە مانگی حەوتەمدایە. کەس و کاری کچەکە لێیان پرسی:

. کێ سکی پڕ کردی؟

کچەکە هیچ قسەی نەکرد. لە بەینی خۆیانەوە گوتیان:

. با تاقیبی بکەین. بزانین کێ دێتە لای؟ بێ شك یەکێ هەیە. هەموو ڕۆژێ دێتە لای. تەماشای پەنجەرەیان کرد. پەنجەرە کرابووەوە. گوتیان هەبێ و نەبێ ئەوەی دێ لەم پەنجەرەیەوە دێتە ژوورێ. خۆیان لە جێگایەك دانووساندو چاوەدێری پەنجەرەکەیان کرد. بەرەبەری ڕۆژئاوا، کوڕەکە هات و چووە ژوورەوە. قیڕ گرتیان و تێرو پڕیان لێدا. پێیان گوت:

. بەیانی لە سەرت دەدەین. گوتی:

. چۆن لە سەرم دەدەن؟ من قەرزاری ئێوەم. ڕاوەستن کاغەزی قەرزەکانم بێنم و قەرزەکەتان بدەمەوە. ئەوسا لە مێخم بکێشن.

چووە ناو دۆلابەکەو مەنگەنەکەی بادا. دۆلابەکە لەناو خەلکەکە بەرز بووەوەو فڕی. گوتیان:

. بێ شك ئەمە مندالە جنۆکەیە.

کوڕەکە کاتێ فڕی گوتی:

- بە خوا تا مانگی مانگان لەگەڵ خۆم نەبەم وازی لێ ناهێنم و ناڕۆم! دەترسم بیکوژن.
ئەوە بوو چووە لای کچەکەو ئامادەی بۆ کردو لەگەڵ خۆی سواری دوڵابەکەی کردو بردی. لە ناو دوڵابەکە بە عاسماندا دەفڕین نیوەی ڕێیان بڕی، برسی بوون. هەر لە ناو دوڵابەکە چێشتیان لێنا. لەبەر ئەوەی دوڵابەکە دار بوو، سووتا و لەو دەشت و چۆڵەوانییە کەوتنە خوارەوە. لە دووری یەکتر، هەر یەکەی لە جێگایەك کەوتە سەر زەوی. بەم جۆرە لێك دابڕان. کوڕەکە سەیری ئەم لا و ئەولای کرد (مانگی مانگان) دیار نەبوو. ما لە خەفەتان بۆی بگری. سەری هەڵگرت و ڕۆیشت. لە هەورازان هەڵکشا و لە نشێوان داکشا. هەر هێندەی زانی گەیشتەوە شاری خۆیان و چوو لە دەرگای دا. گوتیان:
- کێیە؟
گوتی:
- فلان کەسم.
گوتیان:
- بڕۆ لێرە ڕانەوەستی. دەتەوێ تەفرەمان بدەی. فلانە کەس چەند لە مێژە ڕۆیشتووەو هیچ سەرو سۆراغی نییە. لەوانەیە ئێستا مردبێ. یانیش کوژرابێ!!
گوتی:
- بەخوا من فلانە کەسم.
هەستان دەرگایان کردەوە. دیتیان هەوە. بەڵام نەخۆش! شەکەت! دەردەدار! سەرو ڕیش هاتوو! باوکی هاتە لایەوەو گوتی:
- کوڕم، پێم ناڵێی تۆ لە سوێنگەی چی وات بە خۆت کرد؟
کوڕەکە چووە حەمام خۆی شووشت بەڵام دڵی هەر لە لای (مانگی مانگان) بوو.
(مانگی مانگان)یش کە لە دەشت و بیابان کەوتە خوارەوە، ڕۆیشت. هەر ڕۆیشت تا گەیشتە ماسیگرێك. ماسیگرەکە ویستی دەستدرێژی بکاتە سەر، (مانگی مانگان) پێی گوت:
- نەختێ سەبر بگرە. تا دەحەسێینەوەو قاوەیەك دەخۆینەوە.

گوتی:

. باشە!

(مانگی مانگان) قاوەی لێناو دەرمانی بێهۆشی تێکردو پێشکەشی ماسیگری کرد. ماسیگرەکە لە هۆش خۆی چوو، کچەکە کەچە جلەکانی لەبەر ماسیگرەکە داکەندو لەبەر خۆی کرد. ڕۆیشت لە هەورازان هەڵکشاو لە نشێوان داکشا گەیشتە چل پیاو. لە دڵی خۆیدا گوتی:

. خوایە چۆن لە دەست ئەمانە ڕزگارم دەبێ؟!

کە پیاوەکان دیتیان وایانزانی پیاوە چونکە جلی پیاوانی لەبەر بوو. لێیانپرسی:

. تۆ کێی؟

گوتی:

. قاچاغم.

گوتیان:

ـ تۆ قاچاغی و ئێمەیش قاچاغین! وەرە بەگەڵ ئێمە بکەوەو ببە بە برامان. کچەکە بەگەڵیان کەوت. خواردن و خواردنەوەو نووستنی لەگەڵ ئەوان بوو. نزیکەی مانگێك لەگەڵیان مایەوە. دوای ئەو مانگە، ڕۆژێ، زستان بوو لەبەر بەرۆچکە دانیشتبوو مەمکیان دی. گوتیان:

. ئۆی دیارە ئەمە کچە. مانگێکە لەگەڵ ئێمە دایەو ئێمەیش نەمانزانیوە!

چوون پێیان گوت:

. دیارە تۆ ژنی؟

گوتی:

ـ جا ئەمە چ عەیبی تێدایە! ئەگەر بمەوێ مێرد بکەم، مێرد بە یەکێ لە ئێوە دەکەم. خۆ ناکرێ مێرد بە هەر چلتان بکەم.

گوتیان:

. شتی وا نابێ دەبێ مێرد بە هەر چلمان بکەی.

کچەکە کاتێ دیتی هیچ چارەی نییە گوتی:

مادام نیازتان وایە، ڕاوەستن با قاوەیەکتان بۆ لێ بنێم و قاوەکە بخۆینەوە. پاشان چیتان دەوێ وا بکەن.
گوتیان:
- باشە، بە خوا ئێمەیش حەزمان لە قاوەیە.
کچەکە هەستا قاوەی هێنا. برژاندی و کوتای و لێینا و دەرمانی بێهۆشی تێکرد. قاوەکەی دانی و هەمووی بێهۆش کردن. کە سەیری کرد بێهۆش بوون لە دڵی خۆیدا گوتی: دەترسم بە هۆشی خۆیان بێنەوە و بکەونە دوامەوە. دەستی دایە چەقۆیەك یەکە یەکە ورگی دڕین و ئەسپەکانی بردو ڕۆیشت. لە هەورازان هەڵکشاو لە نشێوان داکشا، تووشی دوو سواران هات. هاواریان کرد:
- ڕاوەستە نەڕۆی! سوارە تۆ کێی؟ بنیادەمی، یان ئەجندەی؟!
وایانزانی پیاوە چونکە جلی پیاوانی لەبەر بوو. هەموو ئەسپەکانیان لێسەند. تەنیا یەك ماینیان دایەوە بۆ ئەوەی بۆ خۆی سواری بێ. کچەکە دەوری (دە) ڕۆژ ڕۆیشت، گەیشتە شاری کوڕی سوڵتانی هاوڕێی. چووە ناو شار. ماینەکەی فرۆشت بە بیست لیرەی داو لایدایە ماڵێك، بەڵام نەیدەزانی ئەم شارە شاری خۆشەویست و هاوسەری خۆیەتی. دوو مانگ پێچوو، پارەی نەما، پرسی:
- سوڵتانی ئەم شارە ناوی چییە؟
گوتیان:
- ناوی سوڵتان فلانە.
گوتی:
- ئایا چ کوڕی هەیە؟
گوتیان:
- بەڵێ کوڕێکی هەیە. ماوەیەك بەر لە ئێستا لای باوکی ڕۆیشت. عەیامەکی پێچوو بە نەساغی هاتەوە. دەڵێن ئەشقی کچێك لەسەری داوە بە ناوی (مانگی مانگان). شەو لەبەر ئەو کچە خەوی نییە. کچەکە، کاتی ئەمەی بیست، زۆر شادو گوشاد بوو. چووە لای پیرەژنێك لیرەیەکی دایێ و پێی گوت:
- ها، ئەم ئەنگوستیلەیە ببە، بیدە کوڕی سوڵتان.

پیرەژن ئەنگوستیلەکەی وەرگرت. چووە لای کوڕی سوڵتان و پێی گوت: ها، ئەمە هی تۆیە! بۆ تۆیان ناردووە.

کوڕەکە چاوی بە ئەنگوستیلەکە کەوت. بە پیرەژنی گوت:

ـ داپیرە، ئێستا ئەم کچە لە کوێیە؟

پیرەژن گوتی:

ـ لە فلانە جێیە.

کوڕەکە گوتی:

ـ داپیرە شوێنەکەم نیشان دە! ئەوەی دەداو دەستێنێ هەر خودایە، بەڵام من بە ئیزنی خودای دەوڵەمەندت دەکەم. پیرەژن کوڕی سوڵتانی بردە لای (مانگی مانگان). کوڕەکە لەگەڵ کچەکەی بینی، ڕۆحی هاتەوە بەر. باوەشیان پێکدا کردو یەکتریان ماچ کردو گریان. کوڕی سوڵتان کچەکەی بردەوە ماڵێ. کچەکە چی دەردەسەری بە سەری هاتبوو هەمووی بۆ کوڕی سوڵتان گێڕایەوە. کوڕەکە چووە لای باوکی و هەموو هەقایەتەکەی لە سەری هەتا بنی بۆ گێڕایەوە. باوکی پێی گوت:

ـ مادام خۆت دەتەوێ و ڕات لە سەرە، بیهێنە!

سوڵتان جیازی بۆ ئامادە کردن و ئاهەنگی زەماوەندی بۆ سازدان و کوڕەی لە پاڵ (مانگی مانگان) کرد. بووک و زاوا کەوتنە ژیانێکی خۆش و بەختەوەر. پاش ماوەیەک، (مانگی مانگان) کوڕێکی بوو. کت وەک باوکی بوو. چونکە لە هەوەڵەوە پێش زەماوەند دووگیان ببوو. کوڕەکەیان بە دایەنێک سپارد. دایەنەکە شیری خۆی دەدایێ. ژیانێکی خۆش و بەختەوەر ژیان.

لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

* * *

## ٣٢ـ چارەنووس

هەبوو نەبوو...

سـولّتانێك هـەبوو، وەزیرێكـی هـەبوو. سـولّتان ئـەو وەزیـرەی خـۆی زۆر خـۆش دەویست. یەك سەعات بە بێ ئەو هەڵی نەدەكرد. ڕۆژێ، سـولّتان بـە وەزیرەكـەی گوت:

. با ئەمڕۆ بۆ گەشت وگوزار بچینە سەر كەناری دەریا.

چـوون كابرایـەكیان دی دانیشـتبوو قـوڕی دەكـردە تـۆپـەڵی بچـووك بچـووك و تۆپەڵێكی بە تۆپەڵێكی ترەوە دەنووساندو فڕێی دەدایە ناو دەریا. تەماشایان كرد. نزیكەی سەعاتێك لە دیاری ڕاوەستان، ئینجا سولّتان پێی گوت:

. برا، ئەوە تۆ خەریكی چی؟

گوتی:

. من فریشتەم. دوو تۆپەڵە قوڕ بـە یەكـەوە دەنووسـێنم و دەڵـێم ئەمـە فلانـە كـوڕو ئەمەیش فلانە كچ و تۆپەڵە قوڕەكە فڕێ دەدەمە ناو ئاوی دەریا.

سـولّتان و وەزیـر سـەریان لـە قسـەكەی سـوڕما. دوای سـەعاتێك فریشـتەكە دوو تۆپەڵە قوڕی هێنا و گوتی:

. ئەمە سولّتان و ئەمەیش كچی شێخ عارەبان. چارەنووسیان بە یەكەوەیە!

قوڕەكەی فڕێ دایە ناو دەریا. سولّتان بە فریشتەكەی گوت:

. ئەمە چییە؟

فریشتەکە گوتی:

- ئەمە چییە؟ ئەوە چییە؟ لە گۆڕێ نییە. ئەوە ئەوهایە!

سوڵتان و وەزیر گەڕانەوە ماڵێ. سوڵتان بە وەزیری گوت:

- هەستە بچینە لای شێخی عەرەبان بزانین داخوا ئەمە ڕاست دەکا؟

سواربوون و ڕۆیشتن. لە هەورازان هەڵکشان و لە نشێوان داکشان. گەیشتنە ماڵی شێخی عارەبان و لایان دا. شێخی عارەبان سێ ڕۆژ میوانداری کردن و لەو ماوەیەدا ژنی شێخ عارەبان کچێکی بوو. سوڵتان لە دڵی خۆیدا گوتی:

- فریشتەکە ڕاست دەکا. شەو چووە سەر کۆرپەکەو سینگی بریندار کرد.

بەیانی سوڵتان و وەزیر ماڵاواییان کردو بەرەو ماڵ بوونەوە. سبەینێ کەس و کاری کۆرپەکە دیتیان کۆرپەکە سینگی بە چەقۆ بریندار کراوە. تیماریان کردو چاك بووەوە.

(دە) ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوەدا تێپەڕی. ڕۆژێ، سوڵتان بە وەزیری گوت:

- با بچینە لای شێخی عارەبان بزانین داخۆ کچەکە چاك بۆتەوە، یان مردووە؟

وەزیر گوتی:

- با بچین.

ڕۆیشتن. لە هەورازان هەڵکشان و لە نشێوان داکشان گەیشتنە لای شێخی عارەبان و لایاندا. شێخی عارەبان پێی گوتن:

- ئێوە خەڵکی کوێن.

گوتیان:

- ئێمە خەڵقی خواین!

شێخی عارەبان بە کاری خوای کە چاوی بە سوڵتان کەوت، سولتانی کەوتە بەردڵ و پێی گوت:

- دەتەوێ کچەکەمت بدەمێ؟!

سوڵتان گوتی:

- بەڵێ، ڕازیم زۆر مەمنوونم.

کچەکەیان لە سوڵتان مارە کرد. شەوی هەینی سوڵتان چووە لای کچەکە. جلی لەبەرداکەندو جێی برینەکەی سینگی دی وەکوو خەتێك وا بوو. لێی پرسی:

. ئەم برینە چییە؟

کچەکە گوتی:

. دەڵێن من تازە ببووم، ڕۆژێ، مێوانێکمان هاتبوو بە چەقۆ بریندارى کردبووم.

سوڵتان ناسییەوەو لەگەڵیا نووست. بەیانى مەسەلەکەی بۆ وەزیر گێڕایەوەو پێی گوت:

. ئەمە ئەو کچەیە کاتی خۆی بە چەقۆ بریندارم کرد. وەزیر گوتی:

. بە ڕاستیتە؟

سوڵتان گوتی:

. ئەرێ بەخوا!!

سوڵتان و وەزیر نزیکەی حەوت مانگ لای کەس و کاری کچەکە مانەوە. ئەوسا سوڵتان و وەزیر بە شێخیان گوت:

. دەمانەوێ بچینەوە لای کەس و کاری خۆمان.

شێخ ئیزنی دان و گوتی:

. خواتان لەگەڵ.

سوڵتان چووە لای ژنەکەی و پێی گوت:

. من دەڕۆم. تۆ سکت هەیە. ئەگەر کچت بوو، با لای خۆت بێ و ئەگەر کوڕت بوو، ها، ئەم بازووبەندەت بدەمێ لە بازووی ببەستەو بۆم ڕەوانەی بەغدای بکە دەگاتە من. ژنەکە گوتی:

. باشە!

سوڵتان و وەزیر چوونەوە بەغدا. دەستیان بە ئیش و کاری خۆیان کردەوە. کاتێ سوڵتان ڕۆیشت، ژنەکەی سکی حەوت مانگان بوو. دوای دوو مانگ کوڕێکی بوو دەتگوت مانگە. بازووبەندەکەی لە بازوو کردو بەخێوی کرد. کوڕەکە تەمەنی بوو بە حەفت ساڵی. چووە لای مەلاو قورئانی خەتم کردو فێری خوێندەواری بوو. کوڕەکە تەمەنی بوو بە دوانزە ساڵی، ڕۆژێ، لەگەڵ برادەرەکانی یاری دەکرد بە شەڕ هاتن، پێیان گوت:

– بڕۆ، هەی زۆڵ و حەرامزادە، بڕۆ کەس نازانێ خۆت کێیت و باوکت کێیە.!!

کوڕەکە کرمانج و کۆچەر بوو. کە ئەم قسەیان پێ گوت، دەماری جووت بوو. چووە لای دایکی. شمشێری هەڵکێشا و گوتی:

- یان پێم دەڵێی باوکم کێیە، یان بەم شمشێرە دەتکوژم.

دایکی گوتی:

- کوڕم، باوکت لە شاری بەغدایە. کە تۆم بە سک کەوت، باوکت ڕۆیشت بۆ بەغدا و پێی گوتم:

- ئەگەر کوڕت بوو، ئەم بازووبەندەی لە بازوو ببەستە و بۆم ڕەوانەی بەغدای بکە.

کوڕەکە نزیکەی بیست هەزار لیرەی برد و چووە بەغدا. لەوێ کەسی نەدەناسی. لایدایە ماڵێکی نزیک ماڵی باوکی و دوکانێکی قوماشفرۆشی کردەوە. کوڕەکە گەنجێکی قۆز بوو. هەموو ڕۆژێ کە دوکانی دوکردەوە نەختێ قورئانی دەخوێند. دەنگێکی زۆر خۆشی هەبوو. خەڵک دەهاتنە لای و شتی خۆیان لێدەکڕی. کوڕەکە ناوبانگی دەرکرد. ماڵی سوڵتان پێیانزانی. کچی سوڵتان بە کچی وەزیری گوت:

- وەرە بچینە دوکانی ئەو کوڕە بزانین چ دەفرۆشی؟

کچی وەزیر گوتی:

- با بچین.

جلی نوێیان لەبەرکرد و چوونە دوکانی کوڕەکە دیتیان گەنجێکی قۆزە وەکوو مانگ دەدرەوشێتەوە. ئەشقی بوون. هەموو ڕۆژێ دەچوون شتیان لێ دەکڕی و گوێیان دەدایە قسەکانی. ڕۆژێ، چوونە لای و پێیان گوت:

- بۆ نایەی دۆستایەتیمان بکەی؟

کوڕەکە گوتی:

- با بە کەیفی ئێوە بێ.

گوتیان:

- لە دوکانی تۆوە نوێنێك لێ دەدەین بۆ ماڵی خۆمان.

گوتی:

- باشە.

لە دوو وەستایان نارد، نۆینێکی بیٚ وێنەی بۆ دروست کردن و بە گەچ سپی کرد. کرێکارەکان ئیشەکەیان تەواو کرد. کچەکە سەد لیرەی داو دەرگایەکی لەناو دوکانی کوڕەکە کردەوە. هەر کاتیٚ کوڕە بیویستایە دەرگاکەی دەکردەوەو بە ناو نۆینەکەدا دەچووە لای کچەکان. بەم جۆرە، هەموو ڕۆژیٚ کوڕەکە لە ژوورەوە دەرگای دوکانەکەی قوفڵ دەداو دەرگای نۆینەکەی دەکردەوە. بە ناو نۆینەکەدا دەچووە لای کچەکان و گەمەو سوحبەتی لەگەڵ دەکردن. بەلاٚم کە دەیەویست لەگەڵ خوشکی خۆی بخەویٚ، زەوقی هەڵنەدەستا. هەموو ڕۆژیٚ، هەر وا بوو. کوڕەکە ناوبانگێکی زۆری لە شار پەیدا کرد. سوڵتان ناوبانگی بیست، بە وەزیری گوت:

- با بچینە دوکانی ئەو کوڕە بزانین چ دەفرۆشیٚ؟

وەزیر گوتی:

- یەکەم جار من دەچم دەیبینم، پاشان تۆ بڕۆ.

سوڵتان گوتی:

- باشە.

بەرەبەری ڕۆژئاوا، وەزیر چووە دوکانی کوڕەکە. کوڕەکە لەبەری هەستا، شتێکی بۆ لە ناو دوکان ڕاخست. دانیشتن دەستیان بە قسان کرد. تا سەعات دووی پاش نیوەشەو کۆڕیان گەرم بوو. ئەوان دانیشتبوون دەرگای نۆینەکە کرایەوەو قەرەواشێکی لیٚ هاتە دەرەوە. گوتی:

- جەناب، خانمەکەم تۆی دەویٚ.

کوڕەکە پێی گوت:

- بڕۆ پێی بڵیٚ میوانم هەیە.

وەزیر کە تەماشای کرد دیتی ئەمە قەرەواشی خۆیانە. قەرەواشی سوڵتانە. واقی وڕما. لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەوە مەسەلە چییە؟

قەرەواشەکە چوو بە خانمی گوت:

– دەڵیٚ میوانم هەیە.

خانم گوتی:

- بڕۆ پێی بڵیٚ بە خۆو بە میوانەوە بیٚ.

کوڕەکە بە میوانەکەی گوت:

هەستە با بچین. فانوسی پێکردو بە ناو نۆینەکەدا چوون تا گەیشتنە شوێنی مەبەست. وەزیر هەر هێندەی زانی وا لە ماڵی خۆیانە. سەری سوڕما. بەڵام هیچ قسەی نەکرد. کچی سوڵتان و کچی وەزیر کوڕەکەیان بردە سەلال و لەگەڵی خەوتن. وەزیر لەگەڵ قەرەواشەکە مایەوە. قەرەواشەکە نەیدەزانی ئەمە وەزیرە. دەستی وەزیری گرت و ڕایکێشا بۆ ناو نوێنی خۆی و لەگەڵی ڕاکشا. وەزیری ڕادەگوشی و دەیگوت:

دەی هەستە بکە!

وەزیریش دەیگوت:

. تکات لێدەکەم وازم لێ بێنە.

قەرەواشەکەش هەر پێی دەگوت:

. قەت نابێ بخەوی.

قەرەواش و وەزیر تا بەیانی بە گەمەو گاڵتە ڕایانبوارد. زستان بوو سبەینە داهات، دوو کچەکە ئاویان بۆ کوڕەکە گەرم کردو کوڕەکە خۆی شووشت. قەرەواشەکەیش چوو جەرەی ژێر کووپەی هێنا ئاوەکە تەزی بوو. بە سەر سەری وەزیری داکرد. وەزیر هاواری لێ هەستا. لە سەرمان هەڵدەلەرزی. وەزیر چووە لای سوڵتان و پێی گوت:

. جەنابی سوڵتان، وای ئەو کوڕە ڕابواردنێکی خوشی هەیە!

سوڵتان گوتی:

. بە ڕاستیتە؟

وەزیر گوتی:

. ئەرێ بەخوا!

سوڵتان چووە دوکانی کوڕەکەو سەلامی کرد. کوڕەکە سەلامی لێوەرگرتەوە. سوڵتان لە کنی دانیشت. دەستیان بە دەمەتەقە کرد تا شەو داهات. بوو بە سەعات دووی دوای نیوەشەو، ئەوان دانیشتبوون، دەرگای نۆینەکە لە ناو دوکان کرایەوە. قەرەواشەکە هات بە کوڕەکەی گوت:

. جەناب، وەرە خانم داوات دەکا.

کوڕەکە گوتی:

. پێیبڵێ میوانم هەیە.

کە قەرەواشەکە هاتە ژوورەوە، سوڵتان بینی ئەمە قەرەواشەکەی خۆیانە. لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەوە مەسەلە چییە؟ بەخوا قسە ناکەم بزانم ئەمە بە چ دەگا؟ قەرەواشەکە چووە لای خانمەکەی و خەبەری دایێ و گوتی: دەڵێ میوانم هەیە.

خانم گوتی:

. بڕۆ بانگی کە پێی بڵێ خۆی و میوانەکەی بێن!

قەرەواشەکە هاتەوە، گوتی:

. خانم دەڵێ بە خۆی و بە میوانەکەی بێن!

کوڕەکە بە سوڵتانی گوت:

. هەستە با بچین!

فانوسی بە دەستەوە گرت و چوونە ناو نۆینەکە. سوڵتان سەری لەم کارە سوڕما. گەیشتنە شوێنەکە. سوڵتان بینی ئەمە ماڵی خۆیانە. هەر واقی وڕما. کە چوونە ژوورەوە، دوو کچەکە کوڕەکەیان بردە سەلال. قەرەواشیش سوڵتانی گرت و گوتی:

. وەرە تۆیش لەگەڵ من بخەوە.

سوڵتانی بردە ناو نوێنی خۆی و تا بەیانی توند بە خۆیەوە گوشی. بەیانی، کچەکان ئاویان بۆ کوڕەکە گەرم کردو کوڕەکە خۆی شووشت. قەرەواشەکە بە سوڵتانی گوت:

. تۆیش دەبێ خۆت بشۆی.

چوو جەڕەی ژێر کووپەی هێنا و بە سەر سەری سولتانی داکرد. سوڵتان لە سەرمان وەك بەفری لێهات و بە لێوەلەرزە چووە دەرەوە. سوڵتان گەڕایەوە لای وەزیرو گوتی:

. کورە، ئەوە ئەم بەزمە چییە؟

وەزیر گوتی:

. ئەوەی بە سەر من هات، بە سەر تۆش هات؟

سوڵتان گوتی:

. ئەی بۆچی پێشتر پێت نەگوتم؟

وەزیر گوتی:

ـ ئاخر نەمویست من بە تەنیا دەردی ئەم سەرمایە بچێژم. ویستم تۆیش بەشداریم بکەی!

ئینجا سوڵتان بە وەزیری گوت:

. ئێستا چ لەو کوڕە بکەین؟!

وەزیر گوتی:

. بانگی ماڵی خۆتی بکەو سەری ببڕە!

سوڵتان گوتی:

. تەکبیرێکی باشە.

سوڵتان زیافەتێکی بە تەنتەنەی کردو کوڕەکەی بانگهێشت کرد. کوڕەکە چوو شێوی خوارد. کە لە شێو بوونەوە، پێیان گوت:

. کورە تۆ کێی؟ ئیشت چییە؟ خەڵکی کوێی؟ باوکت چ کەسە؟

کوڕەکە گوتی:

. هەقتان نییە ئەم پسیارانەم لێ بکەن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێتان دەڵێم:

– (من دایکم کچی شێخی عارەبانەو باوکم شارستانە، خەڵکی بەغدایە. ڕۆژێ، باوکم دێتە ناو عوربان و دەبێتە میوانی باپیرم. باپیرم کچی خۆی دەداتە باوکم و باەکم دەچێتە لای و حەوت مانگ لەوێ دەمێنێتەوە. پاش حەوت مانگەکە، بە دایکم دەڵێ: من دەچمە بەغدا. ئەگەر کچت بوو با لای خۆت بێ و ئەگەر کوڕت بوو، ئەم بازووبەندەی لە بازووی ببەستەو بۆمی ڕەوانەی بەغدا بکە. دایکم منی بوو. تەمەنم بوو بە دوازدە ساڵی، دایکم بازووبەندەکەی لە بازووم بەست. ڕۆژێ، لەگەڵ برادەرەکانم یاریم دەکرد. بە شەڕ هاتین. پێیان گوتم: بڕۆ هەی زۆڵی حەرمزادەی بێ باوك! کە ئەمەم بیست، کوڕە کرمانج و کۆچەر بووم، دەستم دایە شمشێرو چوومە لای دایکم. پێم گوت: پێم بڵێ باوکم لە کوێیە؟ گوتی: باوکت لە بەغدایە. ئەم بازووبەندەی دامێ لە بازووت ببەستم و گوتی با بێتە بەغدا. منیش هاتمە بەغدا. ئەوە عەیامەکە لێیدەگەڕێم تا ئێستا نەدۆزیوەتەوە).

سولتان کە گوێی لە بەسەرهاتی کوڕەکە بوو، پەنجەی خۆی گەستو بە وەزیری گوت:

. خوایە لە ڕوحمو کەرەمت بە زیاد بێ!! چا نەبوو سەرمان نەبڕی! بە دەستی خۆم کوڕی خۆم کوشتبا، چم دەکرد؟

سولتان هەستا کوڕی خۆی گرتە باوەشو ماچی کردو گوتی:

ـ من باوکی تۆم. ئەو کچەیش کە هەموو شەوێ لەگەڵیا دەخەوی خوشکی خۆتە. کچەکەی تریش کچی ئەم وەزیرەیە!

کوڕەکە، کە ئەمەی بیست، واقی وڕما. بە باوکی گوت:

. بەخوا باوکە، قەت ئیشی خراپم لەگەڵ خوشکم نەکردووە. هەر جارەی لەگەڵیا دەنووستم. سارد دەبومەوەو زەوقم نەدەما. بەلام کە دەچوومە لای کچەکەی وەزیر، زەوقم دەکرایەوەو ئیشی خۆم لەگەڵ دەکرد. سولتانو وەزیر پێیان گوت:

. ئێستا کچی وەزیرت دەوێ؟

گوتی:

. بەڵێ دەمەوێ.

سولتان، کچی وەزیری لە کوڕەکەی مارە کردو نامەیەکی بۆ شێخی عارەبانی باپیری کوڕەکەی نووسی: (کوڕەکەتان گەیشتە لامان. دڵتان پێیەوە نەبێ!)

ئینجا (دە) ڕۆژ ئاهەنگی زەماوەندی سازداو کوڕەی لە پاڵ بووك کرد. هەموو بە شادیو خۆشی ژیان.

کوڕەکە هەموو ڕۆژێ لەگەڵ باوکی دەچوو دەیگەیاند سەرا. دوو مانگ پێچوو خەڵك هەموو ناسییان. زانییان ئەمە کوڕی سولتانە. دوای ئەو دوو مانگە باوکی نەخۆش کەوت. تەبیبیان هێنایە سەر. تەبیب داوو دەرمانی دایێ. دادی نەدا. دوو مانگ بە دەست نەخۆشی تلایەوە، ئەوسا ئەمری هەقی بەجێ گەیاند. کوڕەکە حەفت ڕۆژ پرسەی بۆ دانا. خێرو سەدەقەی بۆ ڕۆحی کرد. کە تازیەو خێر هەڵگیرا. کوڕەکە لە جێی باوکی بوو بە سولتانو لە سەر کورسی سەڵتەنەت دانیشت. پاش مانگێك، لە دوو دایکی ناردو هێنایە لای خۆی. بە سەرو دڵێکی ڕحەتو سحەت ژیان. کوڕەکە، وەزیری باوکی لای خۆی

هێشتەوە. وەزیر پیر بوو و کەوتە ناو ساڵان. نەخۆش کەوت و کۆچی دوایی کرد. ئەوسا کوڕەکە وەزیرێکی تری دانا. هەموو بە شادی و بەختەوەری ژیان. لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

* * *

## ٣٣ـ له ده کچان، کچێك

هەبوو نەبوو...

شێخێکی عارەبان هەبوو، ژنێکی زۆر جوانی هێنا بوو. باسی شۆخ و شەنگی ئەو ژنە بە زمان ناکرێ. شێخ چووە لای ژنەکەو ژنەکە منداڵێکی بە سکی کەوت. کە سکەکەی دانا و منداڵی نۆبەرەی بوو. منداڵەکە کوڕێکی ئەوەندە جوان بوو دەتگوت تیشکی مۆمە. دوای ئەوە یەك لە دوای یەك کچی بوو. هەر جارەی کچی دەبوو، شێخ سەری کچەکەی دەبڕی. خەڵك دەیان گوت:

. بۆچی سەری ئەم کچانە دەبڕی؟

دەیگوت:

. ئێمە کۆچەرین. کچ تووشی شەرم و شوورەیی وامان دەکەن ڕوومان پێ ڕەش دەبێ.

شێخ (دە) ساڵ ئەمە ئیشی بوو. دەوری (دە) کچی خۆی سەر بڕی! کوڕەکەی گەورە بوو. تەمەنی گەیشتە دەوری (دە)ساڵی. ڕۆژێ، باوکی ویستی بچێتە حەج، پێی گوت:

. کوڕم، دایکت دووگیانە. ئەگەر کچی بوو سەری کچەکە ببڕەو خوێنەکەیم بۆ لە فتنجانێك بکەو هەڵیگرە تا دێمەوە.

کوڕە گوتی:

. باشە باوکە، چ دەڵێی وا دەکەم!

کابرا چووە حەج. دایکی کوڕەکە سکی هەبوو. پاش ماوەیەك کچێکی بوو وەکوو مانگ دەدرەوشایەوە. براکەی سەیری کرد خوشکی زۆر جوانە. بە دایکی گوت:

- دایکە، با سەری نەبڕین. با لای دراوسێیەکی دابنێین. کە گەورە بوو و باوکم چاوی پێکەوت، بەلکو دڵی بۆ ببزوێ‌و چاو لە کوشتنی بپۆشێ.

دایکی گوتی:

- باشە کوڕم!

دایکە کچەکەی بردە ماڵە دراوسێیەك. سێ جەمە نان‌و خواردنی بۆ دەنارد. تا تەمەنی بوو بە حەفت ساڵی. لەولاوەش کاتێ باوکە لە حەج هاتەوە، بە کوڕەکەی گوت:

- کوڕم، دایکت چی بوو؟

کوڕەکە گوتی:

- دایکم کچێکی بوو. سەرم بڕی‌و خوێنەکەم بۆ تۆ لە ناو فنجانێك کرد.

باوکە گوتی:

- کوانێ؟

کوڕەکە فنجانە خوێنێکی بۆ هێناو گوتی:

- ها ئەوەتانێ!

باوکە فنجانە خوێنەکەی وەرگرت‌و بە سەردەمییەوە کردو بە یەك بێن خواردییەوە. گوتی:

- ئۆخەی! ئۆخ!

کچەکە لە ماڵی دراوسێکەیان بوو. ئەوەندە جوان بوو دەتگوت بووکە شووشەیە. ڕۆژێ، دایکە بە کچەکەی گوت:

- کە باوکت هاتەوە، وەرە ژوورەوە بۆ لامان‌و داوای ئاگرمان لێ بکە. بەڵکو باوکت دڵی بۆ تۆ نەرم بێ‌و بە کچی خۆت قبووڵ بکا. ڕۆژی پاشی، بەیانی، کە شێخی باوکی کچەکە لە خەو هەستا، کچەکە دەستی دایە قاپێك‌و چووە ماڵی خۆیان‌و گوتی:

- هەندێ ئاگرم بدەنێ بۆ چێشت لێنان. دایکی گوتی:

. دە وەرە ژوورەوە.
کچەکە چووە ژوورەوە. کە بە لەنجەو لار دەڕۆیشت، شرقە شرقی خڕخاڵی دەهات. باوکی چاوی پێکەوت، گوتی:
- ئۆی! ئەم کچە چەند جوانە! خوا وای نەکرد من ببم بە خاوەن کچ. ئەگەر ژنەکەم ئەم جارە کچی بوو، قەت سەری نابڕم.
ژنەکەی گوێی لێبوو شێخ وا دەڵێ، هات پێی گوت:
. چ دەڵێی؟!! ئەی ئەگەر ئەمە کچی خۆت بێ قبووڵی دەکەی؟!
گوتی:
. ئەرێ بە خوا!
ژنەکە گوتی:
- مادام وایە با ڕاستیت. پێ بڵێم: ئەمە کچی خۆتە. کاتێ کە تۆ چوویتە سەفەرو بە کوڕەکەمانت گوت: ئەگەر دایکت ئەمجارەیش کچی بوو، سەری کچەکە ببڕەو خوێنەکەیم بۆ لە ناو فنجانێك هەڵگرە تا دێمەوە. گوتی: باشە! پاش ماوەیەك ئەم کچە جوانەم بوو. لە ماڵی دراوسێیەکمان شاردمانەوە. ئەمە کچی خۆتە یا شێخ!
شێخ گوتی:
. من بەقاو متمانەم بە ژنان نییە.
هەستا کۆشکێکی بلووری بۆ کچەکەی لە ناوەندی بیابان دروست کرد. پاسەوانی لە دەوری کۆشکەکە دانا و کچەکەی بردە ناوێ. کچەکە دەوری (دە) ساڵ لە ناو ئەو کۆشکە مایەوە. ڕۆژێ، لە دڵی خۆیدا گوتی:
. خۆ من لە ناو ئەو کۆشکە سیق و دیقم کرد!! با لایەکی شووشەی پەنجەرە بشکێنم و نەختێ سەیری دونیا بکەم. کچەکە نزیکەی دوو گەز شووشەی پەنجەرەکەی شکاندو سەیری دەشت و بیابانی کرد دیتی خیوەتێك هەڵدراوە. گەنجێك لە خیوەتەکە هاتە دەرەوە ئەوەندە جوان بوو دەتگوت مانگە. کچەکە ئەشقی گەنجەکە بوو. بێ ئەوەی پاسەوان پێی بزانن لە سەر کۆشکەکە هاتە خوارێ و چووە لای کوڕەکە. کوڕەکە، کاتێ چاوی بە نازداریی کچەکە کەوت، بوورایەوە و بەربووەوە. کچەکە گوڵاوی لە ڕوو پرژاند. کوڕەکە چاوی کردەوە.

کە چاوی کردەوە لێی هەستایەوەو ڕایماشتیّو کچێنی برد. کچەکە لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ لای مایەوە. کاتی فراوین گەڕایەوە کۆشکی خۆی. کچەکە دوو مانگ هاتوچۆی کوڕەکەی کرد. ڕۆژێ، کچەکە چووە لای کوڕەکە، لەبەر دەستگەمەو ڕابواردنو حەنەكو لاقردێ تا عیشایێ خۆی لە بیر کرد. لە دڵی خۆیدا گوتی:

. تاخیر بووم لەوانەیە باوکم پێی زانیبێ!

کوڕەکەیش لە دڵی خۆیدا گوتی:

. باوکی پێ بزانێ بەیانی دێ سەرم دەبڕێ!

کچەکە ترسا بگەڕێتەوە ماڵێو کوڕەکەیش لە ترسی باوکی کچەکە ئۆقرەو هەدادانی نەبوو. ماوەیەکی تر ڕایانبوارد خەویان لێکەوت. کوڕەکە بە ئاگا هات. لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەم کچە بە خەوتوویی جێ دێڵمو سەر هەڵدەگرم دەڕۆم. بێگومان ئەمەی پێ خۆش نەبوو چونکە نەیدەتوانی لە کچەکە جیا بێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ملی ڕێی گرتو ڕۆیشت. ڕایدەکردو دەگریا. بەیانی کچەکە بە خەبەر هات. سەیری دەوروبەری خۆی کرد، کەس دیار نەبوو. زانی کوڕەکە ڕایکردووەو جێی هێشتووە. ئەویش ملی ڕێی گرتو ڕۆیشت. سەعاتێك بە دوو کوڕەکەدا ڕۆیشت گەیشتە شوانێك پێی گوت:

. مامە، وەرە جلمان بگۆڕینەوە. من ئەم زێڕو خشڵو جلانەی خۆمت دەدەمێ، تۆش جلی خۆتم بدێ. شوانەکە گوتی:

. باشە.

کچەکە جلی شوانەکەی کردە بەرو بوو بە شوانێکی تەواو! هیچ جیاوازی لەگەڵ شوانەکەدا نەبوو. ملی ڕێی گرتو بە دوای کوڕەکەکەدا ڕۆیشت. بەینەك پێچوو، گەیشتە کوڕەکە. کوڕەکە هەر دەگریاو ئاوڕی لە دواوە دەدایەوە. کچەکە بە بەرگی شوانی گەیشتە لایەوە. ئەو هەر بە شوانی تەنیشت خیوەتەکەی خۆیانی تێگەیشت. کوڕەکە بە شوانەکەی گوت:

. شوانەکە!

گوتی:

. بەڵێ

گوتی:

- (لە هۆدەی شووشە بۆم هات!!)

شوانەکە گوتی:

بووکیان تالآن کردووە،
خڕخاڵی لە زێڕ کردووە،
دەگری و دەنالێنێ،
دەڵێ:
ئازیزەکەم، ئازیزی خەڵك،
ئازیزی داخ و کەسەر،
لە خەو هەڵینەساندم
تا بە ئاشتی بە ڕێی کەم.

کاتێ کوڕەکە ئەمەی لە شوانەکە بیست، گوتی:

- کاکەی شوان! جیرەت لای منە با بچینە ماڵی ئێمە.

گوتی:

- باشە.

پاش سەعاتێ کوڕەکە دیسان پێی گوت:

- شوانەکە (لە هۆدەی شووشە بۆم هات!!)

شوانەکە گوتی:

بووکیان تالآن کردووە،
خڕخاڵی لە زێڕ کردووە،
دەگری و دەنالێنێ،
دەڵێ:
ئازیزەکەم، ئازیزی خەڵك،
ئازیزی داخ و کەسەر،
لە خەو هەڵینەساندم
تا بە ئاشتی بە ڕێی کەم.

که شوانەکە ئەم قسانەی بۆ کوڕەکە دەکرد، کوڕەکە شێت دەبوو. نەیدەزانی ئەمە شوان نییەو دۆستەکەی خۆیەتی! بردییەوە ماڵێ. کە چوونەوە ماڵێ، کەس و کاری کوڕەکە پێیان گوت:

. بە خێر بێیتەوە!

کوڕەکە بایەخی بە هیچ کەس نەدەدا. هەر خەریکی شوانەکە بوو. پاش بەینێ بانگی کرد:

. شوانەکە (لە هۆدەی شووشە بۆم هات!!)

ئەویش قسەکانی بۆ دووبارە کردەوەو کوڕەکە دڵی داکەوت. دەوری دوو مانگ کچەکە بە بەرگی شوانی لای کوڕەکە مایەوە. هەر جارەی کوڕەکە غەریبی هەستاباو یادی کچەکەی بکردایە، بە شوانەکەی دەگوت:

. شوانەکە (لە هۆدەی شووشە بۆم هات!!)

شوانەکەیش بە قسەکان وەڵامی دەدایەوە.

ڕۆژێ، دایکی کوڕەکە بە کوڕەکەی گوت:

. کوڕم، وەرە دۆتمامەکەتت بۆ بخوازم!

کوڕەکە وای لێهاتبوو ئەگەر گوێی لە ژنهێنان و زەماوەند ببایە، دڵی دەگوشراو هاواری دەکردو وەکوو شێتی لێ دەهات. بانگی شوانەکەی دەکردو دەیگوت:

. (لە هۆدەی شووشە بۆم هات!!)

شوانەکەیش دەیگوت:

بووکیان تاڵان کردووە،
خڕخاڵی لە زێڕ کردووە،
دەگری و دەناڵێنێ،
دەڵێ:
ئازیزەکەم، ئازیزی خەڵك،
ئازیزی داخ و کەسەر،
لە خەو هەڵینەساندم
تا بە ئاشتی بە ڕێی کەم.

کوڕەکـە، کـە گـوێی لـەم قسـانە دەبـوو، دڵـی هێـور دەبـووەوەو بـە شـوانەکەی دەگوت:

. شوانەکە، تۆ ڕۆحی منی! تۆ چاوی منی! تۆ دڵی منی!

ماوەیەکی پێچوو، دایکی کوڕەکە دووبارە لە سەر مەسەلەی زەماوەند ڕووی لە کوڕەکەی نا. کوڕەکە یەکسەر کچەکەی بیر کەوتەوە. دڵی گوشراو وەکو شێتانی لێهات و بە شوانەکەی گوت:

. شوانەکە، (لە هۆدەی شووشە بۆم هات!!). قسەکەت دووبارە بکەوە. شوانەکە گوتی:

بووکیان تالان کردووە،
خڕخاڵی لە زێڕ کردووە،
دەگری و دەنالێنیٚ،
دەڵێ:
ئازیزەکەم، ئازیزی خەڵك،
ئازیزی داخ و کەسەر،
لە خەو هەڵینەساندم
تا بە ئاشتی بە ڕێی کەم.

ماوەیەك بوو کوڕەکە هەموو جاریٚ گوێی لەم قسانە دەبوو، بەڵام ئەم کوندەبۆیە نەیدەزانی شوانەکە ژنی خۆیەتی. دایکی پێی گوت:

. کوڕم تۆ چیت بە سەر هاتووە. پێم بڵیٚ.

کوڕەکە هەقایەتی خۆی لە سەرەتا تا کۆتایی بۆ دایکی گێڕایەوە. دایکی بۆی گریا و پێی گوت:

ـ کوڕم، ئیشەڵڵا خوا جێی ئەو خۆشەویستییە ناکامەت بۆ پڕ دەکاتەوە. دۆتمامەکەت کچێکی خاتوون و جوانە. دە پێی ڕازی بە. لیٚ گەڕیٚ بۆتی بخوازم. کوڕەکە گوتی:

. باشە، دەبرۆ. بیخوازە!

دایکە خەبەری بۆ خەسووی نارد کە پسمامی فڵانە کچ دەیەوێ ئەو کچە بێنێ. کەس‌و کاری کچەکە هەوەسیان بەو خەبەرە هات. باوکی کچەیش زۆری پێخۆش بوو. نەختیان نارد. کەس‌و کاری کچەکە جیازیان کڕی‌و هێنایان.
ڕۆژی پاشی، بووکیان گواستەوە. کاتێ کوڕەکە بیستی بووکیان هێنا، هاواری کرد:

. ئاخ! ئاخ! شوانەکە، (لە هۆدەی شووشە بۆم هات!!)

شوانەکە گوتی:

بووکیان تالآن کردووە،
خڕخاڵی لە زێڕ کردووە،
دەگری‌و دەنالێنێ،
دەڵێ:
ئازیزەکەم، ئازیزی خەڵك،
ئازیزی داخ‌و کەسەر،
لە خەو هەڵینەساندم
تا بە ئاشتی بە ڕێی کەم.

کوڕەکە، کە ئەمەی گوێ لێبوو سوکنایی دڵی هات‌و هێور بووەوە. ئینجا گوتی:

. شوانەکە، تۆ لەبەر دەرگای ژوورەکەمان دانیشە.

بەرە بەری ڕۆژئاوا، بووکیان هێنا‌و بردیانە ژوورەوە. (شوان)ەکەیش، کە کچەکەی دۆستی بوو، دەترسا بڵێ: من فڵانە کچم! دەترسا نەوەك کەس‌و کاری سوڵتان بیکوژن. تا عیشایێ لەوێ مایەوە. کوڕەکە لەگەڵ خەڵکەکە هات، بەڵام هیچ بایەخی بە زەماوەندەکە نەدەدا، هەست‌و هۆشی هەر لە لای (شوان)ەکە بوو. کوڕەکەیان هێنا لە پاڵ دۆتمامیان کرد. کوڕەکە (شوان)ەکەی بیر کەوتەوە. لە ژوورەوە هاواری کرد:

. هۆ شوانەکە!!

گوتی:

. بەڵێ!

گوتی:

- (لە هۆدەی شووشە بۆم هات!!)

(شوان)ەکە قسەکانی بۆ دووبارە کردەوە.

ڕۆژی پاشی، کوڕەکە پێی گوت:

(شوان)ەکە تۆ لێرە دانیشە. من هەتا بازاڕ دەچم ئێستا دێمەوە. کە ئەو ڕۆیشت، (شوان)ەکە، کە کچەی دۆستی کوڕەکە بوو، هەستا جلی شوانی لەبەر خۆی داکەندو خۆی شووشت. بوو بە کچێکی وا قەت کچی وا جوان نەبووە! دەستی دایە چەقۆیەکی تیژی وەکوو ئاگر. چووە سەلال بۆ لای ژنی کوڕەکە. چەقۆیەکی لە ورگی داو ورگی دڕاند. ژنەکەی مرد. ئینجا چووە سەربان، لە سەر پشت ڕاکشاو قژی خۆی کردەوەو ورگی خۆشی دڕاندو مرد! نزیکەی سەعاتێك پێ چوو کوڕەکە هاتەوە، لە دەرگاوە هاواری کرد:

- هۆ شوانەکە هۆ!

کەس وەڵامی نەدایەوە.

دیسان بانگی کرد:

- هۆ شوانەکە، شوانەکە!

کەس وەڵامی نەدایەوە.

چووە سەلال بۆ لای دۆتمامی دیتی ورگی هەڵدڕاوەو مردووە. هیچ دەنگی نەکرد چونکە دۆتمامی بەلاوە گرنگ نەبوو. هەرگەڕا گەڕا شوانەکەی نەدیتەوە. چووە سەر بان سەیری کرد شوانەکە کچەی دۆستی بووەو ورگی خۆی هەڵدڕیوە. کە چاوی پێ کەوت، گوتی:

- ئەوە تۆ بووی خۆت کردبوو بە شوان؟!

دەستی دایە چەقۆو ئەویش ورگی خۆی دڕاندو لە تەك کچەکە ڕاکشا. کەس و کاری کوڕەکە چوونە سەلال دیتیان هەر سێکیان بە چەقۆ کوژراون! هەر سێکیان ناشتن و پرسەیان بۆ دانان.

لای ئێوەبووین و هاتینەوە.

* * *

## ٣٤ـ مسكی سوڵتان

هەبوو نەبوو...

سوڵتانێك هەبوو، كچێكی هەبوو زۆری خۆش دەویست. ئەو كچە هەموو ڕۆژێ داخوازیكەری دەهات، بەڵام بە كەس ڕازی نەبوو. باوكیشی كەسی لەوانە بە دڵ نەبوو. كچەكە دەیگوت: من مێرد بە پیاوی ئەم شارە ناكەم. ڕۆژێ، كچەكە بە باوكی گوت:

. باوكە.

باوكی گوتی:

. بەڵێ، كچم.

گوتی:

. بارە گڵێكی سوورم دەوێ.

باوكە ڕایسپارد بارە گڵێكی سووریان بۆ هێنا. كچەكە تەشتێكی هێناو گڵەكەی لە ناو تەشتەكە كردو ئاوی تێكرد تا دە ڕۆژ خوساندی. دوای (دە) ڕۆژ گوڵاوی لێداو قوڕەكەی شێلا. ئینجا كردی بە تۆپەڵێكی گەورەو پەیكەری پیاوێكی لێ دروست كرد. (دە) ڕۆژ لە دیار ئەو پەیكەرە هەر نوێژی كردو خوێندیو پاڕایەوە. دوای (دە) ڕۆژ پاڕانەوە لە خوای بانی سەر، پەیكەرەكە پژمیو ڕۆحی چووە بەرو بوو بە گەنجێكی پازدەساڵی. كوڕێكی قۆز بوو! زۆر قۆز بوو!

سپییەکی سووریاو بوو. وەکوو گەوهەر دەدرەوشایەوە. کچەکە ناوی نا (مسکی سوڵتان).

کچەکە چووە لای باوکی و پێی گوت:

. باوکە، لەم کوڕەم مارە بکە.

باوکی لە کوڕەکەی مارە کرد. کوڕەکە چووە کنی. کوڕەکە لە ماڵی کچەکە مایەوە. بە زاوابەندی لەبەر دەستی خەزووری ئیشی دەکرد. خەڵك لە جوانی کوڕەکە واقیان وڕما بوو. ناوبانگی ئەو کوڕە ڕۆیشت. بەبەر گوێی کچی قڕاڵی فەرەنگ کەوت. کە باسی کوڕەکەیان بۆ کچی قڕاڵی فەرەنگ کرد، کە هێشتا کچ بوو، گوێی لە پەسن و کۆکی کوڕەکە بوو، بۆی شێت بوو. گوتی:

. دەبێ هەر بچم بیبینم!

سواری کەشتی بوو و چووە شاری کوڕەکەو چاوی پێ کەوت. کە چاوی پێکەوت، بۆ جوانی کوڕەکە شێت بوو. نەك بە دڵێك بە سەد دڵ ئەشقی بوو و لەو شارە گیرسایەوە. ڕۆژێ، سوڵتانی خەزووری (مسکی سوڵتان) نەخۆش کەوت و دوای مانگێك ئەمری هەقی بە جێ گەیاند. کە مرد، (مسکی سوڵتان) کفن و دفنی کردو تازیو خێری بۆ دانا. بارو دۆخەکە وەکوو جاران بەردەوام بوو. کچی قڕاڵی فەرەنگ، کە لەوێ گیرسابووەوە، دەیەویست کوڕەکە بخاتە داوێکەوە. بەڵام نەیدەتوانی بەیدەستی بکا و بیرفێنێ. چووە لای ژنێکی جادوکەری ئۆینبازی مەلعوونی کچی مەلعوون!

پارەی دایێ و پێی گوت:

. ئەگەر (مسکی سوڵتان)م بۆ بڕفێنی، هەزار لیرەت دەدەمێ. ژنە جادووگەرەکە گوتی:

. باشە!

ژنە جادووکەرەکە چووە ماڵی (مسکی سوڵتان)و گوتی:

. نەتانزانیوە چ بووە؟

گوتیان:

نەخێر، چ بووە؟

گوتی:

- کچی قرالّی فەرەنگ بە سواری کەشتی هاتۆتە ئێرە.
(مسکی سولّتان) بە ژنە جادووکەرەکەی گوت:
- داپیرە، کچەکە ئێستا لە کوێیە؟
ژنە جادووکەرەکە گوتی:
- هەستە سۆمای چاوم. هەستە کوڕم، وەرە بچین پیشانت بدەم. تەماشای بکە بزانە چەند جوانە!
(مسکی سولّتان) گوتی:
- با بچین.
(مسکی سولّتان) بەگەلّ پیرەژنی جادووکەر کەوت. چوونە کەناری دەریا. ژنەی جادووکەر بردییە ناو کەشتی‌و پێی گوت:
- تۆ لێرە دانیشە تا من دەچم بانگی کچی قرالّی فەرەنگ دەکەم. پیرەژن چووە لای کچی قرالّی فەرەنگ‌و پێی گوت:
- خێرا خۆت کۆکەرەوە! (مسکی سولّتان)م لە ناو کەشتی داناوە!
(مسکی سولّتان) هەر هێندەی زانی کەشتییەکە بە ڕێ کەوت‌و بردی‌و لە شار دوورکەوتەوە. (مسکی سولّتان) دەستی بە هات‌و هاوار کرد. کچی قرالّی فەرەنگ هات، بە دەرمان بێهۆشی کرد. کەشتی ڕۆیشت تا کچە گەیشتەوە ولاّتی خۆیان. کە گەیشتەوە مالّێ، کچەکە بە باوکی گوت:
- باوکە، ئەم کوڕە موسلّمانەم دەوێ. ناوی (مسکی سولّتان)ە!
باوکی گوتی:
- کچم، شوو بە پیاوی موسلّمان مەکە! ئەگەر شتی وا بکەی لێت عادز دەبم.
کچەکە گوتی:
- ئەمە نەبێ مێرد بە هیچ کەس ناکەم.
باوکی کچەکە کچەکەی زۆر خۆش دەویست دلّی نەدەهات دلّی بشکێنێ. ڕازی بوو. کچەکە چووە لای (مسکی سولّتان)و هێنایەوە هۆش خۆی. (مسکی سولّتان) هەستا چاوی هەلّگلۆفت دیتی لە ولاّتی فەرەنگستانە. لە مالّی قرالّەو کچی قرالّی لە تەنیشت دانیشتووە. کچەکە پێی گوت:
- هەستە خۆت بۆ زەماوەندو چوونە پەردە ئامادە کە.

کوڕەکە لەبەر تەنیایی و خەفەتخانی خۆی هەستا چووە پەردە.
ئێستا هەقایەتەکەمان دەچێتەوە لای کچی سوڵتان، ژنی (مسکی سوڵتان):
خەبەریان دایە کچی سوڵتان گوتیان کچی قڕاڵی فەرەنگ مێردەکەی رفاندی و بردی. کچەکە لە پرمەی گریانی دا. هەر گریا و گریا. شەو خەوی لێ نەکەوت. ماڵاوایی لە دایکی کرد و دوو کیسە لیرەی برد و بە کەشتی بە ڕێ کەوت. چل ڕۆژ لە سەفەر دابوو تا گەیشتە شارێك. کە گەیشتە ئەو شارە، پارەی لێبڕا. چوو لە بازاڕ خۆی فرۆشت. یەکێك کڕی و بردییەوە ماڵێ. کە چووە ماڵەکە دیتی هەر نانکەرە و نان دەکا و هەر چێشتکەرە و چێشت لێدەنێ! پێی گوتن:
. ئەوە مەسەلە چییە؟
گوتیان:
. بەخوا کوڕێکمان هەیە هیچ خواردنی بە بەر ڕاناگا. ئەوەی بکەوێتە بەر لەپی دەیماشێتەوە و هەڵیدەوێژنێ. ئازیزە دەترسین لە برسان بمرێ. ڕۆژ هەتا ئێوارێ هەر دەخوا و هەر داوای خواردنی تر دەکا.
کچەکە گوتی:
. تێگەیشتم.
دوای نەختێ گوتی:
. بیست هۆقە شیری مانگام بۆ بێنن. بۆیان هێنا. کچەکە شیرەکەی کوڵاند تا وەکوو کەشتی دوکەڵی لێ بەرز بووەوە. ئەوسا پێی گوتن:
. هەر دوو دەستی کوڕەکە ببەستن و دەمی بەش بکەنەوە. با دەمی بباتە سەر مەنجەڵە شیرەکە. هەر هێندەیان زانی مارێکی کوێرە وەیبابی کەتەو زل لە ناو دەمی کوڕەکە هاتە دەرەوە. بە هەڵمی شیرەکە تۆپی بوو. شڵپەی هات بەربووەوە ناو مەنجەڵەکە. ئیتر کوڕەکە چاك بووەوە و خواردنی وەکوو خواردنی یەکێکی ئاسایی لێهات. باوکی بە کزو غەمباری هاتەوە. مزگێنییان دایێ گوتیان:
. کوڕەکەت چاك بووەوە.
گوتی:
. کێ چاکی کردەوە؟

گوتیان:

ـ ئەو کچەی تازە کڕیوتە.

کابرا چووە لای کچەو گوتی:

ـ بخوازە ماڵی دونیایێ!

کچەکە گوتی:

ـ دەمەوێ ئازادم بکەیتو (دە) کیسە پارەم بدەیتێ.

کچەکە پارەکەی وەرگرتو سواری کەشتی بوو و ڕۆیشت. ڕۆیشت تا گەیشتە ئەو شارەی (مسکی سوڵتان)ی مێردی لێ بوو. چوو نزیکەی (دە) ڕۆژ لە ماڵی پیرەژنێك بوو. ئەوسا بە پیرەژنی گوت:

ـ داپیرە، هاتوچۆت لەگەڵ ماڵی سوڵتان نییە؟

پیرەژن گوتی:

ـ با، کچەکەم کارەکەری (مسکی سوڵتان)ە.

کچەکە گوتی:

ـ بە ڕاستیتە؟

پیرەژن گوتی:

ـ ئەرێ بەخوا.

کچەکە گوتی:

ـ داپیرە، ناتوانی وا بکەی منیش ببمە کارەکەریان؟ بڵێ ئەمەش کچی خۆمەو خوشکی کچەکەی ترمە تا ئێستا لە شارێکی تر بوو. ئێستا هاتۆتەوە. کچەکەیشت ئاگادار بکەوە. هەزار لیرەت دەدەمێ. پیرەژن گوتی:

ـ باشە، خانم.

پیرەژن چووە لا ی کچەکەی لە ماڵی (مسکی سوڵتان)و بانگی کردەوە ماڵێو پێی گوت:

ـ کارەکەرێکی نوێ هەیە، پێتان ناوێ؟

کچەکە گوتی:

ـ بەرێ بە خوا! زۆر لە کارەکەرێك گەڕاین دەستمان نەکەوت.

پیرەژن بە کچەکەی گوت:

. ئەم کچە لەگەڵ خۆت ببەو بە خانم بڵێ ئەمە خوشکمە تازە لە شارێکی تر هاتۆتەوە، با لەگەڵ من لە مدبەق ئیش بکا. کچەکە ژنی (مسکی سوڵتان)ی بردو ئیشی مدبەقیان پێ سپارد. ئەو خانمەی کاتی خۆی مسکی سوڵتانی ڕفاندبوو لە کچی پیرەژنی پرسی:

. فلانە کەس، ئەرێ ئەم کچە جوانەت لە کوێ پەیدا کرد؟

گوتی:

. خوشکمە هەتا ئێستا لە شارێکی تر بوو. تازە هاتۆتەوە. هێناومە لە مدبەق یارمەتیمان دەدا. کچەکە بایەخی بە هیچ شتێك نەدەدا تەنیا دەیەویست کە (مسکی سوڵتان) هات، چاوی پێبکەوێ. دوای نەختێ (مسکی سوڵتان) هات، کە کچەکە چاوی پێ کەوت، دوو دڵۆپە فرمێسکی کەوتە سەر ڕوومەت. فرمێسکەکەی سڕییەوە، ترسا نەوەك هەست پێبکەن. (مسکی سوڵتان) لە نهۆمی سەرەوەی کۆشکەکە بوو. پەنجا ژووری هەبوو. هەر ژوورەی خاوەن پیشەیەکی تێدابوو. بۆ ئەوەی (مسکی سوڵتان) پێویستی بە چوونە بازاڕ نەبێ و کەس نەیبینێ چونکە ژنەکەی دەترسا نەوەك شتێکی بەسەر بێ. تەنانەت بەرگدرووشی بۆ هێنابووەوە ماڵەوە. ژووری بەرگدوورەکە کەوتبووە پشت ژووری (مسکی سوڵتان).

کچەکە دوو مانگ لەوێ مایەوە دەرفەتی نەبوو قسە لەگەڵ (مسکی سوڵتان) بکا، یان بیڕفێنێ. جووتە گوارەیەکی زۆر گرانبەهای هەبوو. گوارەکانی دەرهێنا و نیشانی ژنی (مسکی سوڵتان)ی کچی قڕاڵی فەڕەنگی دا. کە کچی قڕاڵی فەڕەنگ چاوی بە گوارەکان کەوت، زۆری پێ جوان بوو، بە کچەکەی گوت:

. ئەم گوارانە بدە بە من!

کچەکە گوتی:

. یەك شەو مێردەکەتم بدەرێ دەتدەمێ!

ژنەکە گوتی:

. باشە!

کە ڕۆژئاوا بوو، کچی قڕاڵی فەڕەنگ دەرمانی بێهۆشی دایە (مسکی سوڵتان) و لە سەر چوارپا درێژی کردو بە کچەکەی گوت:

- بڕۆ لای.

کچەکە چووە لای (مسکی سوڵتان) سەیری کرد بێهۆش کراوە. هەر تەماشای کردو گریا. بەرگدوورەکە بە ئاگا بوو. لە ژووری خۆی ئیشی دەکرد گوێی لە کچە بوو دەگریا و دەیگوت:

- ئای (مسکی سوڵتان) چۆن تۆیان لە من ڕفاند! دە ڕۆژ قوڕی تۆم شێلا.(دە) ڕۆژ پێوە بووم تا لە سەر شکلی بنیادەم دروستم کردی.(دە) ڕۆژ لە سەرم خوێندیو لە خوا پاڕامەوە. خوا بە (دە) ڕۆژ ڕۆحی بە بەر هێنای. چل ڕۆژ بە تۆوە خەریك بووم. تۆزقاڵێك نە خەوتم. ئێستایش یەکێکی تر دێ لە منت دەڕفێنێ. ئیتر لە پرمەی گریانی دا. کە بەرگدوورەکە گوێی لێبوو. زۆری سك پێی سووتا و بۆی گریا. کڵاوێکی بە دەستەوە بوو دەیدووری، دڵۆپە فرمێسکێکی کەوتە سەر کڵاوەکەو ڕەنگی قوماشەکەی گۆڕی. بەیانی، کچەکە لە ژووری (مسکی سوڵتان) چووە دەرەوە. کچی قڕاڵی فەڕەنگ (مسکی سوڵتان)ی هێنایەوە هۆش خۆیو لە تەنیشتی دانیشت. (دە) ڕۆژ پێچوو، (مسکی سوڵتان) داوای لە بەرگدوورەکە کرد داخۆ کڵاوەکەی تەواو نەبووە!

بەرگدوورەکە گوتی:

- بەڵێ حازرە.

(مسکی سوڵتان) سەیری کڵاوەکەی کرد، ویستی لە سەری بنێ، شوێنی فرمێسکی بەرگدووری بە قوماشی کڵاوەکەوە دی. گوتی:

- ئەم ماکە چییە؟

بەرگدوور گوتی:

- نازانم.

(مسکی سوڵتان) ویستی لێیبدا. بەرگدوور گوتی:

- جەنابی (مسکی سوڵتان) ئەمانم بدە بۆ ئەوەی هەقایەتەکەت بۆ بگێڕمەوە.

گوتی:

- بڵێ ! سەد جار ئەمانت هەیە!

بەرگدرووەکە گوتی:

. شەویَ کارەکەرە نوێیەکەتان هات لە ژووری تۆ نووست. تۆ نووستبووی‌و هیچ هەست‌و خوستت نەبوو. شەو تا بەیانی هەر گریا‌و ئاوها‌و ئەوهای دەگوت.

(مسکی سوڵتان) بە بەرگدرووی گوت:

. بە ڕاستیتە؟

گوتی:

. ئەریَ بە خوا!

(مسکی سوڵتان) پێی گوت:

. بڕۆ با کڵاوەکە دیاری من بیَ بۆ تۆ.

بەرگدرووەکە خەنی بوو. چونکە کڵاوەکە هەمووی زێڕو گەوهەر بوو. (مسکی سوڵتان) لە دڵی خۆیدا گوتی: ئای خوایە ئەوە چۆن خۆی گەیاندۆتە ئێرە!! چەگلی دەگرم‌و هەڵیدەگرم‌و ڕادەکەین! (مسکی سوڵتان)لە ژوورەکەی هاتە خواریَ. بە دزی بانگی کچەکەی کردو گوتی:

. تۆ فڵانە کەسی؟

گوتی:

. بەڵێ.

گوتی:

کەی هاتی؟

گوتی:

. سیَ مانگە!

گوتی:

. تەکبیر؟! چۆن ڕابکەین؟

کچەکە گوتی:

ـ من فێڵێکت بۆ دەدۆزمەوە. دەچمە بازاڕ شتی جوانکاری دەکڕم‌و لە ناو کەشتی دادەنێم. تۆ بە بیانووی دیتنی شتەکان لە فڵانە سەعات وەرە.

گوتی:

. باشە.

کچەکە چوو شتەکانی کڕی. ئینجا چوو ژوورێکی لە ناو کەشتی بە کرێ گرت و کەل و پەلەکانی لە ناو دانا و دانیشت و چاوەڕێی (مسکی سوڵتان)ی کرد. (مسکی سوڵتان)چی کرد؟ چووە لای ژنەکەی و گوتی:

. هەستە بچینە حەمام!

ژنەکە پێی گوت:

. چ حەمامێک؟

گوتی:

. حەمامی ماڵەوە.

ژنەکە جلەکانی (مسکی سوڵتان) شووشت و لێبووەوە. (مسکی سوڵتان) ژنەکەی گرت و لەناو حەوزی ئاوی ناو خنکاندی. ئەوسا جل وبەرگی خۆی کردەبەرو ڕایکرد. چووە لای ژنەکەی، کە لەناو کەشتی دانیشتبوو چاوەڕێی دەکرد. کە ژنەکە دیتی هات، بردییە ناو ژوورەکەو کەشتییەکە بە ڕێ کەوت. بەرەو شاری خۆیان کەوتنە ڕێ. چووەنەوە ماڵێ. پێش سێ ساڵ، کاتێ کچی قڕاڵ (مسکی سوڵتان)ی ڕفاند، کچەکە تازە کوڕێکی ببوو. ئەوسا تەمەنی حەفت مانگ بوو. کە (مسکی سوڵتان) هاتەوە دیتی کوڕەکەی گەورە بووەو لە جێی باوکی بۆتە سوڵتان. کە چوونەوەو دایکی کچەکە چاوی پێکەوتن، لە هەلهەلەی داو گوتی:

. ئەوە چۆن ڕاتان کرد؟

هەقایەتەکەیان لە سەری هەتا بنی بۆ گێڕایەوە.

هەموو بە خۆشی و شادی ژیان.

لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

* * *

## ٣٥ـ دارینە

هەبوو نەبوو...

دوو خوشک هەبوون، یەکەمیان مێردەکەی زۆر دەوڵەمەند بوو و دووەمیان مێردەکەی زۆر دەستکورت بوو. شیوی یەک شەویان نەبوو. ژنی کابرای دەستکورت دووگیان بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: دەچمە ماڵی خوشکم بزانێ دووگیانم کەیفی پێ دێ بەڵکو پارەیەک، جلێک، شتێکم بداتێ. ماڵی خوشکی لەو بەری ڕووبار بوو. لە ڕووبارەکە پەڕییەوەو چووە ماڵیان. سەلامی لێکرد. خوشکی سەلامی لێوەرنەگرتەوە. کچە دەستکورتەکە تا عەسرێ دانیشت، خوشکی قەت نەیگوت: ئەرێ خوشکم، برسیت نییە؟ئەرێ بۆچی هاتی؟ هیچ پێویستیت نییە؟ قەت هیچ دەنگی نەکرد.

خوشکە دەسکورتەکەی گوتی:

. خوشکم، بۆچی ناپرسی: بۆچی لەوێوە هاتووم!؟

خوشکی پێی گوت:

. دە بڵێ چت دەوێ دیسان؟

گوتی:

. دووگیانم، ڕووت و قووتم. هیچم نییە کە منداڵم بوو جلی بۆ بکڕم.

خوشکی گوتی:

- خوشکم، من جل‌و بەرگم لە کوێ بوو؟ تەنیا یەك کراسی کۆن‌و پینە پینەم هەیە، بۆ خۆت ببە. گوتی:
- چ لەو کراسە بکەم.
گوتی:
- سەرم خوا لەوە زیاترم نییە! هەستە برۆ.
کاتی شێو بوو. نە فراوینی دایە خوشکی‌و نە شێو.
خوشکی دەستکورتی هەستا بە هەناسە ساردی ڕۆیشت. وەخت بوو لە برسان بمرێ. کە گەیشتە لای پردی سەر ڕووبارەکە دیتی پردەکە داخراوە. چونکە شەو درەنگ بوو. ژانی گرت، لای دایە شوێنێکی لاچەپ‌و دانیشت. بەرەژانی منداڵبوونی بوو. دیتی سێ ژن هاتن مامانەتیان کرد. کچێکی جوانی بوو دەتگوت مانگە. زۆر زۆر جوان بوو! ژنەکان جلیان کردە بەر مەلۆتکەکەو قۆنداغیان کرد. کە مەلای بەیانی بانگی دا، یەکێ لە ژنەکان گوتی:
- با برۆین. بەڵام بەر لەوەی برۆین، ئێوە چ دیارییەك پێشکەش بەم کچە دەکەن؟
یەکەمیان رووی کردە مەلۆتکەکەو گوتی:
- کچەکە، هەرکاتی گریایت باران بباریٚ!
دووەم گوتی:
- کچەکە، هەرکاتێ دەست‌و پێت شووشت پارچە پەنیرت بەربێتەوە ناو دەست!
سێیەم گوتی:
- کچەکە، هەرکاتێ دەم وچاوت شووشت یاس‌و یاسەمینی لێ بکەوێتە خوارەوە.
ژنەکان ئەمەیان گوت‌و ڕۆیشتن. دایکی کچەکە گوێی لە قسەکانیان بوو، دڵی پێ خۆش بوو. بەیانی، پردەکەیان کردەوە. ژنەکە پەڕییەوەو چووەوە ماڵێ.
مێردەکەی ئەو شەوە بەبێ شێو سەری نابووەوە. بە ژنەکەی گوت:
- ئافرەت، چت لە کن خوشکەکەت هێناوە؟ زۆر برسیم!
ژنەکە گوتی:
- خوا خێرو بەرەکەتی بۆ ناردی!
نەیگوت خوشکم دەری کردم. ترسا بڵێ لە ڕێگا منداڵم بوو، گوتی:

ـ لە ماڵی خوشکم منداڵم بوو. پیاوەکە گوتی:
ـ بە ڕاست؟
ژنەکە گوتی:
ـ زەحمەت نەبێ هەندێ ئاوم بۆ بێنە.
پیاوەکە ئاوی بۆ هێنا. ژنەکە مەلۆتکەکەی شووشت. پارچە پەنیری گەورە گەورە لە کچەکە بەربووەوەو لەگەڵ مێردەکەی تێریان خوارد. ئینجا دەستیان بە پەنیر فرۆشتن کرد تا دەوڵەمەند بوون. بوون بە خاوەنی سامانێکی گەورە. زکاتیان لە رزقی خوا دەرکرد. ژنەکە زۆر شادومان بوو. بە خۆو بە مێردەوە زۆر بە خۆشیی و بەختەوەری دەژیان. کچەکە (کچە مەلۆتکەکەی هەقایەتەکەمان) تەمەنی بوو بە دوازدە ساڵی. ڕۆژێ، چووە سەر جۆگایەك دەم وچاوی خۆی شووشت، یاسیی و یاسەمینی لە دەم وچاو بەربووەوەو پارچە پەنیری گەورەی لە دەست و پێ کەوتە خوارەوە. کوڕی سولتانی شاری دراوسێیان چووبووە دەرەوە بۆ سەیران و سەردانی کوڕی سوڵتانی ئەو شارەی کچەکەی تێدابوو. چاوی بە کچەکە کەوت و ئەشقی بوو. چونکە کچەکە کچێکی زۆرجوان بوو و کوڕی سوڵتان بەربوونەوەی پەنیرو یاس و یاسەمینی بە لاوە شتێکی زۆر عاجباتی بوو. خۆی شاردەوە تا کچەکە تەواو بوو و گەڕایەوە. دوا بە دوای چوو تا ماڵەکەی پێزانی. گەڕایەوە چووە لای کوڕە سوڵتانی برادەری و پێی گوت:
ـ کچێ لەشارەکەتان هەیە دەمەوێ زەماوەندی لەگەڵ بکەم.
گوتی:
ـ دەزانی ماڵیان لە کوێیە؟
گوتی:
ـ بەڵێ!
کوڕی سوڵتان پێی گوت:
ـ هەستە بچین ماڵەکەم نیشان بدە.
چوونە ماڵەکەو لە دەرگایان دا. باوکی کچەکە هاتە دەرەوە، گوتی:
ـ فەرموو چیتان دەوێ؟

گوتیان:
بۆ داخوازی کچەکەت هاتووین.
گوتی:
. بۆ کامتانە؟
کوڕی سوڵتانی خۆیان گوتی:
. ئەم کوڕە کوڕی سوڵتانی دراوسێمانە، حەز دەکا زەماوەند لەگەڵ کچەکەتان بکا.
باوکی کچەکە گوتی:
. ناتوانم بە شووی بدەم. ئێمە ژیانمان لە سەر ئەم کچەیە!
کوڕی سوڵتان هەزار لیرەی دایێ. کچەکەیان مارە کردو کوڕە سوڵتانی میوان گەڕایەوە شاری خۆیانو بە کەسو کاری کچەکەی گوت:
. بە دوای مندا بینێرن!
باوکی کچەکە جیازیی بۆ کچەکە ڕێکخست و جلو کەلو پەلو نوێنیان بۆ کڕی. دایکی کچەکە چووە لای خوشکی دەوڵەمەندیو پێی گوت:
ـ خوشکم، کوڕی سوڵتان کچی منی مارە کردووە. حەز دەکەم تۆ ببی بە بەربووکو کچەکە بۆ کوڕەکە ببەیتە شارەکەیان.
خوشکی گوتی:
. کوڕی کام سوڵتانە؟
گوتی:
. کوڕی سوڵتانی شاری دراوسێمانە.
خوشکە دەوڵەمەندەکە کە ئەمەی بیست لە دڵی خۆیدا گوتی:
کوڕی سولتان کچی ئەم سوزانییە بخوازێو کچی منیش لەو گۆڕە بکەوێو کەس ئاوڕی لێ نە داتەوە؟! ڕاوەستە چی لێ بکەم؟! بە خوشکی گوت:
. تۆ بڕۆ من بەیانی دێم.
کە خوشکی ڕۆیشت، هەستا کچەکەی خۆی بردە حەمام. شووشتیو سووراوو سپیاوی لێدا. ڕۆژی پاشی لەگەڵ کچەکەی چوونە ماڵی خوشکیو بە خوشکی گوت:

- خوشکم، کوا کچەکەت؟

ژنی دەوڵەمەندەکە کولیچەی بە ئاردە گەنمی دروست کردبوو بۆ ڕێگا، پڕ خوێی کردبوو. هەر کەسێ بیخواردایا، لە تێنوێتی ڕۆحی دەردەچوو. هەردوو کچەکەی لەناو کەژاوە نا و بە ڕێ کەوتن، ڕۆیشتن. ماوەیەك ڕۆیشتن بووکی کوڕی سوڵتان گوتی:

- پووریێ، برسیم.

پووری گوتی:

- چەند زوو برسی بووی، خوا لەناوت ببا! هەی کچی فەقیر!!

کولیچەیەکی دایێ. کچەکە کولیچەکەی خوارد. تێنوێتی زۆری بۆ هێنا، گوتی:

- پووریێ، تێنوم.

گوتی:

- تێنووی؟ دایبابم لەناو گۆڕ تێنوو نەبن! زەقنەبووتت خواردووە؟ یاخوا هەزار دەردو بەڵات بە سەربێ.

کچەکە گوتی:

- پوریێ، خوا لە باوکت خۆش بێ. مردم لە تێنوان! نەختێ ئاوم بدێ. ڕۆحم دەرچوو.

پووری پێی گوت:

- بێنە چاوێکت دەربێنم، ئەوجا ئاوت دەدەمێ.

کچە گوتی:

- باشە، چاوێکم دەربێنە!

پووری چاوی ڕاستەی کچەکەی دەرهێنا و چوڕە ئاوێکی دایێ و خواردییەوە.

سەعاتێکی تر ڕۆیشتن، کچەکە دووبارە برسی بوو. بە پووری گوت:

- پووریێ، برسیم!

پووری کولیچەیەکی دایێ. تێنوێتی تەنگی پێ هەڵچنی. بە پووری گوت:

- پووریێ، تێنووم!

پووری پێی گوت:

- تێنوو بووی! دایبابم لەناو گۆڕ تێنوو نەبن! هیچ ئاو نییە!

کچەکە گوتی:

. پورێ، خوا لە باوکت خۆش بێ، مردم لە تێنوان!

پووری پێی گوت:

. وەرە با چاوەکەی ترت دەربێنم، ئەوجا ئاوت دەدمێ!

کچەکە گوتی:

. دەری بێنە!

پووری چاوی چەپەیشی دەرهێنا.

پوورە، کە دیتی کچەکە لە هەردوو چاوان کوێر بوو، لە کەژاوە دایبەزاندو لە سەر ڕێگای دایناو لەوێ جێی هێشت. خۆیو چارەنووسی خۆی! ئینجا جلی بووکێنی کردە بەر کچی خۆیو لە ناو کەژاوە لەبەردەم خۆی دانا. ڕۆیشت تا گەیشتە شاری ئەو کوڕە سوڵتانەی کچەکەی خواستبوو. کوڕی سوڵتان بە یەك لەشکرەوە هات، بووکیان لە پوورە وەرگرتو بردیان لە ژوورەوە دایاننا.

ڕۆژ ئاوابوو خەڵك شێویان خواردو شەو کوڕی سوڵتان چووە لای کچەکە. بەیانی پێی گوت:

. هەستە دەستو پێو دەمو چاوت بشۆ.

کچەکە هەستا دەستو پێو دەمو چاوی خۆی شووشت، کوڕی سوڵتان هیچی لێ نەدی. کچەکە هیچ پەنیری لە ناو دەست و هیچ یاسو یاسەمینی لە دەموچاو نەکەوتە خوارەوە. کوڕەکە لە دڵی خۆیدا گوتی: دیارە ئەو توانایەی نەماوە! کچەکەی زۆر خۆش دەویست. کچەکەی لا مایەوەو بە خۆشیو بەختەوەری ژیان.

ئێستا هەقایەتەکەمان دەچێتەوە لای کچە کوێرەکە:

ئەوە بوو پووری کچەکە کچەی لەسەر ڕێگا فڕێ داو بە جێی هێشت. بۆ بەیانی کابرایەکی بە سالاچووی کۆچەری برسی ڕێی کەوتە ئەو ناوە. کچەی بەو هەموو جلە جوانو گرانبەهایە بینی دیتی ئەو هەموو خشڵەی پێوەیە، ئەویش هەژارو نەدار بوو لە دڵی خۆیدا گوتی: وا بزانم بیبەمەوەماڵێ باشە. جل وبەرگو خشڵی لەبەر دەکەمەوە. جلێکی شڕو کوێنی لەبەر دەکەمو بەری هەڵدەدەم. چووە لای کچەکەو پێی گوت:

. تۆ چی؟ بنیادەمی، یان ئەجندەی؟

گوتی:

ـ بە خوا من بنیادەمم. ئەجندە نیمو جسنترین کەسم.

کچەکە زۆر زۆر جوان بوو. لە کچی پووری جوانتر بوو.

پیرەمێردەکە پێی گوت:

ـ دێی لەگەڵ من بچینە ماڵی ئێمە؟

گوتی:

ـ بەڵێ باوکە! بمبە هەر خوا خەڵك دەوڵەمەند دەكا، دەوڵەمەندت دەكەم!

کچەکە لە دڵی خۆیدا گوتی: وا چاکە تەماعی بدەمە بەر بۆ ئەوەی بایەخم پێ بدا. گوتی: نەختێ ئاوم بۆ بێنە دەم وچاوم بشۆم. پیرەمێرد هەندێ ئاوی بۆ هێناو کچەکە دەم وچاوی خۆی شووشت. پیرەمێرد سەیری کرد پارچە پەنیری لە ناو دەستو یاسو یاسەمینی لە دەم وچاو کەوتە خوارەوە! پیرەمێرد شاگەشکە بوو بە کچەکەی گوت:

ـ کچم، جارێکی تریش دەستت بشۆ. پیرەمێرد برسی بوو زۆری خوارد. تا تێرو پڕ بوو خواردی. ئینجا بردییەوە ماڵێ. بە ژنەکەی گوت:

ـ کچێ ئافرەت، سەیر کە خوا چی پێداوین؟

ژنەکە گوتی:

ـ چی پێداوین؟

پیاوەکە گوتی:

ـ دە تۆ هەندێ ئاو بێنە! کچەکە دەستی خۆی شووشتو پەنیری لە دەستی هاتە دەرێ. ئەوەی خواردیان خواردیانو ئەوەی تریان فرۆشت. کابرا بە خۆیو بە ژنەکەی دوو ساڵ هەر پەنیریان فرۆشت. تا دەوڵەمەند بوونو بوون بە خاوەنی سامانێکی زۆر. ڕۆژێ، کچەکە بە پیرەمێردی گوت:

ـ باوکە، ئێستا من وەکوو کچی خۆت نیم!؟

گوتی:

ـ با، فەرموو چت دەوێ؟

کچەکە گوتی:

ـ دەمەوێ ئەو یاسو یاسەمینە ببەی لەبەر دەرگای ماڵی سوڵتان دای بنێیو بانگ ڕابێڵێ:

های کڕیار!
یاس و یاسەمین
بە چاوی ڕاستە!

چاوێکت دەدەنێ. بەڵام بە پارەی نەدەی ها. تەنیا بە چاوی ڕاستەی بدە!
پیرەمێرد گوتی:
. باشە!
پیرەمێرد چوو بانگی ڕاهێشت:

یاس و یاسەمین
بە چاوی ڕاستە!

ژن، کە سکی دەبێ مەگیرانی بە هەموو شتێ دەکا. ژنی کوڕی سوڵتان مەگیرانی بە یاس و یاسەمین کرد. کە پیرەمێرد ئەو بانگەی ڕاهێشت، ژنەکە گوێی لێبوو، بە دایکی گوت:
. دایکە، هەستە چاوی ئەو کچە گەن و گووە نەفرەتییە بێنە خوارێ. (وایدەزانی کچەکە مردووە) دایکی چاوێکی هێنایە خوارێ. دایە کابراو یاس و یاسەمینەکەی لێ وەرگرت. کابرا چاوەکەی لێوەرگرت و بردییەوە. کچەکە چاوەکەی لە ناو قەپێڵکی چاوی خۆی نا و گوتی: خوایە! بە تەمای تۆ (بسم الله الرحمن الرحيم)! کە چاوەکەی لە ناو قەپێڵکەکە نا، بە کاری خوای چاوی ڕۆشن بووەوە. چاوی کردەوە. سوپاسی خوای کرد. دەشتنوێژی شووشت و دوو ڕکات نوێژی سوپاسبژێری کرد. بیست ڕۆژ پێچوو، دیسان گوتی:
– باوکە!
باوکی گوتی:
– بەڵێ، کچم.
گوتی:
– باوکە! دەمەوێ ئەم جارەیش یاس و یاسەمین ببەی و بچیتە بەر دەرگای ماڵی سولتان و بانگ رابێڵێ:

های کڕیار
یاس و یاسەمین
بە چاوی چەپە!

کاتێ ژنەی دووگیانی کوڕی سولتان گوێی لێ بوو، بانگی دایکی کرد:
– دایکە، هەستە چاوی چەپەی ئەم پوورزا هیچ و پووچە بێنەو بیدە بەم پیاوە.
دایکە چوو. چاوی چەپەی کچەکەی هێناو دایە کابراو یاس و یاسەمینەکەی لێ وەرگرت. کابرایش چاوەکەی وەرگرت و بردییەوەو دایە کچەکەی و گوتی:
– هانێ کچم.
کچەکە چاوەکەی وەرگرت و لە ناو قەپێلکی چاوی خۆی ناو گوتی:
– خودایە! بە تەمای تۆ! (بسم الله الرحمن الحیم). کە چاوەکەی لە ناو قەپێلکەکە نا، بە کاری خوای چاوی ڕۆشن بووەوە. هەستا دەسنوێژی شووشت و دوو ڕکات نوێژی سوپاسبژێری کرد. بەم جۆرە، کچەکە چاوەکانی چاك بووەوەو بە بەختەوەری لە ماڵی پیرەمێردەکە مایەوە.
کچەکە ڕۆژێ، بیری کردەوەو گوتی: بەخوا دەچمە تاقیبی پوورەکەم و کچەکەی.
بە باوکی گوت:
- باوکە، من تۆم دەوڵەمەند کرد وا نییە؟ هەر خوا بەندەی خۆی دەوڵەمەند دەکا.
باوکی گوتی:
- بەڵێ وایە!
کچەکە گوتی:
- ئێستایش دەمەوێ بگەڕێمەوە لای کەس و کاری خۆم. بەڵام قەت لە بیرت ناکەم. هەمیشە پارەت بۆ ڕەوانە دەکەم و کاغەزت بۆ دەنووسم.
پیرەمێرد گوتی:
- چۆن دەڕۆی؟ دەچیتە کوێ؟ تازە بووی بە کچی من!
گوتی:
- ناتوانم لەوە زیاتر بمێنمەوە. دەبێ بڕۆم.
کابرا گوتی:
- کەیفی خۆتە.
کچەکە گوتی:
- ئەو ماڵە هەر ئاوەدان بێ.
ئەویش گوتی:
- خوا لە پەنای خۆت گری!

کچەکە ڕۆیشت، چووە لای دارتاشێك و پێی گوت:

- ها، ئەمە (دە) لیرە. دەستە بەرگێکم لە دار بۆ دروست بکە. هیچ لەشم دیار نەبێ.

دارتاش گوتی:

- باشە.

کچەکە گوتی:

- کەی تەواو دەبێ؟

گوتی:

- (دە) ڕۆژی تر.

دارتاش دەستەبەرگەکەی تەواو کرد. کچەکە کردییە بەرو ڕۆیشت چووە شاری دەزگیرانی. لەوێ بوو بە کارەکەری ماڵی کوڕی سوڵتان کە دەزگری خۆی بوو. دەزگیرانەکەی زۆر کەیفی پێهات. هەمیشە پێی دەگوت (دارینە). دەیگوت (دارینە) چووە کوێ؟ (دارینە) چی لێهات؟ زۆری خۆش دەویست. وایدەزانی پیاوە. (دارینە) سەرپەرشتی خواردن و داوەتەکانی کوڕی سوڵتانی دەکرد. کوڕی سوڵتان هەموو مانگێ نزیکەی (دە) زیافەتی دەکرد.

کوڕی سوڵتان هەمیشە بانگی دەکرد: (دارینە)چی لێهات؟ (دارینە)چووە کوێ؟ نەیدەزانی ئەمە دەزگیرانی خۆیەتی. کوڕی سوڵتان باخێکی هەبوو. کچەکە ڕۆژێ، لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەوە پێنج ساڵە من لێرەم. با بچمە ناو باخ و نەختێ بۆ حاڵی خۆم بگریم و خەم بە با بدەم. کچەکە چووە ناو باخ و لە دەم جۆگا دانیشت. جلە دارەکەی داکەند و لە سەر لێوی جۆگای دانا و چووە ناو جۆگاکە خۆی شووشت. کە خۆی دەشووشت سەلکە پەنیری لێ بەربووەوە. ئەویش پەنیرەکەی دەخستە ناو ئاوی جۆگاکە بۆ ئەوەی کەس نەیبینێ. کوڕی سوڵتان، کە بینی (دارینە) چووە ناو باخ، لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەوە دەچێتە ناو باخ چ دەکا؟ با بچم خۆم لە پەنایەك بشارمەوە. بزانم چ دەکا و چ دەڵێ!! چوو گوێی دایە قسەکانی و گوتی: ئۆی! کەواتە ئەمە ژنەکەمە! نەختێ بە پیاسە بە ناو باخدا گەڕا. کاتێ کچەکە هەستی پێکرد کوڕی سوڵتان لە ناو باخە. جلە دارەکەی کردەوە بەر. دانیشت و لە دڵی خۆیدا گوتی: وا بزانم منی دی! کاتێ کوڕی سوڵتان تووشی هات، پرسیاری لێکرد:

- (دارینه) ئەوە لێرە چ دەکەی؟

گوتی:

- هیچ، هەر وا بە پیاسە هاتووم.

چوونە دەرەوە. کوڕی سوڵتان پێی گوت:

- (دارینه)، ئەمڕۆ زیافەتمان هەیە. سەرپەرشتییەکی باش بکە.

گوتی:

- ئەوەی پێم بکرێ دەیکەم! هەموو شتێ بە کەیفی دڵی تۆ دەبێ.

چوونەوە ماڵێ.

کچەکە لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەگەر کوڕی سوڵتان منی دیبێ و منی ناسیبێ، زیاتر خۆشی دەوێم. کە خواردنم بردە سەلال چەند فەخفوورییەك دەشکێنم. ئەگەر خۆم لێ تووڕە بکا، دیارە هێشتا نەیناسیوم، بەڵام ئەگەر منی ناسیبێ سەرزەنشتم ناکا.

ڕۆژئاوا بوو میوان هاتن. کچەکە خواردنی بردە سەلال. کوڕی سوڵتان لەسەر پلیکانە وەستا بوو. دارینە، کە دوامین دوو فەخفووری خواردنی هێنا، بە ئەنقەس بەریدایەوە. کوڕی سوڵتان گوتی:

- (دارینه)، خوا هەر تۆ سەلامەت بکا فەخفووری قوربانی تۆ بێ. کچەکە لە دڵی خۆیدا گوتی: وا بزانم منی ناسیوە.

(دارینه) سەرپەرشتی میوانەکانی کرد تا تەواو بوو و هەموو ڕۆیشتن. ئەوسا کوڕی سوڵتان پێی گوت:

- وەرە، بۆم باس بکە! ئەوە مەسەلە چییە؟ من تۆم دەویست و داخوازی تۆم کرد، ئەو کچەی تر کێیە؟

کچەکە گوتی:

- ئەی کوڕی سوڵتان، ئەو ژنەی ئێستا لە لای تۆیە، ئەمە کچە پووری منە. کە تۆ منت خواست و مارەت کردم. پوورم بیستی و هات گوتی:

- (من دەبم بە بەربووك و بووك دەبەم دەیگەیەنمە ماڵی مێردی. پوورم هات و کچەکەی خۆی هێنا و ڕازاندییەوە و هاتین. لە ڕێگا من برسی بووم. پوورم کولیچەیەکی سوێری دامێ. کە خواردم تێنووم بوو، پێم گوت: پووریێ تێنووم. گوتی: تا چاوێکت دەرنەهێنم ئاوت نادەمێ. چاوێکی دەرهێنام...)

کچەکە هەقایەتەکەی لە سەری هەتا بنی. بە وردو باریکی بۆ کوڕی سوڵتان گێڕایەوە. کوڕی سوڵتان وەکوو شێت هەستاو گوتی:

. ئەو جلە دارە داکەنە!

کچەکە جلە دارەکەی داکەند دەتگوت مانگە. کوڕی سوڵتان چووە لای پووری کچەکەو پێی گوت:

. فلاّن کەس!

گوتی:

. بەڵێ سۆمای چاوم!

گوتی:

. دەك هەر دوو چاوت دەرێ. کوا کچە خوشکەکەت؟

پووری گوتی:

. کچە خوشکی چی؟ تۆ شێت بووی؟ یان خەونت دیوە. ڕاست بڵێ.

کوڕی سوڵتان پوورەو کچەکەی‌و کوڕەکەی خۆشی کە لە کچەکە بوو هەمووی گرتن‌و هەمووی سووتاندن. ئاهەنگێکی تازەی زەماوەندی گێڕاو لەگەڵ کچەکەدا بە شادی‌و بەختەوەری ژیان.

کچەکە ناردی دایك‌و باوکی هاتن. لە دوو ئەو پیرەمێردەیشی نارد کە دەوڵەمەندی کردبوو. پیرەمێرد بە خۆو بە ژنەوە هاتن. هەموو پێك شاد بونەوەو بە خۆشی ژیان.

ڕۆژێ، باوکی سوڵتان نەخۆش کەوت. دوای نزیکەی مانگێك، چووە بەر دلۆڤانیا خودێ. کفن‌و دفنیان کردو مەولوودیان بۆ ڕۆحی کردو تەهلیلەو خێرو سەدەقەیان بۆ کرد.

لای ئێوە بووین‌و هاتینەوە.

* * *

## ٣٦ـ ماسیگری زاوای سوڵتان

هەبوو نەبوو...

ماسیگرێك هەبوو، چووە دەم ڕووبارو تۆڕی هاوێشت. ڕۆژێ، تۆڕەکەی لە شتێك گیر بوو. ڕایکێشا دیتی جەڕەیە. کە سەری کردەوە دیتی پڕە لە یاقووت. کە چاوی بەم هەموو یاقووتە کەوت، جارێکی تر تۆڕی هاوێشت و جەڕەیەکی تری دەرهێنا. بۆ جاری سێیەم تۆڕی هاوێشتو جەڕەیەکی تری دەرهێنا. بەم جۆرە چوار جەڕەی دەرهێنا. لە دڵی خۆیدا گوتی: بۆچی ئەم هەموو جەڕانە ببەم! سێ جەڕە داوێمەوە ناو ئاو. یەك جەڕە دەبەم بەسسە! کە ئەوەم خەرج کرد دێمەوە تۆڕ داوێمو ئەوانەی تریش دەبەم. چووە لای دایکیو گوتی:

. دایکە، جەڕەیەکی پڕ گەوهەرو یاقووتم دۆزیوەتەوە.

دایکی گوتی:

. بە ڕاست!؟

گوتی:

. ئەرێ بەخوا.

ماسیگرەکە هەموو گەوهەرو یاقووتەکەی فرۆشت. وەستاو کرێکاری هێنا. کۆشکێکی دروست کرد تاکی نەبوو. ئەوسا ڕووی کردە دایکیو گوتی:

. دایکە، بۆم برۆ داخوازی کچی سوڵتان.

دایکی گوتی:

. کوڕم، ئەوە تۆ چ دەڵێی؟ ئەم قسەیە چییە دەیکەی؟ لە خۆت تەریق نابییەوە یەکێ گوێی لەم قسەیە بێ؟

کوڕەکە بە دایکی گوت:

. لە کچی سوڵتان بترازێ قەت کەسم ناوێ!

دایکی هەستا چووەماڵی و سوڵتان و گوتی:

. کوڕەکەم داوای کچی ئێوە دەکا.

دەریان کرد. پیرەژن گەڕایەوە ماڵێ و بە کوڕەکەی گوت:

. کوڕم، تۆ بۆچی لە خوا ناترسی؟! منت نارد دەریان کردم و تێرجوێنیان پێدام.

کوڕەکە بە دایکی گوت:

. بەڕاستیتە؟!

گوتی:

. ئەرێ بە خوا!

ئەم کوڕە برادەری کوڕی وەزیری سوڵتان بوو. وەزیر زۆری خۆش دەویست.

کوڕەکە چووە لای وەزیرو پێی گوت:

. دایکم ناردە ماڵی سوڵتان بۆ داخوازی کچەکەیان دەریان، کردو تێرجوێنیان کرد.

وەزیرگوتی:

. بە ڕاستیتە؟!

گوتی:

. ئەرێ بەخوا.

وەزیر گوتی:

. خەمت نەبێ من ئەو کچەت بۆ دێنم.

کوڕەکە دەستی وەزیری ماچ کرد. وەزیر گوتی:

. خاترجەم بە!

وەزیر چووە لای سوڵتان و پێی گوت:

. ئەی سوڵتانی دونیا!

گوتی:

. بەڵێ.

گوتی:

ـ تۆ بۆچی کچی خۆت نەدایتە ئەم کوڕە دەوڵەمەندە. کوڕێکی زۆر باشە! بە بەختم، ئەگەر من کچێکم هەبایە بە کراسی بەری دەمدایێ.

سوڵتان پێی گوت:

. تۆ دەستەبەری دەکەی کوڕێکی چاکە؟

گوتی:

. بەڵێ.

سوڵتان گوتی:

. بڕۆ پێی بڵێ دایکی بنێرێتەماڵەوە بۆ داخوازی کچەکەم.

وەزیر هەستا چووە لای کوڕەکەو پێی گوت:

. حاڵو مەسەلە ئەوەیە.

کوڕەکە گوتی:

. بە ڕاست! بە ڕاست!؟

گوتی:

. ئەرێ بەخوا. بڕۆ دایکت بنێرە داخوازی. بزانە چەند مارەییان دەوێ.

کوڕەکە چووە لای دایکی و قسەکەی بۆ گێڕایەوەو گوتی:

. دایکە، وەزیر باوکی کچەکەی ڕازی کردووە.

دایکی گوتی:

. کوڕم دەترسم دیسان دەرم کەن.

گوتی:

. نا، بە خوا دەرت ناکەن! باوکی گفتی داوە.

ژنەکە هەستا عەبای لە خۆدا. چووە ماڵی سوڵتان. کەسو کاری ماڵی سوڵتان نەیاندەزانی سوڵتان ڕازی بووە. کە چووە ژوورەوە کارەکەرەکە پێی گوت:

. هەی پیرەژنی گەواد، بۆچی دیسان هاتیتەوە؟

ویستیان لێی بدەن، سوڵتان هاتە ژوورەوەو ئاماژەی بۆ کردن گوتی:

. نا... نا... نا! دایمەڕسێنی.

سوڵتان دانیشت و بە ژنەکەی گوت:

. فلانی، من کچی خۆم داوەتە کوڕی ئەم ژنە. مارەیی کچەکەت چەندت دەوێ پێی بڵێ. ژنەکە ویستی مارەییەکی وا دابنێ پێیان هەڵنەستێ. گوتی:

. مارەییەکم دەوێ بەردەم بێ و نەبڕێتەوە. حەفتەی سەد لیرە.

دایکی کوڕەکە گوتی:

. دەچم بە کوڕەکەم دەڵێم بزانم چ دەڵێ.

چوو قسەی بۆ کوڕەکەی کرد. کوڕەکە پێی گوت:

. مارەیی دانەکە چەند حەفتە درێژە دەکێشێ.

گوتی:

. بیست حەفتە.

کوڕەکە گوتی:

. باشە.

کوڕەکە چووە لای وەزیرو بۆی گێڕایەوە. وەزیر گوتی:

. گوێ مەدەرێ.

مارەییان بڕی و کوڕەکە هەموو حەفتەی سەد لیرەی دەنارد. تا ماوەکە تەواو بوو. کە ماوەکە تەواو بوو، بووکیان گواستەوە و کوڕەکە چووە پەردە. (دە) ڕۆژ بە سەر بووک هێناندا تێپەڕی. کوڕەکە چی پارەی هەبوو هەمووی خەرج کرد. یەک لیرەی نەما. کوڕەکە چوو سواری کەشتییەکە بوو هەڵات. کە زانییان هەڵاتووە، وەزیر بە دوایدا گەڕا نەیدۆزییەوە. چووەماڵییان پرسی. گوتییان:

. سواری کەشتییەک بوو ڕۆیشت.

کە سوڵتان زانی کوڕەکە ڕایکردووە، کچەکەی خۆی بردەوە و دایکی کوڕەکەی دەرکرد و دەستی بەسەر ماڵەکەیان داگرت. کە دایکەکەی لە ماڵەوە دەرکرد، پیرەژن ناچار بوو لە ماڵان دەستی بە دەرۆزە کرد. لەو ماڵەوە دەچووە ئەو ماڵ. هەقایەتەکەمان دەچێتەوە لای کوڕەکە:

کوڕەکە کاتێ بە کەشتی ڕۆیشت، چووە شاری (بۆمبای). لەوێ بوو بە شاگرد گۆشتفرۆش. (دە) مانگ شاگردی کرد. نزیکەی (چل) درهەمی پاشەکەوت کرد. دایکی بیرکەوتەوە و گوتی:

- دەترسم دایکی بەسەزمانی منیان لە ماڵەوە دەرکرد بێ. (زانیبووی)، با بە دزی بچمەوە لەگەڵ خۆمی بێنم. سواری کەشتی بوو. کە بوو بە عەسر چووە دەرەوە بۆ ئەوەی خواردن بکڕێ. پشیلەیەکی سپی بێ وێنەی بە دەست دوو منداڵەوە بینی لێیان دەدا. بە منداڵەکانی گوت:

– لاوریکی گوناهو بەسەزمانە بۆچی لێی دەدەن؟!

نیو درهەمی دانێو پشیلەکەی لێ سەندن و بردییەوە ناو کەشتی. کەشتی بە ڕێ کەوت و ڕۆیشت. گەیشتە بەندەری شارێك. کوڕەکە دابەزی. کابرایەك چاوی پێ کەوت و گوتی:

- بەخوا داوەتی دەکەم.

داوەتی کرد. ئەویش چوو پشیلەکەشی پێبوو. بە ڕێکەوت ئەو شارە هیچ پشیلەی تێدا نەبوو. کوڕەکە پشیلەکەی لە گەڵ خۆی برد. کاتی عیشایێ، پشیلەکە پەلاماری جورجەکانی داو هەموو خواردن. خاوەن ماڵەکە سەری سوڕما. سوڵتان بە پشیلەکەی زانی. لە دوو کوڕەکەی ناردو پشیلەکەی بە سەد هەزار لیرە لێکڕی. کوڕەکە پارەکەی وەرگرت. (دە) لیرەی بۆ بەغدا ناردو گوتی:

- ئەمە بۆ سوڵتانە. فلانە زاوای ناردوویەتی. کوڕەکە پارەکەی لە ڕێی وەزیرەوە نارد چونکە وەزیر کوڕەکەی خۆش دەویست. وەزیر پارەکەی گەیاندە سوڵتان و پێی گوت:

- توخوا سوڵتانی دونیا، چۆن دڵت هات دایکی زاوای خۆت دەر بکەی؟ کە کوڕی سوڵتانی هێندە! عەیب نییە؟! ئەوەتا لەسەر ئەو حاڵەش چەردە پارەیەکی بۆ ناردووی.

سوڵتان گوتی:

- بە ڕاستیتە؟!

گوتی:

- ئەرێ بەخوا

سوڵتان پارەکەی وەرگرت و لە دوای دایکی کوڕەکەی نارد دیتییان دەرۆزە دەکا. بردییانە حەمام جوان جوان شووشتییان و لە ژوورێکی کۆشکەکەیان

دانا. کە وەزیر زانی لە فلانە شارە، بە دوایدا چوو. کوڕەکەیش کە پارەکەی ڕەوانەکرد گەڕایەوە (بۆمبای)و دووبارە بوو بە شاگرد گۆشتفرۆش.
وەزیر چوو کەڕەکەی دۆزییەوە سەیری کرد شاگرد گۆشتفرۆشە. پێی گوت:
- کورە ئەوە مەسەلە چییە؟
کوڕەکە گوتی:
- ئەوەیە کە خۆت دەیبینی. ئەوەی هات هات!
کوڕەکە (دە) ڕۆژ وەزیری داوەت کرد. وەزیر دیتی هیچ هەوڵ و ئامۆژگارییەك کار لە کوڕەکە ناکا. چووە بازاڕ مەیموونێکی گەورەی کڕیو سواری کەشتی بوو ڕۆیشت. مەیموونەکەیشی لە تەك خۆی دانا. کاتێ کەشتی گەیشتە ناوەندی دەریا، مەیموونەکە زنجیری پچڕاندو خۆی فڕێ دایە ناو دەریاو خۆی نقووم کرد. سەرکەوتەوە دوو دوڕی پێ بوو. بۆ وەزیری هەڵداو وەزیر گرتییەوە. مەیموونەکە بەردەوام بوو. هەر خۆی نقووم کردو سەرکەوتەوە. خۆی نقووم کردو سەرکەوتەوە تا نزیکەی هەزار دوڕی دەرهێنا. وەزیر دوڕەکانی لە ناو سندووقان کردو مەیموونەکەی لە تەك خۆی بەستەوە. کاتێ خاوەن کەشتییەکە ئەمەی بینی، گوتی:
- ئەم مەیموونە نافرۆشی؟
وەزیر گوتی:
- چەندی پێ دەدەی؟!
گوتی:
- ئەم کەشتییە بە هەموو بارو بە هەموو شتێکی ناوییەوە.
وەزیر گوتی:
- ڕازیم.
گەیشتنە دوورگەیەك. خاوەنی کەشتییەکە هاتە خوارێو مەیموونەکەی برد. وەزیریش کەشتییەکەی بردو ڕۆیشت. وەزیر گەڕایەوە لای سوڵتانو پێی گوت:
- ها، ئەم دوڕە زاواکەت بۆی ناردووی کە کوڕی سوڵتانی هیندە! ماڵ ئاوەدان تۆ چیت کرد؟! دایکیت دەربەدەر کردو ماڵت کاول و کامباخ کرد.

سوڵتان گوتی:

- بە ڕاستیتە؟!

گوتی:

- ئەریّ بە خوا. ئەم کەشتییەش کەشتی ئەوەو ئەم دووڕانەش ئەو بە دیاری بۆی ناردووی!

سوڵتان سەری سوڕماو پەشیمان بووەوە کە وای لە دایکی کوڕەکە کرد. ئەمری کرد خانوویەکی زۆر چاکیان بۆ دایکی کوڕەکە دروست کرد. کاتیّ وەزیر دیتی سوڵتان ئەمەی کرد، سواری کەشتییەکە بوو گەڕایەوە لای کوڕەکە. سەیری کرد هێشتا هەر شاگرد گۆشتفرۆشە. پێی گوت:

- هەستە بەگەڵم کەوە بچینەوە.

کوڕەکەی بردە حەمامو (حەفت) ڕۆژ لەسەر یەك هەموو ڕۆژیّ دەیبردە حەمام. بەو (حەفت) ڕۆژە کوڕەکە وا پاك بووەوە، کەس وەکوو خۆی پاك نەبوو! ئینجا بردییە بازارو قوماشێکی نایابی شاهانەی بۆ کڕیو دایە بەرگدوور. بەرگدوور بە حەفتەیەك دووریو لیّ بووەوە. کوڕەکە جلەکەی کردە بەرو وەکو کوڕە سوڵتانەکانی هیندی لێهات. ئینجا کڵاوێکی هیندییانەی لەسەری ناو دوڕێکی لە تۆقەڵەی کڵاوەکەداو کوڕەکەی سواری کەشتی کردو هێنایەوە شاری خۆیان. کە گەیشتنەوە ناو شار÷ وەزیر بە مندالی کۆڵانانی گوت:

- ها، یەکەو قڕانتان بدەمیّ بڕۆن هاوار بکەن: کوڕی سوڵتانی هیند هات! کوڕی سوڵتانی هیند هات!

خەڵك چوونە لای سوڵتانو پێیان گوت:

- زاوات هاتەوە.

سوڵتان گوێی لێبوو منداڵ لە کوچەو کۆڵانان هاواریان دەکرد. کوڕی سوڵتانی هیند هات! کوڕی سوڵتانی هیند هات!

سوڵتان چووە دەرەوە بۆ پێشوازیو لە ناو کەشتی هێنایە دەرەوە. کوڕەکە ئەوەندە بە سەرو سیما بوو، سوڵتان شەرمی لیّ دەکرد. سوڵتان بردییەوە ماڵیّ. حەفت ڕۆژ داوەتو زیافەت بوو. دوای ئەو حەفت ڕۆژە، سیّ ڕۆژ ئاهەنگی زەماوەندییان سازداو کوڕە چووەکە پاڵ ژنەکەی. بە یەکتری

شادبوونەوە. سالێك بەم جۆرە تێپەڕی. سولتان پاش مانگێك نەخۆش كەوت. نەخۆشییەكەی درێژەی كێشا. ئەو تەبیبانەی چارەسەریان دەكرد، هیچیان لە دەست نەهات. سولتان كۆچی دوایی كرد. كوڕەكە سولتانی كفن و دفن كرد. خێرو سەدەقەو تەهلیلەو مەولوودی بۆ كرد. كە تازیو خێر هەڵگیرا. خۆی لە جێی سولتان بوو بە سولتانی شارو بە شادیو بەختەوەری ژیان.

لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

★ ★ ★

## ٣٧ـ تەمبوورژەن

هەبوو نەبوو...

دوو برا هەبوون، یەکێکیان دەوڵەمەند بوو، ئەوەی تر دەستکورت بوو تەنیا کەرێك و تەمبوورێکی هەبوو. برا دەستکورتەکە هەموو بەیانیان سواری کەرەکەی دەبوو دەچووە چیا. دەچوو لای ئەشکەوتێك دادەنیشت تەمبووری لێدەدا. کە دەستی بە تەمبوور لێدان دەکرد، مارێك لە ناو ئەشکەوتەکە دەهاتە دەرێ لیرەیەکی دەهێنا و دەیدایێ. کابرا هەموو ڕۆژێ دەچوو و مارەکە هەموو ڕۆژێ لیرەیەکی دەدایێ. ماوەیەك بەو جۆرە ڕۆیشت. کابرا یەك باوەش زێڕی کۆکردەوە. ڕۆژێ، گوتی دەچمە لا ی برام تەرازووی لە کن دێنم ئەم زێڕەی پێدەکێشم. بزانم چەندە؟ ڕۆژی پاشتر، چووە لای برای گوتی:

. برام!

برای دەوڵەمەند بوو تا ڕادەی مردن ڕقی لەو برا دەستکورتەی دەبووەوە. بۆیە کە برای هەژارو نەداری پێی گوت: برام! ئەو زۆر بە تووڕەیی لە دەمی دایەوە:

. چت دەوێ؟ بۆ چی هاتووی؟

گوتی:

. هاتووم سەرێکت لێ بدەم. ئەگەر بکرێ تەرازووەکەم بە دەستیاو بدەیتێ.

گوتی:

. تەرازووت بۆ چییە؟

گوتی:

. شتێکی پێ دەکێشم.

برای دەوڵەمەندی لە دڵی خۆیدا گوتی: چی هەیە پێی بکێشێ. ئاخۆ دەبێ گەنجینەی دۆزیبێتەوە، چییە؟

هەستا قیری لە بنی تایەکی تەرازووەکەداو لە دڵی خۆیدا گوتی:

. بەڵکو ئەوەی دەیکێشێ بە بنی تەرازووەکەوە بنووسێ‌و بزانم چییە.

ئینجا تەرازووەکەی دایێ. برای دەستکورت تەرازووەکەی وەرگرت‌و چووەوە ماڵێ بۆ ئەوەی زێڕەکەی بکێشێ. کێشای، نزیکەی (بیست) هۆقە دەبوو. پارچە زێڕێك بە بنی تایەکی تەرازووکەوە نووسا. کە زێڕەکەی کێشا و لێبووەوە. تەرازووەکەی بۆ برای بردەوە. برای تەماشای بنی تای تەرازووەکەی کرد دیتی پارچە زێڕێکی پێوە نووساوە. کە چاوی بە پارچە زێڕەکە کەوت، دەستی دایە شمشێر لە برای‌و گوتی:

. پێم بڵێ ئەو زێڕەت لە کوێ بوو؟

برای خێزان‌و نەداری گوتی:

. لێم مەدە بۆت باس دەکەم. من تەمبوورێکم هەیە هەموو ڕۆژێ دەچمە سەر چیا تەمبوور لێدەدەم. مارێك لە ئەشکەوتێك دێتە دەرەوە پارچە زێڕێکم بۆ داوێ‌و دەگەڕێتەوە ناو ئەشکەوتەکە. زێڕەکەم هەموو کۆکردەوە لە دڵی خۆمدا گوتم: با بیکێشم بزانم چەندە؟! ئەوە بوو هاتمە لای تۆو تەرازووی تۆم برد.

کاتێ برای دەوڵەمەندی ئەمەی بیست گوتی:

. کوا تەمبوورەکە؟!

گوتی:

. لە ماڵەوەیە.

گوتی:

. ئەدی مارەکە لە کام چیایە؟

گوتی:

. لە فلانە چیایە.

گوتی:

- با بچین نەختێ چێژ لە تەمبوورەکە وەربگرین!
برای هەژارو نەدار سادەو ساویلکە بوو. ڕق و کینەو ئیرەیی لە دڵدا نەبوو، گوتی:
- هەستە بچین! برام.
چوونە ماڵی برای دەستکورت. برای دەوڵەمەند تەمبوورەکەی لە برای وەرگرت و شمشێرێکی بردو لە دڵی خۆیدا گوتی: دەترسم ئەم برا گەوادەم لە من دەوڵەمەند تر ببێ. دەچم تەمبوور لێدەدەم، ئەگەر مارەکە هاتە دەرەوە دەیکوژم. چوو دەستی بە تەمبوور لێدان کرد. هەر هێندەی زانی مارەکە هاتە دەرەوە. پارچە زێڕێکی بۆ تێهەڵدا. کە زێڕەکەی بۆ هەڵدا، ئەم پەلاماریداو شمشێرێکی بۆ داوەشاند. نەیکوشت بەڵام کلکی قرتاند. مارەکە فوویەکی لە کابرا کردو سووتاندی. برای قەرنتە و نەدار هات دیتی کلکی مارەکە لەولاوە کەوتووەو برای دەوڵەمەندیشی لەولاوە ڕاکشاوەو مردووە. لە دڵی خۆیدا گوتی: بێ شك مارەکەی کوشتووەو ئەو ڕزقەی خوا دابووی، لێیبڕیووم.
دەستی دایە تەمبوورو لێیدا. مارەکە هاتە دەرەوەو گوتی:
- بۆچی نهێنی خۆت ئاشکرا کردو لێگەڕای ئەمە بێتە سەرم؟!
کوڕەکە لە مارەکە پاڕایەوەو هەقایەتی خۆی بۆ گێڕایەوە کە چۆن برای بەندی کردو ئەشکەنجەی دا. مارەکە پێی گوت:
- لەمەودوا هیچم بۆ تۆ لا نییە. بەڵام ئەم کلکەم ببە لە ژێر کووپە بیچێنە. دوای هەفتەیەك شین دەبێ و هەموو ڕۆژێ لیرەیەکی زێڕ دەدا.
کابرا کلکە مارەکەی بردو چاندی. باوەڕی نەدەکردو نەدەکرد کە ئەم کلکە مارە شین ببێ. دوای حەفتەیەك، کلکە مارەکە شین بوو. هەموو سبەینان لیرەیەکی لێ بەردەبووەوە. کابرا سەری لەم کارە سوڕما. تا ماوەی ساڵێك زێڕی کۆکردەوە. زۆر دەوڵەمەند بوو. کۆشکێکی دروست کردو بەخۆ و بە ژنەوە بە شادیو بەختەوەری دەژیان.
ڕۆژێ، ژنی کابرا چووە سەردانی ماڵە دراوسێیەك. ژنە دراوسێکە لێی پرسی:
- ئەوە ئێوە ئەو هەموو خواردن و ئەم هەموو جلوبەرگ و ئەم کۆشك و ئەم تەنتەیەتان لە کوێ بوو؟!

ژنەکە گوتی:

. بەخوا چت لێ بشارمەوە نەمامێکمان چاندووە هەموو ڕۆژێ لیرەیەك دەدا.

ژنە دراوسێیەکە گوتی:

. ئەوە بە ڕاستیتە، خوشکم؟

گوتی:

. ئەرێ بە خوا، خوشکم! کووی دەڵێم ئەوهایە.

ژنەکە هەستا هاتەوە ماڵێ. خەڵك تاقم تاقم خەبەرەکەیان دەقۆزتەوەو دەیانگێڕایەوەو دەیان گوت:

. تەمبوورژەن باخێکی هەیە زێڕی لێ دەکاتەوە.

قسەکە گەیشتە سوڵتان. سوڵتان گوتی:

. چۆن دەبێ باخ هەبێ زێڕ بدا. شتی وا ئەقڵ نایگرێ!

گوتیان:

. سوڵتانی گەورە، ئەوە ئاوهایە!

سوڵتان سواری ئەسپ بوو، گوتی:

. ئەو باخە لە کوێیە؟

بردیانە ماڵی کابرا. لە دەرگا درا. کابرا گوتی:

. کێیە؟

گوتی:

. منم، سوڵتانم.

کابرا دەرگای لێ کردەوە. سوڵتان چووە ژوورەوە. کابرا گوتی:

. خوایە، ئەوەی نەمدیبوو دیم. سوڵتانی مەزن بێ و بێتە ماڵی بابایەکی وەکوو من! یاخوا بە خێر بێی.

سوڵتان گوتی:

. خۆش بی.

تەمبوورژەن گوتی:

. فەرموو سوڵتانی مەزن، چ ئەمرت هەیە؟!

سوڵتان گوتی:

- بیستوومە نەمامێکت هەیە هەموو ڕۆژێ لیرەیەکی زێڕ دەدا.

کابرا گوتی:

- شتی وا نییە. درۆیە!

سوڵتان گوتی:

- دەبێ دان پێدا بنێی.

کابرا گوتی:

- ئەی سوڵتانی گەورە، ئەوە تۆ باسی چ دەکەن؟ ئەو نەمامەی دەڵێی ئەوەتا لە ژێر ئەم کووپەیە دایە. دار زێڕ نییە، نەمامێکی ئاساییە.

سوڵتان دیتی نەمامێکی سەوزە گوتی:

- بۆ ئەوەی گومانم نەمێنێ تا بەیانی لێرە دەبم. ئەمشەو لای ئێوە دەبم.

تەمبوورژەن گوتی:

- خوایە ئەم بەڵایە لە کوێوە هات.

ئینجا چووە لای ژنەکەی و تێی بەربوو: هەی جندەو سوزانی. هەی بێ شەرم و حەیا. چۆن چووی ئەو نهێنییەت لای خەڵك ئاشکرا کرد. ئەوەتا بە سوڵتان گەیشتۆتەوەو سوڵتان هاتووە. بەیانی زێڕەکە دەبینێ و لێمان دەستێنێ. تۆ بە برسی و ڕووت و ڕەجاڵی دەمێنیتەوە! کابرا ئەو شەوە لە خەفەتان تا سبەینێ نەنووست. کە سبەینە داهات هەستا. سوڵتانیش لە خەو هەستا. سوڵتان چوو لە دیار نەمامەکە دانیشت دیتی لیرە زێڕێك لە نەمامەکە کەوتە خوارەوە. سوڵتان کە ئەمەی دی، وەخت بوو شێت بێ. بە کابرای گوتی:

- ئەم نەمامە دەدەیتە من؟ بۆ من باشە!

گوتی:

- سوڵتان شتی وا نابێ!

سوڵتان گوتی:

- چارە نییە دەبێ بیدەیتە من. بوو بە قڕە قڕیان. سوڵتان پێی گوت:

- دەتکەم بە وەزیر لای خۆم.

گوتی:

- باشە

بەم جۆرە تەمبوورژەن بوو بە وەزیرو لەگەڵ سوڵتان حوکمی کرد. نزیکەی (دە) ساڵ وەزیر بوو. ڕۆژێ، سوڵتان نەخۆش کەوت. دەرمانی ڕەوانیی خواردەوە. ڕۆژی پاشی، کۆچی دوایی کرد. وەزیر کفن‌و دفنی کردو خۆی لە جێی وی بوو بە سوڵتان. پاش ساڵێك، کچی سوڵتانی هێنا. چووە داخوازی‌و مارەی کردو حەفت شەوو حەفت ڕۆژ ئاهەنگی زەماوەندی سازداو گواستییەوە. کە کچی سوڵتانی هێنا، خەڵك لێی دەترسان نەیاندەویست ببێ بە سوڵتانیان. دەیانگوت:

- ئەمە چییە؟ تەنبوورژەن چۆن دەبێ ببێ بە سوڵتان؟

پاش دوو ڕۆژ، چەند نامەیەکی بۆ هات داوایان کرد بچێتە دەرەوە بۆ شەڕی سوڵتان مەغریب زەمین. خەڵکەکە کەیفیان ساز بوو گوتیان: بەڵکو بکوژرێ. کوڕی سوڵتانی پێشووی لە جێگا دادەنێین. سوڵتان لەشکرێکی تەیار کردو ڕەوانەی شەڕی کرد.

خودا حەزی کرد یارمەتی بدا. دوای شەڕێکی (دە) ڕۆژی، سوڵتان مەغریب زەمین شکاو کشایەوە. خەڵکەکە کاتێ بەمەیان زانی، گوتیان:

بەڵکو سوڵتانێکی چاکە کار بێ. هەموو دەنگیان بۆ دا. سوڵتان بە خۆو بە ژنەوە بە خۆشی‌و شادی‌و بەختەوەری ژیان.

لای ئێوە بووین‌و هاتینەوە.

* * *

## ٣٨ـ ئەنگوستیلەی کچی مار

هەبوو نەبوو...

کوڕە شێخێکی (تەمیم) هەبوو. کوڕەکە چووە ڕاو دیتی مندالێك مارێکی بە دەستەوەیەو چەند مندالێك دەورەیان لێداوە دەیانەوێ مارەکە بکوژن. کوڕەکە پێی گوتن:

ـ ئەم مارە مەکوژن. بەسەزمانە بەرەلای کەن.

گوتیان:

ـ بەرەلای ناکەین.

کوڕەکە لیرەیەکی دایە مندالەکانو مندالەکان مارەکەیان بەرەلا کرد. کە بەرەلایان کرد، مارەکە سەری بۆ کوڕی شێخ لەقاند، یانی شوێنم کەوە. کوڕەکە شوێنی کەوت. قەرە بە قەرەی ڕۆیشت تا گەیشتە ئەشکەوتێکی گەورە. مارەکە لە ڕێگادا بە کوڕەکەی گوت:

ـ ئەگەر دایکم پێی گوتی:

ـ بخوازە مالی دونیایێ. بلێ ئەنگوستیلەی پەنجەی کچەکەتم دەوێ.

مارەکە چووە ناوئەشکەوتەکە و کوڕەکەش بە دوایدا چوو. مارەکە بوو بە کچێکی تەمەن پازدە سالی دەتگوت مانگە!!. بە دایکی گوت:

ـ دایکە، ئەم کوڕە لە دەست مندالان ڕزگاری کردم. ئەو نەبایە دەیانکوشتم. چۆن پاداشتی چاکەی بدەمەوە؟

دایکە بە کوڕەکەی گوت:

. بخوازە ماڵی دونیایێ. هەرچی زارت هەڵدەگرێ بڵێ!
کوڕەکە گوتی:
. ئەنگوستیلەی پەنجەی کچەکەتم دەوێ.
دایکە، نەیتوانی داواکەی ڕەت بکاتەوە. گوتی:
. فەرموو، ئەنگوستیلەکە ببە!
کوڕەکە ئەنگوستیلەکەی بردو لە ئەشکەوتەکە چووە دەرەوە. ئەنگوستیلەکەی هەڵگێڕو وەرگێڕ کرد دیتی نووسینێکی لەسەرە. کە بایدا عیفریتێکی لەبەر دەم پەیدا بوو. هاواری کرد:
. فەرموو! من بەندەی بەر دەستی تۆم! ئەمر کە، چت دەوێ؟
کوڕەکە گوتی:
. دەمەوێ کۆشکێکی بلوورم لە جێیەکی چۆڵو لە نزیك شار بۆ دروست بکەی.
هەر هێندەی زانی کۆشکەکە دروست کراوەو بە هەموو ناوماڵەوە ئامادە یە. کە چاوی پێکەوت، سەری سوڕما. خەبەری بۆ دایکی نارد، گوتی:
. دایکە، دەبێ بۆم بچیتە داخوازی کچی سوڵتان.
دایکی گوتی:
. کوڕم شتی وا چۆن دەبێ؟
گوتی:
. با دەبێ!
دایکە، چووە ماڵی سوڵتانو گوتی:
. کوڕەکەم فلانە بازرگانە، زۆر دەوڵەمەندە، کۆشکێکی بلووری هەیە، حەزدەکا زەماوەند لەگەڵ کچی سوڵتان بکا.
سوڵتان گوتی:
ـ ڕازیم بەو مەرجەی داوایەکی لێدەکەم، ئەگەر جێبەجێی کرد، کچەکەمی دەدەمێ.
دایکە گوتی:
. داواکەت چییە؟
سوڵتان گوتی:

- حەفت قەرەواش‌و حەفت کۆیلەم دەوێ. هەر یەکە سینییەکی لەسەر سەر بێ‌و هەر سینییەك مامزێك‌و باڵندەیەکی زێری لە سەر بێ.

دایکە گوتی:

- باشە، دەچم پێی دەڵێم.

گوتیان:

- زوو دەمانەوێ.

دایکە چوو بە کوڕەکەی گوت. گوتی:

- حاڵ‌و مەسەلەو کەفییەت لەوەدایە!

کوڕەکە بە دایکی گوت:

- باشە، ڕازیم.

ئینجا ئەنگوستیلەکەی لە پەنجەی بادا. جنۆکەیەك هاتە دەرەوە. هاواری کرد:

- فەرموو، من بەندەی بەر دەستی تۆم. ئەمر کە چت دەوێ؟

گوتی:

- هەر ئێستا حەفت قەرەواش‌و حەفت کۆیلەم دەوێ. هەر یەکە سینییەکی لەسەر سەر بێ‌و هەر سینییەك مامزێك‌و باڵندەیەکی زێری لەسەر بێ.

جنۆکەکە گوتی:

- باشە.

کوڕەکە هەر هێندەی زانی هەموو شتەکەی لەبەر دەم ئامادە بوو. بانگی دایکی کردو پێی گوت:

- ئەمانە هەڵگرن بۆیان ببەن.

دایکە قەرەواش‌و کۆیلەکانی بردە ماڵی سوڵتان دیتی سوڵتان دانیشتووە. شتەکانی بردە ژوورەوە. سوڵتان چاوی بە شتەکان کەوت. لە سەرسامییان چاوی زەق بووەوە و گوتی:

- بەڕاستی سەیرە! مادام کوڕەکە ئەم شتانەی هەبێ دیارە بە گەنجینە زێری هەیە. بە پیرەژنی گوت:

- باشە ڕازیم کچکەتان پیرۆز بێ.

سوڵتان چووە بازاڕو پیرەژنیش چووەوە لای کوڕەکەی‌و پێی گوت:

. سوڵتان ڕازییە.
گوتیان حەفتەی دادێ بووك دەگوازینەوە.
باوکی بووك چووە بازاڕ کەل‌و پەل‌و بەرگ‌و جیازێکی نایاب‌و بێ وێنەی کڕی‌و هێنایەوە. ئینجا خەبەری بۆ ماڵی زاوا نارد. وەرن جیازەکە ببەن. جیازیان بردە ماڵی کوڕەکەو لە ژوورێك دایاننا. ڕەوشت وا بوو ئەگەر جیازیان بهێنایە، ڕۆژی پاشی، بووکیان دەگواستەوە. ڕۆژی پێنجشەممە، بووکیان هێنا. کوڕەکە چووە حەمام‌و هاوڕێکانی لەگەڵ خۆی برد. هەموو چوونە حەمام. لە دوو بەربەری نارد. بەربەر هات سەرو ڕیشی هەموویانی تاشی. کوڕەکە یەکەو دەستە بەرگێکی تازەی پێشکەش هاوڕێکانی کرد. ماڵەوەیش چێشتیان لێنا. عیشا داهات، زاوایان بە چەپڵە ڕێزان هێناو لەگەڵ کچەکە کردیانە پەردەوە. کوڕەکە چووە لای کچەکە دیتی دەڵێی مانگە!! لەگەڵیا نووست‌و بەیانی سەد لیرەی دایێ. ڕەوشت وا بوو بەیانی لە ماڵی بووك زیافەتیان دەکرد. زاوا هاوڕێکانی داوەت دەکرد. لەوێ دەردەچوون‌و هاوڕێکانی دەبردە مەیخانە. دەبوایە پارەکە زاوا بیدا. سێ ڕۆژ هاوڕێکانی لەگەڵیا دەچوونە دەرەوە. دوای سێ ڕۆژ، هەر کەسە دەچووەوە سەر کارو کاسبی خۆی. کاتێ کوڕەکە چووە پەردەو ئیشی خۆی کرد. زۆر بە ژنەکەی خۆی بەختەوەرو دڵخۆش بوو.
کوڕەکە ڕۆژێ، جلی خۆی گۆڕی‌و چووە دەرەوە. ئەنگوستیلەکەی لە ناو بەرکی جلە دژوونەکەی لە بیر کرد. قەرەواش جلەکانی شووشت‌و ئەنگوستیلەکەی دی، گوتی: ئەگەر جوولەکەی کۆنەکڕ بێ ئەم ئەنگوستیلەیەی بە دوو فلس پێ دەفرۆشم. نەیزانی ئەمە سەرو ماڵی ئاغاکەیەتی. بەینێك پێچوو، کۆنەکڕ هات، بانگی کرد:
. شتی کۆن دەکڕین! شڕەو پڕە دەکڕین!
قەرەواشەکە چووە دەرەوە. ئەنگوستیلەکەی پێشان داو پێی گوت:
. ئەمە ناکڕی؟
جوولەکەکە ئەنگوستیلەکەی لە دەستی قەرەواشەکە وەرگرت‌و بایدا. کابرایەکی لێ هاتە دەرەوە، هاواری کرد:
. فەرموو، من بەندەی تۆم! هەر چت دەوێ؟ ئەمر کە.

کابرای جوولەکە کاتێ ئەمەی بینی، یەکسەر دوو فلسی دایە قەرەواشەکەو ئەنگوستیلەکەی برد. وا ڕێکەوت کاتێ جوولەکەکە بەوێدا هات، ژنی کوڕەکە دانیشتبوو کەزی خۆی کردبووەوە. جوولەکە چاوی پێکەوتو ئەشقی بوو. شەو جوولەکەکە ئەنگوستیلەکەی بادا. کابرایەك هاتە دەرەوە، گوتی:

- فەرموو، من بەندەی تۆم. لەبەر دەستی تۆ دام، ئەمرت لەسەر چییە؟!

جوولەکەکە پێی گوت:

- دەمەوێ ئەم کۆشکە بە کچەکەوە لێرە هەڵگری‌و بیبەیتە فلانەجێ. بەڵام کوڕەکەو قەرەواشەکە لێرە جێ بێڵە. بە مەرجێ کەس نەیبینێ‌و کەس پێی نەزانێ. کوڕەکە هەر هێندەی زانی لە ناو بیابانێکی چۆڵ‌و قاقڕدایە. کەسی لە لا نییە. نە کۆشکەکە ماوەو نە ژنەکەی. لە ئەنگوستیلەکەی گەڕا نەیدۆزییەوە. پەنجەی خۆی گەست. زۆری خەفت خوارد! بە قەرەواشەکەی گوت:

- وەرە بە یەکەوە بچین. ڕۆیشتن. لە هەورازان هەڵکشان‌و لە نشێوان داکشان. ڕۆیشتن تا کۆشکەکەیان لێدەرکەوت. کوڕەکە بە قەرەواشەکەی گوت:

- ئەنگوستیلەکە لای ئەو جوولەکەیەیە. دەتوانی لێی بستێنیتەوە، یان بۆ نموونە لێی بدزیتەوە؟

قەرەواشەکە گوتی:

- باشە.

جورجێکی خورمایان بوو، مەشقدرا بوو، لە قسە دەگەیشت. کوڕە بە جورجەکەی گوت:

- ئەی جورجە، دەمەوێ بچیتە نام ئەو کۆشکەو ئەنگوستیلەکەم بۆ بدزیتەوە!

جورجەکە بە نیشانەی سەر گوتی:

- باشە.

جورجەکە چووە ناو کۆشکەکە. کە شەو داهات‌و هەموو نووستن، جورجەکە گەڕا گەڕا هیچی نەدۆزییەوە. گوتی لەوانەیە جووەکە ئەنگوستیلەکەی لە ناو دەمی شاردبێتەوە. چوو کلکی لە ناو لووتی جووەکە نا. جووەکە پژمی‌و ئەنگوستیلەکەی لە دەم دەرپەڕییە دەرەوە. جورجەکە پڕی دایی‌و لە ناو دەمی

خـۆی و نـا و ڕایکـرد. هـات فڕێـی دایـە کۆشـی ئاغاکـەی. ئەوسـا کوڕەکـە ئەنگوستیلەکەی بادا. بەندەکە هاتە دەرەوەو گوتی:

ـ فەرموو، من بەندەی بەر دەستی تۆم. هەر چیت دەوێ ئەمر کە.

کوڕەکە گوتی:

ـ ئەم کۆشکە بە هەموو شتییەوە هەڵگرەو لە شوێنی جارانی دانێوە!

هەر هێندەی زانی کۆشکەکە وا لە جێی جارانە. جوولەکەکەی گرت و کوشتی و لاشەکەی تووڕ هەڵدا. چووە لای ژنەکەی و پێی گوت:

ـ خۆ هیچی لێ نەکردی!

ژنەکە گوتی:

ـ نەخێر.

ئێستا با بچینەوە لای سوڵتانی باوکی کچەکە:

بەیانی، سوڵتان تەماشای کرد دیتی نە کۆشك ماوەو نە ئەوانەی تێیدابوون. پاش چەند ڕۆژێك، سەیری کرد کۆشـەکە گەڕاوەتـەوە شـوێنی خـۆی. سـوڵتان سەری لەم کارە سوڕما. بە کوڕەکەی گوت:

ـ وەرە پێم بڵێ مەسەلە چییە؟

کوڕەکە گوتی:

ـ بەخوا سەفەرمان کردبوو بۆ شارێکی تر.

سوڵتان گوتی:

ـ باشە کۆشك چۆن دەگوازرێتەوە؟

کوڕەکە گوتی:

ـ شتێکم هەیە کە بایـدەدەم کابرایـەك دێتـە دەرەوەو دەڵـێ: فـەرموو مـن بەنـدەی بەر دەستی تۆم. هەر چیت دەوێ ئەمر کە!

چی بمەوێ داوای لێدەکەم. یەکسەر بۆم جێبەجێ دەکا. سوڵتان گوتی:

ـ ئەو شتە چییە؟

گوتی:

ـ ئەنگوستیلەیەکە!

دوای ماوەیەك، سوڵتان نەخۆش کەوتو کۆچی دوایی کرد. کە سوڵتان مرد، خەڵکەکە تاجی سوڵتانییان لەسەر سەری کوڕەکە دانا. سوڵتانێکی باشو دادپەروەر بوو. بە خۆو بە ماڵو بە مەملەکەتەوە، هەموو بە خۆشیو شادی ژیان.

لای ئێوە بووینو هاتینەوە.

* * *

## ٣٩ـ كچە بازرگان

هەبوو نەبوو...

کابرایەکی بازرگان هەبوو، کوڕێکی هەبوو. ڕۆژێ، کوڕەکە بە باوکی گوت:

. باوکە، دەمەوێ ژنم بۆ بێنی.

باوکی گوتی:

. باشە.

باوکی چووە داخوازی کچی بازرگانێك. باوکی کچەکە کچەی داو هەزار لیرەی مارەیی وەرگرت. جیازێکی نایابیان بۆ کچەکە کرد مانەندی نەبوو و جیازەکەیان هێنا. ڕۆژی پاشی پێنج شەمەبوو، بووکیان گواستەوە. شەو داهات کوڕەکە چووە لای بووکو بەیانی زیافەت کراو نان خورا. کوڕەکە نزیکەی (دە) ساڵ لەگەڵ کچەکە ژیا. ڕۆژێ، کوڕەکە لەگەڵ باوکی دانیشتبوو و بە باوکی گوت:

. باوکە.

باوکی گوتی:

. بەڵێ، کوڕم.

گوتی:

. باوکە، دەبێ هەندی پارەی ترم بدەیتێ، دەچم بۆیەی (نیل) دەکڕم.

باوکە دەیزانی کوڕەکەی سەری باش لە بازرگانی دەرناچێ. گوتی:

. من ئەم پارەیەم نییە.

کوڕەکە گوتی:

ـ مادام وایە دەچم ئەم پارەیە لە خەزوورم قەرز دەکەم.

باوکی گوتی:

ـ کەیفی خۆتە.

کوڕەکە بە خۆو بە ژنەوە چوونە ماڵە باوانی ژنەو ژنەکە دوو پارە زێڕی بۆ مێردی بە قەرز وەرگرت. دوای هەفتەیەك، کوڕەکە ڕۆیشت. چوو بۆ ئەوەی بۆیەی (نیل) بکڕێ. لە هەورازان هەڵکشاو لە نشێوان داکشا تا گەیشتە میسر. قاوەخانەیەکی دی (یاری بەخت)ی تێدا دەکرا. هەر کەسێ پارەی دانابایەو بیبردبایەوەو پارەی هەموو ئەوانەی تری دەبرد. ئەگەر بشیدۆڕاندایە پارەکەیان دەبرد. کوڕەکە هەموو پارەکەی خستە سەر (یاری بەخت)و هەموویان لێبردەوە. یەك فلسی نەما. چوو لە ئاشێك دامەزرا لە باتی گا، چەرخی ڕادەکێشا. تا ساڵێك هیچ نامەی بۆ ماڵەوە نەنووسیو هیچ خەبەری بۆ نەناردن. (لەبەر ئەوەی تازە ژنی هێنابوو)، ژنەکەی غەریبی دەکرد. کە دیتی ماوەیەکی زۆرە بێ نامەو بێ خەبەرە گوتی: داخۆ دەبێ چی بە سەرهاتبێ؟ جورجێکی مەشقدراویان لە ماڵەوە هەبوو. کچە جوورجەکەو کیسە پارەیەکی هەڵگرتو ملی ڕێی گرتو چووە تاقیبی مێردی. هەر ڕۆیشت ، ڕۆیشت. لە هەورازان هەڵکشاو لە نشێوان داکشا گەیشتە شارێك. چووە ناو شار. دستە بەرگێکی پیاوانی کڕیو لە بەری کرد. گەڕا گوێی لێبوو. هاواریان دەکرد:

ـ (یاری بەخت)! (یاری بەخت)!

یاری لەگەڵ کردنو لە هەموویانی بردەوە. بە دوای مێردەکەیدا گەڕا. چووە شوێنی دیتی مێردەکەی لە بن ئاش کراوە ئارد دەهاڕێ. کە چاوی پێکەوت، دوو گەشکەی پێگرت. گەشکەی سووکایەتیو گوتی:

ـ دەك خۆڕکت لێ کەوی، زەلام!! مایە پووچی گەوجی کوڕی گەوج!

کاتێ ژنەکە (یاری بەخت)ی لە هەموویانی بردەوە. وای لێهات یاریکەرەکان لێی دەترسان. ببوو بە خاوەنی نزیکەی هەموو سامانی ئەو شارە. چووە لای مێردی (مێردی هێشتا نەیدەناسییەوە) بۆ ئەوەی بە بن زمانی بکەوێ. پێی گوت:

- کابرا ئەوە تۆ هاتووی لێرە چ دەکەی؟
مێردی گوتی:
- ڕاستیت دەوێ من کوڕی فلانە سوڵتانم (بازرگانم)! هاتم بۆیەی (نیل) بکڕم. تووشی (یاری بەخت) هاتمو چی پارەی پێم بوو هەموویم دۆڕاند. ژنەکە گوتی:
- وەرە چەندم پارە پێیە هەمووت دەدەمێ بەڵام مۆرێکت لە سمتی دەدەم. ڕازی؟
کابرا لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەم پیاوە لە کوێ من دەناسێ. وایزانی پیاوە. گوتی:
- باشە ڕازیم.
ژنەکە مۆرێکی لە سمتی مێردی داو مێردی هەموو پارەکەی لێ وەرگرت. ژنەیش سواری ماینەکەی بوو و گەڕایەوە. پێش مێردی گەیشتەوە ماڵێ. دوای دوو ڕۆژ، خەبەر هات گوتیان:
- کوڕی فلانە بازرگان هاتەوە. ماڵێکی زۆری هێناوەو بۆیەی (نیل)یشی کڕیوە. کوڕەکە گەیشتەوە شار. چووە ماڵی باوکیو نەچووە ماڵی خەزووری. ژنەکەی تووڕە بوو، زیز بوو چووەوە ماڵە باوانی. کوڕەکە چوو دەستی باوکی ماچ کرد. باوکی پێی گوت:
- کوڕم بۆچی ئەوەندە دواکەوتی. گوتی:
- لەبەر کڕینی ماڵی بازرگانی دواکەوتم.
کوڕەکە چووە ژووری خۆی بۆ ئەوەی چاکو چۆنی لەگەڵ ژنەکەی بکا، گوتیان:
- ژنەکەت لێت تووڕەیە. زیز بووەو چۆتەوە ماڵی باوکی!
کوڕەکە، کە ئەمەی بیست، یەکسەر بێ سێو دوو ژنەکەی تەلاق دا. کە ژنەکەی زانی کابرا تەلاقی داوە. هات گوتی:
- هەی پیسکە! هەی ڕووڕەش! پارەی منیش وەردەگریو تەلاقیشم دەدەی؟!
کابرا گوتی:
- پارەی چیم لە تۆ وەرگرتووە؟
ژنەکە پێی گوت:
– ئەم پارەو سامانەت لە کوێ بوو؟
گوتی:

- ماڵی خۆمە. مامەلەم کردو قازانجم هاتە دەست.
ژنەکە گوتی:
. تۆ مامەڵەت کرد؟
کابرا گوتی:
. ئا!
ژنەکەی گوتی:
. بە قوربانی مۆری سمتت بم. ئەی ئەم مۆرە چییە لە سمتت دراوە؟!
کوڕەکە، کە گوێی لەم قسەیە بووو شیری هەڵکێشا تاوی دایە ژنەکەی ویستی لێی بدا، خەڵکەکە گرتیان.
ژنەکە بە خەڵکەکەی ئەو ناوەی گوت:
. کاتێ کە من چووم لە بن ئاشیان کردبوو. چەندم پارە هەبوو هەمووم دایێو مۆری خۆمم لە سمتی دا. ڕووتی کەنەوە، ئەگەر شتەکە وا بوو پارەکەی پارەی منە، ئەگەر واش نەبوو، هەموو ماڵو بازرگانییەکە هی خۆیەتی.
گوتیان:
. بە ڕاستیتە؟
جلیان لەبەر کوڕەکە کردەوە دیتیان مۆری ژنەکەی لە سمتی دراوە. هەموو پارەو سامانەکەیان لێ سەندو دەریان کرد. باوکیشی کە بە مەی زانی لە ماڵی خۆی دەری کرد. کە باوکی دەری کرد، یەك قڕانی نەبوو. چوو لە دوکانێك بوو بە شاگرد. بە غەمو دەردەسەری ڕایدەبواردو شەویش هەر لەوێ دەنووست.
ژنی فەرمانبەرێك بازنی بزر کردبوو. چووە لای زێڕینگریك بۆ ئەوەی بازنێکی لێ کڕێ دیتی ئەم کوڕە لە دوکانەکە نووستووە. کوڕەکە زۆر قۆز بوو. چونکە لە بەرەبابی پاشایان بوو. ژنەکە ئەشقی بوو. لە خەو بە خەبەری هێنا. کوڕەکە برسی و شەکەت بوو. ژنەکە لێی پرسی:
. ئەوە چیتە؟
گوتی:
. هیچم نییە.
گوتی:

- بۆچی لێرە خەوتووی؟

گوتی:

- باوکم دەری کردووم. برسیم!

ژنەکە کاتێ، ئەمەی بیست کەیفخۆش بوو، گوتی:

- هەستە لەگەڵ من وەرە.

کوڕەکە هەستا بەگەڵ ژنەکە کەوت. ژنەکە بردییەوە ماڵی خۆی. خواردنی دایێ. کوڕەکە تێری خواردو حەسایەوە. بە یەك سەعات (بیست) جار ئیشی خۆی لەگەڵ ژنەکە کرد. ژنەکە خەنی بوو. مێردەکەی هاتەوە. ژنەکە کوڕەکەی بردە ژوورێك شاردییەوە. شیوی بۆ مێردی تێکردو لە ژووری خۆی خەواندی. ئینجا چووە سەلال بۆ ژووری کوڕەکەو تا بانگی بەیانی پێکەوە هەژانەوە. کە سبەینە داهات، ژنەکە هاتە خوارێ. مێردی بە خەبەر هێناو ناشتای بۆ دانا. مێردی تێشتی خواردو چووە دەرەوە. ژنەکە سەرکەوتەوە بۆ ژووری کوڕەکەو کوڕەکە تا بەرەبەری ڕۆژئاوا لە کنی مایەوە. هەر خەریکی ئیشی خۆیان بوون. ئەوسا بە دۆستەکەی گوت:

- چ لە گوڵەی مێردانم بکەم. کوڕەکە گوتی:

- چی لێ دەکەی؟.

ژنەکە گوتی:

- وەرە با ژەهر خواردووی بدەین.

کوڕەکە گوتی:

- با ژەهر خواردووی بکەین.

ژنەکە ژەهری بۆ مێردی لە شیو کرد. ئێوارێ کاتێ کابرا هاتەوە، شیوەکەی خواردو لەشی خاو بووەوەو بەربووەوە سەر نوێنەکەی و ڕاکشا. فەراقی حەنتەی لەبەر بڕا. بە ترەکی شەو چوو، ژنەکە بانگی کابرایەکی کرد. لیرەیەکی دایێ و پێی گوت:

- وەرە ئەم پیاوە مردووە لێرە هەڵگرەو ببیە لە شوێنێ بینێژە. ها ئەمەیش لیرەیەك. کابرا گوتی:

- باشە.

کابرا چووە چۆلەوانی. گۆڕێکی لێداو هاتەوە. جەنازەکەی هەڵگرت و بردی لە چۆلەوانی ناشتی. ژنەکە ئۆخژنی لە خۆی کردو دڵی داکەوت. بیست هەزار لیرەی دایە دۆستەکەی و گوتی:

- لە خۆتم مارەکەو بڕۆ دوکانێکی بازرگانی بکەوە.

کوڕەکە پارەکەی وەرگرت و چووە لای موفتی و قازی و ژنەکەی لە خۆی مارەکرد. دوکانێکی ئاوریشمی لە بازاڕی هەڕاجخانە کردەوە.

بە خۆشی و شادی لەگەڵ ژنەکەی ژیا. ژنەکە پاش چەند مانگێك، سکی بوو. سکەکەی دانا کچێکی بوو. لەبەر ئەوەی کوڕەکە پێش ئەوەی ژنەکە لە خۆی مارە بکا زۆری لەگەڵ ڕابواردبوو، کچەکە شەرعی نەبوو. بە شادی و گوشادی بە یەکەوە ژیان.

لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

* * *

## ٤٠ـ ئەسپە دارینەی باڵدار

هەبوو نەبوو...

سێ کوڕ هەبوون. کوڕی زۆر کوك کنك بوون!! لە شانشین دانیشتبوون. سوڵتانی ئەو شارە ئەمری دابوو شەو کەس چرا پێ نەکا. شەو سوڵتان لەگەڵ شەوگەڕان چووە ناو شار. سێ کوڕەکەی دی لە شانشین دانیشتبوون و چرایان داگیرساندبوو. بەیانی سوڵتان لە دوای ناردن ڕایانکێشانە سەرا. سولتان پێی گوتن:

ـ ئەی من ئەمرم نەدابوو کەس چرا پێ نەکا؟

گوتیان:

ـ چو زانین! لە بیرمان نەبوو.

پێی گوتن:

ـ ئیشتان چییە؟

گوتیان:

ـ بۆچی لە ئیشی ئێمە دەپرسی. وازمان لێ بێنە بچینە ڕێی خۆمان.

سوڵتان حەپسی کردن. کە حەپسی کردن خەبەریان دایە سوڵتان، گوتیان:

ـ یەکێکیان دەڵێ ئەگەر سوڵتان بەرم بدا. ئەسپێکی زێڕی بۆ دروستدەکەم بڕوا. دووەم دەڵێ: ئەگەر سوڵتان بەرم بدا ئەسپێکی داری بۆ دروستدەکەم بفڕێ و سێیەم دەڵێ: ئەگەر سوڵتان بەرم بدا. لەقلەقێکی زێڕی بۆ دروست دەکەم بڕوا.

قسەکە بە کوڕی سوڵتان گەیشتەوە. گوتی:

ـ بە خوا بەریان دەدەم. لە دوای ئەوەی نارد کە گوتبووی ئەسپێکی زێڕ دروست دەکەم بڕوا. پێی گوت:

ـ وەرە، ئایا ڕاستە ئەگەر بەرت بدەم ماینێکم لە زێڕ بۆ دروست دەکەی بڕوا؟

گوتی:

ـ بەڵێ.

ئینجا گوتی:

ـ بارە زێڕێکم بۆ بێنەو حەفتەیەك مۆڵەتم بدە.

کوڕی سوڵتان گوتی:

ـ باشە.

بارە زێڕێکی دایێ. کوڕە بارە زێڕەکەی وەرگرتو دوای حەفتەیەك ئەسپێکی زێڕی بۆ هێنا دەڕۆیشت. کاتێ کوڕی سوڵتان چاوی پێکەوت، لە دیاری حەپەسا. ئینجا لە دوای ئەوەی نارد کە گوتبووی: ئەسپێکی بۆ دروست دەکەم بفڕێ، پێی گوت:

ـ وەرە ئەسپێکم بۆ لە دار دروست بکە. لە هەوادا بفڕیو بەرزم بکاتەوە بۆ ئاسمان!

گوتی:

ـ باشە دوو سەوڵو دوو شەپکە دارم بۆ بێنە.

بۆیان هێناو گوتی:

ـ سێ ڕۆژ مۆڵەتم بدە.

کوڕی سوڵتان پێی گوت:

بڕۆ یەك حەفتەت مۆڵەت بێ!

کوڕەکە ئەسپێکی بە مەنگەنەی دروست دەکرد. دەنووشتایەوەو وەکوو تەختەی لێدەهات. کە دەیکردەوە وەکوو ئەسپی لێدەهاتو کە سواری دەبوو، مەنگەنەیەکی تێدابوو ئەگەر بۆ پێشەوە باتدابا بەرز دەبووەوە بۆ ئاسمانو ئەگەر بۆ دواوە باتدابا دەهاتە خوارێ بۆ سەر زەوی. بۆ کوڕی سوڵتان هێناو پێی گوت چۆن بەرزی دەکاتەوە بۆ ئاسمان.

یەکەم جار کابرا خۆی کردییەوەو سواری بوو. مەنگەنەکەی بۆ پێشەوە بادا. کە بایدا ماینەکە فڕیو بەرز بووەوە. ئینجا وردە وردە مەنگەنەکەی بۆ پاشەوە باداو هاتە خوراەوە. کوڕی سوڵتان سەری سوڕماو پێی گوت:

. وەرە فێرم کە!

کوڕەکە کوڕی سولتانی فێر کرد. کوڕی سوڵتان سوار بوو. مەنگەنەکەی بۆ پێشەوە بادا بەرز بووەوە. هەر بەرز بووەوەو بەرزبووەوە. هەر مەنگەنەکەی باداو هەر بەرز بووەوە دیتی زۆر بەرز بۆتەوە. تەماشای زەوی کرد. هەر بە قەد قەپێلکە گوێزێك دەبوو. ئینجا وردە وردە مەنگەنەکەی بۆ پاشەوە باداو هاتە خوارەوە. کە هاتە خوارەوە دیتی لە شاری فەڕەنگە. لە دڵی خۆیدا گوتی:

. ئاخ! دەبێ شاری خۆمان لە کوێ بێ؟ پرسیاری شاری خۆیانی کرد، پێیان گوت:

ـ نزیکەی مانگە ڕێیەك لێرە دوورە. کوڕەکە پەنجەی خۆی گەست. شەو لەو شارە مایەوە. کە سبەینە داهات، کۆمەڵە کەسێکی دی. شاییو هەڵپەڕکێو چۆپییان دەکرد. چووە لە لایانەوە ڕاوەستاو لێی پرسین:

. ئەم ئاهەنگ و هەڵپەڕکێیە بۆ کێیە؟

گوتیان:

. بۆ کچی قڕاڵی فەڕەنگە.

گوتی:

. کوا کچەکە؟

گوتیان:

. ئەوەتا لێرەیە لە شانشین دانیشتووە. کوڕەکە تەماشای کچەکەی کردو ئەشقی بوو. ڕۆژئاوا سواری ئەسپەکەی بوو. بەرز بووەوە چوو لەسەر بانیماڵی کچەکە هاتە خوارێ. ئەسپەکەی نووشتاندەوەو لە گیرفانی ناو چووە ژوورەوە دیتی کچەکە خەوتووە. دەستی لێداو بە خەبەری هێنا. کچەکە، کاتێ بە خەبەر هاتو چاوی بە کوڕەکە کەوت، ئەویش ئەشقی کوڕەکە بوو، پێی گوت:

. بەم شەوە چۆن هاتی؟ بە کوێ داهاتی؟

کوڕەکە گوتی:

. ئەوە هاتم.

باسی ئەسپەکەی بۆ نەکرد. تا بەیانی خەریکی گەمە و سوحبەتو ڕابواردن بوون. ئەوسا کوڕەکە ڕۆیشتو بە کچەکەی گوت:

. خوا حافیز! بەیانی دێمەوە.

چووە دەرەوە سواری ئەسپەکە بوو و فڕی چوو لە ناوەندی شار هاتە خوارەوە. بەیانی قەرەواشان هاتن. شیرو شەکریان بۆ کچەکە هێنا دیتیان ڕەنگی بزرکاوە. بێدەنگ بوون، هیچ قسەیان نەکرد. کوڕەکە کاتی عیشایێ، سواری ئەسپەکە بوو. لای ژووری کچەکە دابەزی. ئەسپەکەی نووشتاندەوەو لە گیرفانی ناو چووە ژووری کچەکە. کچەکە بە دەمییەوە چوو و گوتی:

. بە خێر بێی! بۆچی دواکەوەتی؟

گوتی:

. لەبەر شیو خواردن دواکەوتم.

تا بەیانی بە یەکەوە بوون. کوڕەکە کچەی دەگەوزاندو نقوورچی لێدەداو لەگەڵی ڕادەبوارد. ئەوسا سواری ماینەکەی بوو و ڕۆیشت. ماوەی (دە) ڕۆژ ڕایانبوارد. ڕۆژێ، کە کوڕی سوڵتان چووە لای کچەو ڕۆیشت جگەرەیەکی لە بیر کرد. کچەکە وەزعی گۆڕابوو. چوون بە قراڵیان گوت: حاڵو مەسەلە لەوەدایە!

قراڵ گوتی:

. با تاقیب بکەین. بزانین داخۆ کەس دێ؟

قیری تواوە لەسەر پلیکانە ڕوو بکەن. ئەگەر شەو یەکێ بێ بچێتە سەلال بۆ لای کچەکە قیرەکە نابینیێو بە قیرەکەوە دەنووسێو بەیانی دەیگرین. قیریان لە پلیکانەدا. کوڕەکە بەسەر پلیکانەدا نەدەهات. بە سواری ئەسپەکەی دەهاتو لەسەر بان دەهاتە خوارێ. هەر چاوەڕێیان کرد. چاوەڕێیان کرد نەیاندی کەس بە پلیکانەدا سەرکەوێ. گوتیان:

. مەسەلەیەکی ئاڵۆزو بڵۆزە! قیر لەسەر کۆسپەی دەرگا ڕووکەن. لە هەر کوێ بێو بیەوێ بچێتە ژوورەوە پێی پێوە دەنووسێو دەیگرین. قیریان لە سەر کۆسپەی دەرگا ڕوو کرد. کوڕەکە قیرەکەی لە سەر کۆسپی دەرگا دی، پەنجەی

لێداو توند کشایەوە. دەسەسڕێکی لەسەر قیرەکە دانا و بەسەریدا چووە ژوورەوە. تا بەیانی لە کەڵ کچەکە خەریکی بەزمی خۆیان بوون. ئەوسا کوڕەکە ڕۆیشت. سواری ئەسپەکە بوو و چووە دوای ئیشی خۆی. بەیانی داهات. هاتن دیتیان دەسەسڕێك لەسەر کۆسپەی دەرگا داندراوە. گوتیان:

. گرتمان!

دەستیان دایە چەقۆو بە دوایدا گەڕان. بە دوای ئەوەشدا دەگەڕان کە دەسەسڕەکەی دانا بوو. ئینجا گوتیان:

. با لە کچەکە بپرسین کێ دێتە لای.

لێیان پرسی:

. کێ دێتە لات؟

کچەکە شێتگیر بوو. گوتی:

. چ؟! هەی پیس و چەپەڵینە! کێ دێتە لای من؟! نەفرەت لە خۆتان و لە باوکی باوکیشتان!

ڕۆیشتن. گەڕان نزیکەی مانگێك گەڕان کەسیان نەدۆزییەوە. هەموو ماڵێکیان پشکنی. تەنیا ئەو ماڵە ما کە کوڕەکەی تێدا بوو. چوونە ماڵەکە دیتیان کوڕێکی بێگانەی تێدایە. لێیان پرسی:

. خەڵکی کوێی؟

گوتی:

. پیاوێکی لایدەم و ڕێم کەوتۆتە ئەم شارە!

گرتیان و پێیان گوت:

. وەرە دان پێدا بنێ. ئایا تۆی دەچیتە لای کچی قڕاڵ؟

گوتی:

. ئەمانم بدەن دەیڵێم.

ئینجا گوتی:

. ڕۆژێ، هاتمە ئەم شارە. ئاهەنگ و شایی و هەڵپەڕکێ بوو. پرسیم ئەم بەزم و ئاهەنگە بۆ چییە؟ گوتیان: بۆ خۆشی کچی قڕاڵە. گوتم: کچەکە لە کوێیە؟

گوتیان: ئەوەتا لێرەیە. سەرم هەڵبڕی چاوم بە کچەکە کەوت و ئەشقی بووم. ئەویش کە منی بینی ئەشقی من بوو. تەماشام کرد بە دەست ئاماژەی بۆ کردم.

کە ئەمەیان بیست، سەریان سوڕما گوتیان:

. دەبێ لە داری بدەین.

کوڕەکە گوتی:

. بۆچی لە دارم دەدەن؟

بە ئەڵقە دەورم بگرن تا جلم دادەکەنم. کە ئەڵقەیان لە دەورەدا. ئەسپی نووشتاوەی لە بەرکی دەرهێناو سواری بوو. مەنگەنەکەی باداو فڕی. هەموو دەمیان لە دیار بەش بووەوە. هەندێ هاواریان کرد:

. بیگرن!

هەندێ قیڕاندییان:

. لێیدەن!

کوڕەکە هەڵات. ڕۆژئاوا خەڵکەکە بە خەفەت و هەناسە ساردی گەڕانەوە.

گوتیان:

. با بچینەوە ماڵێ. بەیانی کچەکە لە سێدارە دەدەین!

کوڕەکە کاتێ فڕی و ڕۆیشت لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە: بەخوا دەترسم کچەکە بکوژن! دەبێ بچم هەڵیگرم و بیفڕێنم و بە یەکەوە بڕۆین. مەنگەنەی ئەسپە دارینەی بادا. دابەزی و کچەکەی هەڵگرت و لە پشتە خۆی سواری کردو گوتی:

. یا عەلی مەدەدا.

لە هەورازان هەڵکشان و لە نشێوان داکشان. لە حانی فڕیندا کچەکە گوتی:

. لە برسان مردین.

کوڕە گوتی:

. بەخوا ڕاست دەکەی!

لە چۆڵەوانی دابەزین ماوەیەکی زۆریان بڕی بوو تەنیا دوو سەعاتە ڕێ مابوو بگەنەوە شاری کوڕی سوڵتان. کە دابەزین کچەکە گوتی:

. دەست دە تیرو کەوان بڕۆ مامزێك ڕاوکە!

کوڕەکە دەستی دایە تیرو کەوان و ڕۆیشت. پاش دوو سەعات هاتەوە دوو مامزی پێبوو. لە داری قەلاشکەری گەڕان پێیان پەیدا نەبوو. کوڕەکە سواری ئەسپەکەی بوو فڕی. لە دوورەوە ترووسکاییەکی دی. چوو هەندێ ئاگری هێناو هاتەوە. ئاگری بە دەستەوە بوو، هەڵیکرە بایەکی توند. ئاگر لە مەنگەنەکە بەربوو. ئەسپەکە سووتا. کوڕەکە خۆی لارکردەوەو بەربووەوە سەرزەوی و پێی قرچایەوە. دوو سەعات لەو گۆڕە لە شوێنی خۆی کەوت. هاواری دەکردو دەینالاند. ئەسپە دارینەکەشی سووتا و نەما. وەختەکی خەوی لێکەوت. شوانێك بەوێدا هات. کە دیتی خەوتووەو کوڕێکی قۆزە، زانی کوڕە پاشایە. بە ئاگای هێناو گوتی:

. هەستە.

کوڕەکە گوتی:

. مامە، چت دەوێ؟

گوتی:

هەستە!

گوتی:

. پێم قرچاوەتەوە ناتوانم.

گوتی:

. بۆچی؟

گوتی:

بە خوا مامە، ئەسپێکی دارم هەبوو دەفڕی. منو ژنەکەم سواری بووین. لە جێگایەکی چۆڵ دابەزین بۆ ئەوەی شتێ بخۆین. من چووم دوو مامزم ڕاو کردو هێنام. ئاگرمان پێدەویست، لە دوورەوە ترووسکاییەکم دی. بە سواری ئەسپەکەم چووم هەندێ ئاگرم هێنا. بایەکی توندی هات. هەندێ ئاگر کەوتە سەر مەنگەنەکەو ئەسپەکە لار بووەوە سووتاو تێك و پێك شکاو منیش بەربوومەوەو قاچم قرچایەوە. شوانەی پیر کاتێ ئەمەی بیست زۆر خەفەتی بۆ خواردو بە پەکوو! پەککو! گوتی:

. هەستە هیچ نییە!

بردییە لای بەیتاڵێك. بەیتاڵەکە شکستەکەی دەگرتەوەو قاچی چارەسەر کردو کوڕەکە چاك بووەوە. کە چاك بووەوە لای شوانەکە مایەوەو شوانەکە بیست مەڕی پێ سپارد بۆی بلەوەڕێنێ.

با ئێستا بچینەوە لای کچەکە:

کچەکە هەر چاوەڕێی کردو چاوەڕێی کرد. نە ئاگر دیار بوو نەمێردی. هەستا ڕۆیشت. گەیشتە شار دە لیرەی پێبوو دەستە بەرگێکی ئەفەندیانو کتێبێکی کڕی. وەکوو پیاوێك بوو بە میرزای واڵی شار. بە نهێنی لە مێردەکەی دەگەڕا. بەڵام بێهوودە بوو. ڕۆژێ، تازیەی بۆ داناو خێرو سەدەقەو خواردنی کردو بانگی هەموو هەژارانی کرد بێن نان بخۆن. گوتمان مێردی کچەکە لەبەر مەڕی بوو. ڕۆژێ، لەبەر مەڕ هاتەوە، بە مامەی شوانی گوت:

. بە پیاسە هەتا شار دەچم.

چووە شار ئەوەندە برسی بوو، لە برسان لاکەی لێوەدەهات دەتگوت دەرۆزەکەرە. داوای خواردنی کرد. گوتیان:

. بڕۆ لای میرزای والی خێرو سەدەقەو خواردنێکی زۆری کردووە.

گوتی:

. لە کوێیە؟

گوتیان:

. لە فلانە گەڕەكو لە فلانە کۆلانە!

بە پرسیاران چوو دۆزییەوە دیتی چی دەرۆزەکەر هەیە ملیان لە بەر خواردن ناوە. ئەویش قۆڵی لێ هەڵکردو بە هەر پێنج پەنجان کەوتە سەر خواردن. ژنەکەی چاوی پێکەوت ناسییەوە. لێیگەڕا تا تەواو بوو. ئەوسا گوتی:

. بڕۆن ئەو پیاوە بگرن لێنەگەڕێن بڕواتە دەرەوە.

گرتییان. کچەکە گوتی:

. بیبەنە سەلال بۆ ژوورەوە. بردیانە سەلال. کە خەڵکەکە بڵاوەیان کرد، کچەکە دەرگای داخستو چووە سەلال بۆ لای مێردیو پێی گوت:

وەرە پێم بڵێ تۆ کێی؟و خەڵکی کوێی؟

کوڕەکە گوتی:

. من شوانم.

کچەکە پێی گوت:

. من ژنی تۆم، فلانە کەسم! نامناسیتەوە؟!

یەکتریان گرتە باوەش و یەکتریان ماچ کرد. ئینجا ژنەکە پێی گوت:

. پێم بڵێ کە لە لای من ڕۆیشتی، چوویتە کوێ و چیت بەسەر هات؟

کوڕەکە بۆی باس کرد، گوتی:

ئەوە بوو سواری ئەسپەکەم بووم چووم ئاگر بێنم. لە دوورەوە ترووسکاییەکم دی. چووم ئاگرم هێنا. سواری ئەسپەکە بووم و فڕیم ئاگریشم بە دەستەوە بوو. با یەکی توندی هات. ئاگرەکە بە مەنگەنەکەی ئەسپەکە کەوت. ئەسپەکە سووتا و تێك شکا منیش بەربوومەو قاچم قرچایەوە. لە هۆشی خۆم چووم. پیرەمێردێك گەیشتە سەرم، بە ئاگای هێنام و پێی گوتم: ئەوە چیتە؟ هەقایەتی خۆمم بۆ گێڕایەوە. پیرەمێرد بردمیەوە ماڵی خۆی. بەیتاڵی هێنا و چارەسەری کردم. ئینجا پارچە مەڕێکی پێ سپاردم. گوتی: بڕۆ بەر ئەو مەڕانە. لەوساوە دەستم بە شوانەتی کرد. ئەمڕۆ نەختێ زوو هاتمەوە. بە پیرەمێردم گوت: دەمەوێ بە پیاسە هەتا شار بچم! ئیزنی دام و منیش یەکسەر هاتمە ئێرە. ئەوە بوو تۆ گوتت: بیبەنە سەلال بۆ ژوورەوە.

ژنەکە پێی گوت:

. گوێ مەدەرێ، هەموو شتێك پێك دێ.

مانگێك لەو شارە مانەوە. نزیکەی (چل) لیرەیان پاشەکەوت کرد. کوڕەکە گوتی:

. با بچینە شاری خۆمان. باوکم لەوێیە. بچینەوە لای باوکم.

کچەکە گوتی:

. با بچین!

سوار بوون و ڕۆیشتن. دوو ڕۆژە ڕێ ڕۆیشتن لە هەورازان هەڵکشان و لە نشێوان داکشان. گەیشتنەوە شاری خۆیان. کوڕەکە چووەوە ماڵێ و لە دەرگای دا.

گوتیان:

. کێیە؟

گوتی:

. فلانە کەسم!

گوتیان:

ـ بە ڕاستیتە؟ یان گاڵتە دەکەی؟ دوای ئەو هەموو ماوەیە لە کوێ هاتیتەوە. فلانە کەس دە ساڵە ڕۆیشتووە.

گوتی:

. بەخوا بڕوا بکەن من فلانە کەسم.

دەرگایان کردەوە. پێك شادبوونەوەو یەکترییان ماچ کردو دەستی یەکترییان گوشی. دایکە لەو ڕۆژەی کوڕەکەی ڕۆیشتبوو لە شروان کوێر ببوو. ئێستا، کە کوڕەکەی هاتەوە. کوڕەکەی بۆن کردو بە کاری خوای چاوی چاك بووەوە. باوکیشی پیر ببوو. دایكو باوکی لێیان پرسی: چی بەسەرهاتووە؟

ئەویش هەموو بەسەرهاتی خۆی لە سەرەتا تا کۆتایی بۆ گێڕانەوە. کاتی خۆی کە ئەم کوڕە سواری ئەسپەکە بوو فڕیو ڕۆیشت، سوڵتانی باوکی گوتی:

. کێ ئەو ئەسپەی دروست کردووە.

کابرایان هێناو حەپسیان کرد. کاتێ کوڕەکە هاتەوە زانی کابرایان حەپس کردووە، لە بەندیخانە چووە لایو چاكو چۆنی لەگەڵ کردو دڵی دایەوە. ئینجا کوڕەکە چووە لای باوکیو پێی گوت:

ـ باوکە، کچێکم لەگەڵ خۆم هێناوە دەمەوێ مارەمان بڕیو ئاهەنگی زەماوەندمان بۆ بکەی. باوکی جیازێکی بۆ ئامادە کرد مانەندی نەبوو. جیازێکی شاهانە! ئینجا فەرمانی دا پێنج شەوو پێنج ڕۆژ شاییو چۆپیان گێڕاو دوو شەوو دوو ڕۆژیش بەزمو سەما بوو. هەموو شادو گوشاد بوون. کوڕەکە چووە لای کچەکە چونکە تا ئەو ڕۆژ لەگەڵیا نەنووستبوو. کاتی خۆی کە دەچووە لای تەنیا ماچو نەقورچەو ختۆکەیان لە نێوان بوو. بەم جۆرە کوڕەکە ژنی هێناو لەبەردەستی باوکی دەستی بە کار کرد.

ڕۆژێ، باوکە نەخۆش کەوت. چی تەبیب هەبوو هێنایەنە سەری هیچ سوودی نەبوو. دوای ماوەیەك عەمری خوای کرد. کوڕەکەی شووشتیو کفنو دفنی کردو حەفت ڕۆژ پرسەی بۆ دانا. پاش حەفت ڕۆژەکە لە جێگای باوکی لەسەر

تەختی سوڵتانی دانشت و لەگەڵ خانمی خێزانی و دایکی بە شادی و خۆشی ژیان. ژنەکەی دووگیان بوو. کوڕێکی جوان و خشکۆکی بوو. بە دایەنێکیان سپارد. کوڕەکە گەورە بوو. کوڕێکی ئازاو بە جەرگ بوو. بە باوکی گوت:

ـ باوکە!

باوکی گوتی:

ـ ها!

گوتی:

ـ دەمەوێ دۆتامی خۆمم بۆ بخوازی.

باوکی دۆتامی بۆ داخوازی کردو لێی مارەکردو بۆی گواستەوەو لە پاڵی کرد.

هەموو تا پێمێردیان هاتەسەر لە خۆشی دابوون. هەر خوا هەتا سەر دەمێنێ.

لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

* * *

## ٤١ـ کچەی پسمامکوژ

هەبوو نەبوو...

شـێخێکی عارەبـان هـەبوو، ناوی(سـوڵتان مـایع)بـوو. ڕۆژێ لـە دیوەخانـە دانیشتبوو. جزووی قاوەخانە لەسەر ئاگر بوو. قووڵەڕەش قاوەی تری لە هاون دەکوتا. شێخ هەستی بە دڵتەنگی کرد. گوتی:

- هەموو ژنەکانم بۆ بانگ کەن.

بانگیان کردن و هاواریان کرد:

- بۆ ئێرە! ئێرە! کچانی عەرەب. کچانی شەمەر!

ژنەکان چوونە خزمەت شێخ و گوتیان:

- دەخیلە قوربانت بین شێخی عارەبان!

شێخ پێی گوتن:

- دەمەوێ پێم بڵێن لە دونیادا چ باسە؟! هەقایەتێکم دەوێ ڕۆحی لەبەردابێ.

ژنێکیان گوتی:

- باوکی مەعگەل!

شێخ گوتی:

- فەرموو!

ژنەکە گوتی:

- من هەقایەتێکت بۆ دەگێڕمەوە.

شێخ گوتی:

. بگێڕەوە و پشت بە خوا ببەستە.
ژنەکە گوتی: گوێ بگرە:
. کچێك هەیە ناوی (سەبیحە)یە. سەبیحە کاتی خۆی حەفت پسمامی هەبوو. هەر کەسێکی دەچووە داخوازی، مەرجی ئەوە بوو لە مەیدان زۆرانبازی لەگەڵ بکا. ئەگەر کابرا پشتی کچەکەی لە عەردی دابا، کچەکە دەبوو مێردی پێ بکا، ئەگەر کچەکە ئەوی لە عەردی دابایە، دەری دەکرد. هەر کەسێ دەچووە پێش بۆ داخوازی، کچەکە دەیبەزاند. پسمامەکانی هاتنە مەیدانی زۆرانبازی. گەورەکە هات کچەکە بەزاندی. ئەوەی لەو بچووکتر هات کچەکە بەزاندی. هەر یەکێ هات کچەکە بەزاندی. تا شەشی بەزاندن. مایەوە بچووکەکەیان. بچووکەکە هات بەربووە کچەکەو گوتی:
. هەی هیچ و پووچ! هەی دێڵەسەگی سەگ داك! ڕیسواو شەرمەزارت کردین.
کچەکە هیچ خۆی تێك نەدا گوتی:
. فلانە کەس، سەیر کە ئەوە چییە لای خیوەتەکەتان؟
کوڕەکە ئاوڕی دایەوە. کچەکە ڕمێکی حەواڵە کرد. لێیداو کوشتی. خزم و کەس و کارو براکانی کوڕەکە بوون بە دوژمنی خوێنینی کچەکەو شەڕو دوژمنداری لە بەینیان دەستی پێکرد). یا شێخ، ئەمە بوو هەقایەتەکەم.
شێخ کە هەقایەتەکەی بیست، بە ژنەکەی گوت:
. کچەکە جوانە!
ژنەکە گوتی:
. لە جوانیدا هاوتای نییە.
شێخ بانگی کوڕەکەی کرد:
. وەرە مەعگەل.
گوتی:
. بەڵێ باوکە.
گوتی:
. ئەسپە شێ لە پشت خیوەتە. بڕۆ بۆم بێنەو زینی کە.
کوڕەکە ئەسپە شێی بۆ باوکی هێناو زینی کرد. شێخ گوتی:
. ڕم و تیغ و شمشێرم بۆ بێنە!

کوڕەکە هەمووی بۆ هێنا.

شێخ سواری ئەسپ بوو. بۆی دەرچوو. لە هەورازان هەڵکشاو لە نشێوان داکشا. دوو ڕۆژ ڕۆیشت گەیشتە هۆبەو عوربانی عارەبان. کەس لە هۆبەدا نەبوو. تەنیا خیوەتو ڕەشماڵو مەڕو مانگاو وشترو بزنو ئەسپ بوون. لەگەڵ کچێکی تەنیا. شێخ چووە لای کچەکەو سەلامی کرد. کچەکە گوتی:

. بە خێر بێی یا شێخ، فەرموو!

شێخ دابەزیو چووە دیوەخانە. کچەکە قاوەی بۆ لێناو شێخ قاوەی خواردەوە. لەسەر قاوەخواردنەوە بوو دوژمن پێیان وەرکرد. ویستیان تۆڵەی کوڕەکەیان بکەنەوە کە کچەکە کوشتبوویو پسمامی خۆیشی بوو. پارچە مەڕێکو ڕەوە ئەسپێکو گارانە ڕەشە ولاخێکو کۆمەڵە وشترێکان برد. کچەکە، کە دیتی تالانیان برد، ڕووی کردە سوڵتان مایعو گوتی:

. یا شێخ، بۆیان هەستە.

شێخ خۆی هەڵدایە سەر خانەی زینو هاواری کرد:

من باوکی مەعگەڵم پێ دەڵێن. شێخی شەمەرم!

شێخ کردی بە هاوارو قیڕینو گازی:

. کوڕە بۆ ئێرە! منیش بەشی خۆم دەوێ!

هەندێ وشتریان دایێ.

دووبارە گوتی:

. منیش بەشی خۆم دەوێ.

ئەم جارە هەندێ بزنیان دایێ.

دیسان هاواری کرد:

. کوڕە، منیش بەشی خۆم دەوێ.

گوتیان:

. بڕۆ سەگداک ئەتۆ چی لێمان پەیدابووی؟

شێخ پەلاماری دانو دەستی بە کوشتار کرد. کچەیش سواری ماینی خۆی بوو کوشتاری لێکردن. دوژمن بەزیو شێخ بە سەریاندا زاڵ بوو. ئەوەی بردبوویان بە زیادەوە هێنایەوە. ئینجا گەڕایەوە، چوو لە دیوەخانە دانیشت. زۆری پێ

نەچوو کەس و کارو خاڵ و برای کچەکەو کۆچەرەکانی دی هاتنەوە. ئەمانە لە دوورەوە دیتیان لای خیوەتەکان هەمووی تێك قڕقڕانە. گوتیان:

- بەسەریان داداوین و تالانیان کردووین. کە نزیك کەوتنە تەنیا ئەسپ و ڕەشەوڵاخ و مەڕو ماڵاتیان دی و بەس.

گوتیان:

. ئەمە چییە؟

کەیفیان ساز بوو چوونە لای کچەکەو باوکی لێی پرسی:

. ئەوە چ بووە؟

کچەکە هەقایەتەکەی لە سەرەتا تا کۆتایی بۆ گێڕایەوە. هەموو سەریان لەم کارە سوڕما. هەموو عارەبی عوربان لە دیوەخان کۆبوونەوە. کە هەموو هاتن شێخی باوکی کچەکە پێی گوتن:

. دەمەوێ پرسێکتان پێ بکەم.

گوتیان:

. بڵێ!

گوتی:

. ئەم سوارە تالانی ئێمەی گێڕاوەتەوە. شایەنی چییە؟

یەکێ گوتی:

. سەد وشتر.

یەکی تر گوتی:

. هەزار وشتر.

کچەکە لەولاوە هەڵیدایێ و گوتی:

. شایەنی هەموو وشترەکەیە بە (سەبیحە)یشەوە.

باوکی گوتی:

. ئافەرین! تۆ بە ڕاستی کچی منی. ئینجا بە خەڵکەکەی گوت:

. گەلۆ، ئەم پیاوە ئەگەر وشتری بویستایە، کە دوژمنی شکاند، بیست وشتری بۆ خۆی دەبردو دەرۆیشت. ئێوە هیچ نازانن. من دەمەویست ئێوە یەکێکتان قسەیەکی بە جێ بکا. باوکی کچەکە جیازی بووکی ئامادە کردو کچەکەی لە

شێخ مارە کردو لە پاڵی کرد. شێخ نزیکەی ساڵێك لەوێ مایەوە. ئەوسا بە باوکی کچەکەی گوت. یا شێخ، نیشتمان!!!

شێخ گوتی:

. هەقی خۆتە.

فەرمانی دا پەنجا سەر مەڕو پەنجا سەر وشترو پەنجا بزنیان هێناو هەمووی پێشکەش کرد. هەزار سواریشی بەگەڵدا. بۆ ئەوەی خۆی و ژنەکەی بگەڕێننەوە لای کەس و کاری. لە نیوەی ڕێگا لە شێخێك ڕاست هاتن بەرەو ڕوویان دەهات. لایانداو خیوەتیان هەڵداو قاوەچی قاوەی لە هاون کوتا. دەنگی هاونەکە ڕۆیشت. بە ڕێکەوت سوڵتانی عەجەم بۆ سەیران هاتبووە ئەو ناوە. گوێی لە دەنگی هاونەکە بوو سەیری کرد هۆبەو عوربانی عارەبانی دی گوتی:

- بەخوا دەچم دەبم بە میوانی ئەمانە. کە هات هەموو هەستان بە پیریەوە چوون. لە دیوەخانە دایاننا و خواردنیان بۆ کردو قاوەیان خواردەوە. بەیانی بە هیوای دیدار دەستی یەکتریان گوشی. خیوەتەکانیان پێچایەوەو ڕۆیشتن. سوڵتانی عەجەم دەستی برد ملوانکەیەکی دەرهێنا و پێشکەشی (سوڵتان مایع)ی کردو هەر کەسە چووە ڕێی خۆی. (سوڵتان مایع) ڕۆیشت. لە هەورازان هەڵکشاو لە نشێوان داکشا گەیشتەوە ناو کەس و کاری خۆی. کەس و کار بە پیریەوە چوون. بوو بە چریکەی گۆرانی و تەقەی خۆشی!

هەموو خرۆشابوون هاواریان دەکرد:

. سوڵتان مایع هاتەوەو کچەی پسمامکوژی هێنا.

سوڵتان گەیشتە جێ هەموو هاتنە پیرۆزبایی. جیازێکی تازەی بۆ بووك کرد. دەستە نوێنێکی کڕی و دروویان و لە ناو خیوەت ڕایانخست. ئینجا کچەکەیان برد. شووشتیان و خەنەیان لێداو کلیان لە چاو کردو مووی دەم وچاویان هەڵگرت. شەوی پەردە داهات. ڕۆژی پێنج شەممە بوو. شیویان لێنا. لەگەڵ کەس و کاری شیوی خوارد. کە عیشا داهات بردیانە پەردەو تەقەیان بە سەردا کرد. بۆ بەیانی خواردنی دوای شەوی پەردەیان ئامادە کردو هەموو خەڵکەکەیان بانگهێشت کردو تێرو پڕیان خوارد. شێخ لەگەڵ ژنەکەی و کەس و کاری بە شادی و خۆشی ژیان. لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

* * *

## ٤٢ـ گەنجی خەوتوو

هەبوو نەبوو...

بازرگانێك هەبوو، كچێكی هەبوو. كچەكە زۆر جوان‌و نازدار بوو. كە گەورەبوو تەمەنی بوو بە دەوری (دە) ساڵی ڕۆژێ لەگەڵ دەستە خوشكەكانی لە حەمام خۆیان دەشووشت. قەلە ڕەشێك هات‌و قڕاندی:

قڕ...قڕ...

هەرچەندەی خۆت بشۆی،

هەرچەندەی منداڵت ببێ،

حەفت ساڵ باوەشێن لە مردوو دەكەی!

كچەكە لە پڕمەی گریانی دا. چووەوە ماڵێ. هەقایەتەكەی بۆ كەس‌و كاری گێڕایەوە. پێیان گوت:

. هیچ نییە! مەترسە!

لە ناو كەس‌و كاری دانیشتبوو، لە پڕ دیتیان قەلەڕەشەكە هات‌و دەستی بە قڕە قڕ كرد:

قڕ...قڕ...

هەرچەندە خۆت بشۆی،

هەرچەندەی منداڵت ببێ،

حەفت ساڵ باوەشێن لە مردوو دەكەی!

كەس‌و كاری پێیان گوت:

- مەترسە، هەر ئەم جارەیە، قەلەڕەشەکە جارێکی تر نایەتەوە.
بەڵام قەلەڕەشەکە هەموو سبەینان دەهات و دەیقڕاند:
قڕ...قڕ...
هەرچەندە خۆت بشۆی،
هەرچەندەی منداڵت ببێ،
حەفت ساڵ باوەشێن لە مردوو دەکەی

کچەکە بە هۆی ئەم قسەیەوە نەخۆش کەوت. بنساو بێ تاقەت بوو. کەس وکاری گوتیان:

- با بارکەین، بچینە شارێکی تر.

باوکی کچەکە ماڵی بارکردو خانووی خستە بارمتەو کچەکەی و ژنەکەی بردو ڕۆیشتن. لە هەورازان هەڵکشان و لە نشێوان داکشان تا گەیشتنە لای کۆشکێك. زۆر تێنوو بوون. کچەکە لە سواری وشتر دابەزی و ڕووی کردە دەرگای کۆشکەکە بۆ ئەوەی هەندێ ئاو بێنێ. هیچ بیری لای دەرگا نەبوو. پاڵی بە دەرگاوە نا. دەرگاکە کرایەوەو چووە ژوورەوە. کە گەیشتە ژوورەوە، دەرگای لە دوا داخرایەوە کلیل درا. ئەوەندەی هاواری کردو گریا، دەرگاکە نەکرایەوەو نەکرایەوە. کەس و کاریشی لە پشت دەرگاوە گوێیان لێڕاگرتبوو و بانگیان دەکرد:

- فاتمە خان! فاتمە خان!

هیچ وەڵام نەبوو. گەڕانەوە شاری خۆیان. کچەکە لە چوونە دەرەوە نائومێد بوو. چووە ناو کۆشکەکە دیتی (چل) ژووری قوفلدراوی تێدایەو کلیلەکانیان بە سەر دەرگاوە کراوە. بازی هەڵداو کلیلەکانی هێنایە خوارێ. دە ژووری کردەوە هەموو ژوورەکان پڕ زێڕ بوون. دە ژووری تری کردەوە سەرجەم ژوورەکان پڕ زیو بوون. دە ژووری دیکەی کردەوە خڕ پڕی ئەڵماس بوون. نۆ ژووری تری کردەوە گشت تژی گەواهێر بوون. مایەوە یەك ژوور! کردییەوە دیتی گەنجێکی تێدایە. تەمەنی بیست ساڵ دەبێ. کوڕێکی قۆز بوو. کوڵ و شیرین ئەدگار بوو. گەنجەکە خەوی لێکەوتبوو. دەتگوت مردووە. لە سەر ناوچەوانی نووسرابوو.

ئەم گەنجە، کچی فلانە بازرگان باوەشێنەی لێدەکا تا بە ئاگادێ. ٢ کە بە ئاگا هات، زەماوەند لەگەڵ کچەکە دەکا. کچەکە گوتی:

- (إنا لله و إنا إليه راجعون)! خوا وای لە ناوچەوانم نووسیوە!! ئەوە ئەمە بوو قەڵەڕەشەکە دەهات دەیقفاند:

کچی بازرگان،
هەرچەندە خۆت بشۆی،
هەرچەندەی منداڵت ببێ،
حەفت ساڵ باوەشێن لە مردوو دەکەی

قەلەڕەشەکە ڕاستی دەکرد. بە خوا باوەشێنی لێ دەکەم. بزانم خوا چی داناوە. کچەکە شەوو ڕۆژ باوەشێنەی لە گەنجەکە دەکرد. شەوو ڕۆژ!! شەش ساڵ بە باوەشێن باوەشێنی لێکرد تا وەڕز بوو. ئەوسا گوتی: هەموو تەمەنی خۆم بەمە بە فیڕۆ بدەم؟! منیش پێویستم بە نان و ئاو هەیە! لەم تەنیاییە پێویستم بە ئاودەنگێکە. چووە سەربانی کۆشکەکە. تەماشای چۆڵ و بەڕیای کرد کەسی نەدی. لە ناکاو لە دوورەوە کاروانێکی دی. کاروانەکە هات نزیک کەوتەوە، کچەکە بانگی کرد:

- هۆ! ڕێوینگینە! ئێرە، ئێرە، وەرنە ئێرە!

گوتیان:

– چ ئەمر دەکەی!

گوتی:.

- قەرەواشێکتان نییە بیفرۆشن؟

گوتیان:

- با.

کچەکە نزیکەی هەزار لیرەی دانی و ئەوانیش قەرەواشێکی ڕەشیان دایێ. کچەکە پەتێکی شۆڕ کردەوە. لە قەرەواشەکەیان بەست و کچەکە لە سەرەوە هەڵیکێشا بۆ سەر کۆشك و پێی گوت:

- خواردنم بۆ ئامادە کە.

سالێك مابوو حەفت سالەكە تەواو ببێ. ئەو سالەش باوەشێنی لە گەنجە خەوتووەكە كرد. بەردەوام بوو تا مایەوە تەنیا یەك ڕۆژ. كچەكە بە قەرەواشەكەی گوت:

. وەرە تۆ باوەشێنەی لێ بكە، با منیش چاوێك گەرم بكەم. پاش سەعاتێكی تر بە ئاگام بێنە. بەڵام خانم خەوێكی قووڵی لێ كەوت. ماوەیەكی زۆر نووست. لەو دەمەیدا كە قەرەواشەكە باوەشێنی لە گەنجەكە دەكرد، گەنجەكە بە ئاگا هات و بە كارەكەرەكەی گوت:

. تۆ خانمی منی. تۆ بە خەبەرت هێنام. ئەوە حەفت ساڵە جەفام بۆ دەكێشی، وا نییە؟!

قەرەواشەكە گوتی:

. بەڵێ وایە.

ئەوسا قەرەواشەكە چووە لای كچی بازرگان و پێلەقەیەكی لێداو گوتی:

ـ لە كوێی؟ هەستە ڕابە. هەستە بڕۆ مدبەق و دەست بە چێشت لێنان بكە. كچەكە حەفت ساڵ بوو نەنووستبوو. بە حەپەساوی و پەشۆكاوی لە خەو ڕاپەڕی. قەرەواشەكە گوتی:

. ئەو هەموو ترسەی بۆ چییە؟ هەستە چێشتمان بۆ لێنێ.

كچەكە تاسا! هەستا هیچ قسەی نەكرد. لە دڵی خۆیدا گوتی:

. (إنا لله و إنا إليه راجعون)! خودایە هەر چی تۆ لە ناوچەوانت نووسیبم دێتە جێ! ڕازیم بە ڕەزای تۆ.

هەستا چووە خوارەوە چێشتی لێنا. بردییە سەلال بۆ ژوورەوە. بەم جۆرە قەرەواش بوو بەخانم و خانم بوو بە قەرەواش و خزمەتی ماڵەوەی دەكرد. ڕۆژێ، گەنجەكە گوتی:

. دەچمە حەج، چ دیارییەكتان دەوێ بۆتان بێنم.

قەرەواشەكە گوتی:

. فلان شت و فلان شتم دەوێ.

گەنجەكە گوتی:

. باشە بۆت دێنم.

ئینجا پرسیاری لە خانم کرد کە ببوو بە قەرەواش. گوتی:
. تۆ چت دەوێ؟
گوتی:
. گەورەم، من هیچم ناوێ. بەڵام توخوا تەنیا (بووکۆکەی سەبووری)م بۆ بێنە!
گەنجەکە گوتی باشەو بە ڕێ کەوت ڕۆیشت تا گەیشتە مەککە. حەجی خۆی کردو کە حەجی تەواو کرد، هەموو شتەکانی بۆ ژنە ڕەشەکە کڕی. بەڵام (بووکۆکەی سەبووری) لە بیر کرد. گەڕایەوە ناو کەشتی. کەشتیوان پرسی:
. کەستان هیچی لە بیر نەکردووە؟
گەنجەکە (بووکۆکەی سەبووری) بیرکەوتەوە. پەنجەی خۆی گەستو گوتی:
. من شتێکم لە بیر کردووە. قەرەواشەکەم داوای لێکردم (بووکۆکەی سەبووری) بۆ بێنم. کاتێ نەفەرەکانی ناو کەشتی گوێیان لێ بوو، گوتیان:
. بۆ چیتە؟ (بووکۆکەی سەبووری) ئەوەی یاری پێ بکا، ئەگەر کەسی لانەبێ دەیکوژێ.
گوتی:
. بە ڕاست؟
گوتیان:
. ئەی چۆن؟
کابرا (بووکۆکەی سەبووری) کڕیو کەشتییەکە بە ڕێ کەوت.
کابرا گەیشتەوە ماڵێ. ژنە ڕەشەکە بە خێر هاتنەوەی کردو گوتی:
. بە خێر بێیتەوە. بۆچی دواکەوتی؟
گوتی:
ـ بۆیە دواکەوتین چونکە من (بووکۆکەی سەبووری)م لە بیرکردبوو کە قەرەواشەکەمان داوای کردبوو. کەشتی لە ناوەڕاستی دەریا چەقی.
ژنەکە گوتی:
. با بڕوا جەهەننەمی لێ پڕ. بۆچی بۆت هێناوە؟
گەنجەکە گوتی:
. قەیدی نییە. بەسەزمانە.

ژنە ڕەشەکە هەموو شتەکانی دەرهێنا. قەرەواشەکەش لە گەنجەکەی پرسی:
- (بووکۆکەی سەبووری)ت بۆ نەهێنام؟
گەنجەکە گوتی:
- بەدی! ڕاوەستە با پشوویەك بدەم، بۆت دەردێنم.
گەنجەکە (بووکۆکەی سەبووری) دایەو دە پێشدا چووە ژوورەکەی ئەوو خۆی لە پەنای نوێنان شاردەوە. قەرەواشەکە (بووکۆکەی سەبووری) وەرگرتو چووە ژووری خۆی. (بووکۆکەی سەبووری) لەبەر دەمی خۆی داناو دواندی‌و گوتی:
- (بووکۆکەی سەبووری)، هەقایەتێکت بۆ دەگێڕمەوە.

تۆ سەبووری‌و من سەبووری،
دڵم تا کەی سەبر بگرێ.

ئینجا دەستی بە هەقایەتی خۆی کردو گوتی:
– ئەی (بووکۆکەی سەبووری)، من کچی بازرگانی بەغدا بووم. ڕۆژێ، لەگەڵ دەستە خوشکەکانم لە حەمام خۆم دەشووشت، قەڵەڕەشێك هات قفاندی:

قغ...قغ...
هەرچەندە خۆت بشۆی،
هەرچەندەی مندالت ببێ،
حەفت ساڵ باوەشێن لە مردوو دەکەی

لەگەڵ قسەکە لە خۆم تەریق بوومەوە. بە خەفەتباری گەڕامەوە ماڵێ. لەوێش قەلە ڕەشەکە هاتو قفاندی:

قغ...قغ...
هەرچەندە خۆت بشۆی،
هەرچەندی مندالت ببێ،
حەفت ساڵ باوەشێن لە مردوو دەکەی

خەبەرم دایە کەس‌و کارەکانم. پێم گوتن با بارکەین بچینە شارێکی دی. ئەی (بووکۆکەی سەبووری)

من سەبووری‌و تۆ سەبووری،
دڵم تاکەی سەبر بگرێ؟

(بووکۆکەی سەبووری) ورگی نەختێ ئاوسا. کچەکە گوتی:
- (بووکۆکەی سەبووری)، ماڵی خۆمان جێ هێشت و ڕۆیشتین. لە نیوەی ڕێگا تێنوێتی زۆری بۆ هێناین. (بووکۆکەی سەبووری)، هاتینە ئەم کۆشکە. من دابەزیم و هاتمە ژوورەوە. دەرگا داخرایەوە. ویستم بیکەمەوە نەمتوانی. کەس و کارم لە دەرەوە بانگیان دەکردم ئەوەندەی هەوڵم دا دەرگا نەبووەوە. کەس و کارم نائومێد بوون و گەڕانەوە ماڵێ. منیش نائومێد بووم! ئەی (بووکۆکەی سەبووری):

من سەبووری و تۆ سەبووری،
دڵم تاکەی سەبر بگرێ؟

لە خۆم بێزار و نائومێد بووم. هاتمە ناو ئەم کۆشکە و سەرکەوتم. دیتم چل ژووری تێدایە. لە یەکێ لە ژوورەکاندا، ئەو گەنجەم بینی کە ئێستا کارەکەریی بۆ دەکەم. خەوتبوو دەتگوت مردووە. هەناسەی نەدەدا. کە تەماشام کرد دیتم لە تەختی تەوێڵی نووسراوە: ئەم گەنجە، کچی فلانە بازرگان باوەشێنەی لێدەکا تا بە ئاگا دێ. کە بە ئاگا هات، زەماوەند لەگەڵ کچەکە دەکا. کە ئەمەم خوێندەوە گوتم: ئەمە ئەو سۆز و بەڵێنە بوو کە قەڵەڕەشەکە پێی دام. گوتم:
- (إنا لله و إنا إليه راجعون)! ئەی (بووکۆکەی سەبووری):

من سەبووری و تۆ سەبووری،
دڵم تاکەی سەبر بگرێ؟

لێرەدا ورگی (بووکۆکەی سەبووری) زیاتر ئاوسا و هەڵدەفا. کچەکە گوتی:
بەڵێ، (بووکۆکەی سەبووری)، هەستام دەستم دایە باوەشێنە و شەش ساڵ باوەشێنەم لێ کرد. لە بێ خەوییان شل و شەکەت بووم. بە تەنیا بووم. کەسم لەگەڵدا نەبوو. هەستم بە ترس غەریباتی کرد. چوومە سەربان دیتم کاروانێك هات. لێم پرسین: هیچ قەرەواشتان نییە بیفرۆشن. گوتیان: با. ئەم قەرەواشەم کڕی کە بوو بە خانمی من. ئەی (بووکۆکەی سەبووری)، سەد لیرەی زێڕم پێدا. گەنجەکە لە پەناوە گوێی لە قسەکانی کچەکە گرتبوو. کچەکە بەردەوام بوو: بە پەت هەڵمکێشایە سەرەوە و پێم گوت: فلانی، برۆ چێشت لێنێ بیخۆین. منیش هەر باوەشێنم لە گەنجەکە دەکرد. حەفت ساڵ بوو نەخەوتبووم. تەنیا یەك ڕۆژ

ما گەنجەکە لەو خەوەی بە سەریدا باری بوو بە خەبەر بێ، ئەوەی تەقدیر کرابوو هاتە جێ!

ئەی (بووکۆکەی سەبووری):

من سەبووری و تۆ سەبووری،

دڵم تاکەی سەبر بگرێ؟

(بووکۆکەی سەبووری) زیاتر هەڵدەفا. ئەوسا کچەکە گوتی:

. لەبەرئەوەی تەنیا یەك ڕۆژ مابوو گەنجەکە بە خەبەر بێتەوە بە قەرەواشەکەم گوت:

وەرە تۆ باوەشێنەی لێبکە تا من دوو سەعات دەخەوم و نەختێ دەحەسێمەوە ئەوسا هەڵدەستم. گوتی: باشە. نووستم و خەوم لێکەوت. قەرەواشەکە خەریکی باوەشێنە کردن بوو. لە پڕ گەنجەکە پژمی و بە خەبەر هات. بە قەرەواشەکەی گوت: خانم تۆ منت زێندوو کردەوە. چاکەو پاداشتت دەدەمەوە. گەنجەکە وایزانی ئەم قەرەواشە بووە حەفت ساڵ شل و شەکەت بووە ئەوەندەی باوەشێنەی لێبکا. قەرەواشەکە کە گوێی لە قسەیەی گەنجەکە بوو، هاتە سەرم و پێلەقەیەکی تێکوتام و گوتی: هەستە چێشتمان بۆ لێنێ. کە لە خەو هەستام دیتم گەنجەکە زیندووبۆتەوە. زانیم چ ڕوویداوە. ئەمەیە هەقایەتی من (بووکۆکەی سەبووری)!

من سەبووری و تۆ سەبووری،

دڵم تاکەی سەبر بگرێ؟

لێرەدا (بووکۆکەی سەبووری) ورگی تەقی و کچەکەش قەڵەمبڕی دەرهێنا و ویستی ورگی خۆی بدڕێ، گەنجەکە لە حەشارگەکەی هاتە دەرەوەو پێی گوت:

ـ نەکەی! کەواتە تۆی ژیانی منت گێڕاوەتەوە؟ ئەی بۆچی تا ئێستا پێت نەگوتووم. هەستە چیدی خەفەت مەخۆ.

دڵی کچەکەی دایەوەو گوتی:

. بمبوورە!

لە ژوورەوە چووە خوارێ بە قەرەواشەکەی گوت:

. هەی دێڵە سەگی سەگباب، بۆچی واتکردووە؟

هەر گرتی و کردی بە دوو پارچەو فڕێی دایە سەر ڕێگا.
ئەوسا کچەکەی لە خۆی مارەکردو جیازێکی تازەی بۆ کردو چووە پەردەی.
بەو پەڕی شادی و خۆشی ژیان. ئینجا کچەکە لە دوای کەس و کاری خۆی نارد.
دایک و باوکی هاتن. کچەکە هەقایەتی خۆی لە سەری هەتا بنی بۆ گێڕانەوە.
هەموو شادو گوشاد بوون.
لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

* * *

## ٤٣ـ دوو پیرەژنی خوشك

هەبوو نەبوو....

دوو ژن هەبوون. یەکێکیان تەمەنی نەوەد ساڵ بوو، ئەوەی تر تەمەنی حەفتا ساڵ بوو. خوشك بوون. ئەوەی تەمەنی نەوەد ساڵ بوو لەرزۆك ببوو. کوڕی سوڵتان هەموو ڕۆژێ کە لە دیوەخان دەهاتەوە، بە بەردەم دەرگای ماڵیاندا تێدەپەڕی.

ڕۆژێ، ئەوەی تەمەنی حەفتا ساڵ بوو کوڕی سوڵتانی بینیو ئەشقی بوو. چوو قەنەفلو هێلو دنکەشیرنەو گوڵو سابوونو گەزۆی بۆنی کڕیو ئەمانەی هەمووی بە یەکەوە بە سابوون شووشتو ئاوەکەی ڕشت. کۆڵانەکەیان هەمووی بونی وەکو بۆنی مسكو عەنبەری لێ هات. کوڕی سوڵتان هەموو ڕۆژێ کە بەوێدا تێدەپەڕی، ئەو بۆنەی بۆ دەهات. سەری سووڕ ما بوو. دەیگوت:

. ئەوە کێ ئەو ئاوە دەڕێژێ؟ خەڵکی کوێیە؟!

ڕۆژێ، کوڕی سوڵتان کە بەوێدا هات ژنەکەی دی ئاوەکەی دەڕشت. ڕایگرتو پێی گوت:

. وەرە ئەمە چییە؟

ژنەکە گوتی:

ـ کچێکم هەیە هەموو ڕۆژێ دەستو پێی دەشۆم و ئاوەکە ئاوها لەبەر بۆنی لەشی بۆندار دەبێ.

کوڕی سوڵتان پێی گوت:

- بۆ نایەی بیدەیتە من؟

ژنەکە گوتی:

- بڕۆ، بڕۆ.

کوڕی سوڵتان گوتی:

- قەی ناکا داپیرە، یەکێك دەنێرم بیبینێ، ئەوسا مارەی دەکەین.

ژنەکە گوتی:

- ئەوە چ قسەیەکە تۆ دەیکەی؟! من کەسم ناوێ. ئەگەر بمەوێ بیدەم بە تۆ، شتەکە لە بەینی من و تۆ دەبێ. تۆ تەنیا ئەوندە یە ژوورەکە ئامادە کە، من بۆت دێنمە ژووری خۆت.

کوڕی سوڵتان گوتی:

- باشە.

دووسەد لیرەی دایە ژنەکە. ژنەکە پارەکەی وەرگرت. دیار بوو لە خوشکی بێزار بوو دەیەویست لە کۆڵ خۆی بکاتەوە، خوشکەکەی زۆر پیر بوو، لە پیرییان لەرزۆك ببوو. کوڕی سوڵتان گەڕایەوە ماڵێ. زۆر شادو خەندان بوو، پرسی بە کەس و کاری خۆی کرد گوتی:

- ژنێکی زۆر خاتوون و نازدارم دۆزیوەتەوە، هەندە هەندە جوانە! ئاوها و ئاوهایە. کە دەستی دەشوا دەستاوی هەمووی بۆن و هێل و مسکە!

گوتیان:

- بە ڕاستیتە؟

گوتی:

- ئەرێ بە خوا.

گوتیان:

- ماڵیان لە کوێیە؟ با بچین بیبینین!

گوتی:

- نا، نا. کەس ناچێ، خۆی دێ.

ژنەکەیش کە دوو سەد لیرەکەی وەرگرت، چوو جیازو پێویستی بووکی کڕیو ڕەوانەی کرد. ڕۆژی پاشی، خوشکی لەرزۆك و پشت کۆمی هێناو خێرا، بێ ئەوەی کەس بیبینێ، بردییە ژووری کوڕەکەو دەرگای داخست. کە ئێوارە داهات کوڕەکە چوو لە دەرگای دا. ژنەکە دەرگای کردەوەو دەستی خوشکی لەناو دەستی مێردەکەی ناو هەڵات. کابرا جلی نوستنی کردە بەرو خۆی ئامادە کرد. چووە لای بووك و پاڵێکی هێدی پێوەنا دیتی پیرەژنێکی لەرزۆکی نەوەد ساڵییە. لە رقان شێتگیر بوو، چووە دەرەوەو بانگی کەس و کارەکانی کرد. ژوورەکە قۆرتێکی بچووکی تێدابوو. کچی شای پەرییان بە خۆو بە دەستە خوشکەکانی خۆیان تێدا شاردبووەوە. تریق تریق بە پیرەژن پێدەکەنین. کچی شای پەرییان دومەڵێکی لە گەرووی هاتبوو. هەموو تەبیبان لێی حەیر مابوون، دەستە پاچە بوون پێیان چارەسەر نەدەکرا. لەو دەمەیدا کچی شای پەرییان لە حریتەی پیکەنینی دا دومەڵەکەی دەربوو. کە دومەڵەکەی دەربوو، زۆر شادو کەیفخۆش بوو. دەستە خوشکەکانەی پێیان گوت:

- فلانی، ئەم پیرەژنە بە سالاً چووە بوو، بوو بە ماوەیەی چاك بوونەوەی تۆ. چ پاداشتێکی پێدەبەخشی؟

کچی شای پەرییان گوتی:

- ئەو پاداشتەی پێدەبەخشم کە تەمەنی ببێ بە چواردە ساڵی و جوانی یوسفی ببێ.

بە کاری خوای پیرەژنەکە تەمەنی بوو بە چواردە ساڵی و ئەوەندە جوان بوو هەر باس ناکرێ!

کوڕی سوڵتان کە چووە دەرەوە، هاواری کرد:

- کورە، خوشکەکەی بگرن، نەڕوا!

گوتیان:

- بۆچی؟ ناوی خوات لەسەر بێ و خدرو ڕەحمان بتپارێزن!

گوتی:

- بووك پیرەژنێکی لەرزۆکی نەوەد ساڵییە.

پێیان گوت:

. بە ڕاستیتە؟

گوتی:

. ئەگەر بڕوا ناکەن بڕۆن خۆتان تەماشای کەن!

خزمو کەسو کارو دایکو مەتو خالەتی هەمووی حەپەسانو چوون دەرگای ژوورەوەیان کردەوە. کە دەرگای ژوورەوەیان کردەوە دیتیان بووک ئەوەندە جوانە لە جوانییان ژووری ڕووناك کردوەتەوە. گوتیان:

. کوڕەکەمان لە بەر جوانیی بووك ئەقڵی لە دەست داوە.

بانگیان کرد:

. وەرە سەیری ژنەکەت بکە.

کوڕی سوڵتان کە چووە ژوورەوە دیتی بووك وەکوو مانگ دەدرەوشێتەوە.

گوتی:

. شتێکی سەیرە! مەسەلە چییە؟

ژنەکە هاتە قسەو گوتی:

. تۆ باش نەتدیتم.

خزمو کەسو کارەکان چوونە دەرەوە. کوڕی سوڵتان چووە لای بووكو تا بەیانی بە خۆشیو شادی ڕایانبوارد.

بۆ بەیانی زیافەتی ڕۆژی بووکییان کردو لەو پەڕی خۆشی دابوون.

دەچینەوە لای ئەو خوشکەی کە هەڵات:

ژنەکە گوتی:

. ئێستا بە دوامدا دەگەڕێن.

حەوت ڕۆژ پێچوو، کەس بە دوایدا نەگەڕا. گوتی:

ـ دەترسم ئەو خوشکەم مێردی کردبێو منی جێ هێشتبێ. چوو پرسیاری کرد:

. ئایا کوڕی سوڵتان ژنی هێناوە؟

گوتیان:

. بەڵێ. کچێکی زۆر جوانی هێناوە. ئەوەندە جوانە دەڵێی مانگە!

ژنەکە، کاتێ ئەمەی بیست، زۆری خەفەت خواردو گوتی:

. ئەم پیرەژنە ڕموورنە بەختی هەستاوە. دەچم ئەو لەگەنە پیسەی بۆ دەبەمەوە کە پێویستی خۆی تێدا جێبەجێ دەکرد. دەبێ شانو شەوکەتی بشکێنم!

لەگەنەکەی لەبن عەبای شاردەوە. کە چووە ژوورەوەو، ماڵی سوڵتان لەبەری هەستانو پێیان گوت:

. چۆنی؟ سەرو سیحەتت چۆنە؟ ئەوە بۆچی دیار نی؟

گوتی:

. بەخوا ئیشم هەبوو.

چووە سەلال بۆ لای بووکو چووە ژوورەوە، پێی گوت:

. ئەوە چۆن خۆت وا لێکرد؟

بووک گوتی:

. خوا وای لێکرم.

پیرەژنەکە گوتی:

. ها، بگرە هەی نەگریسی ڕموورن، بگرە ئەمە لەگەنەکەی پێویستی خۆت تێدا جێبەجێ دەکرد!

بووک لەگەنەکەی وەرگرتو لە بن مێزی دانا. خوشکی بە مەلوولیو غەمباری چووە دەرەوەو گوتی:

. ئەم نەگریسو بەدکارە خوا ئاوڕی لێ داوەتەوەو بەختەوەری کردووە!

کە ئەو خوشکە چووە دەرەوە. ماڵی سوڵتان چوونە لای بووکو لێیات پرسی:

. ئەوە خوشکت چی بۆ هێنا بووی؟

گوتی:

. هیچی بۆ نەهێنا بووم.

پێیان گوت:

. شەرم مەکە! چۆن چی بۆ نەهێنا بووی؟ دیتمان شتێکی لە بن عەبای بوو!

بووەك لە دڵی خۆیدا گوتی: چبکەم؟ لەگەنەکە دەردێنمو نیشانیان دەدەم. لەگەنەکەی دەرهێناو دایە ژنەکان. کە دەری هێنا دیتیان هەمووی ببوو بە دوڕرو مەرجان. پێیان گوت:

. مادام وایە بۆچی دەرت نەدەهێنا؟ یان لە چاوی پیس دەترسای؟ ئەم لەگەنە لەسەر مێز دانێ. چونکە زۆر زۆر جوانە!

خوشکی بووکیش کە بە مەلووڵیو غەمباری چووە دەرەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی:

. ئەم ژنە نەگریسو بەدکارە کە من بەخێوم دەکرد بەختی هەستا، کەچی بەختی من هەر نووستووە. ئینجا گوتی: بەخوا دەچم بزانم لە کوێ ئەوها خۆی تازەو سپی کردوّتەوە!

چووە لای بووکو پێی گوت:

. کچێ پێم بڵێ لە کوێ خۆت تازەو سپی کردەوە. لە کوێ خۆت شووشت؟

بووك پێی گوت:

. لای قەسارچی خۆم تازەو سپی کردەوە.

ژنەکە گوتی:

. ئەو قەسارچییە لە کوێیە؟

بووك گوتی:

. لە فلانە جێیە. برۆ لایو پێی بڵێ:

. ها، ئەمە سێ سەد لیرەو وەکوو ژنی کوڕی سوڵتان منیش تازەو سپی بکەوە.

بووك ژنەکەی نارد بۆ ئەوەی لە کوڵ خۆی بکاتەوە. ژنەکە چوو. تووشی کابرایەکی کەمخوڵقی بێ پارەو دەرامەت هات. پێی گوت:

. ماڵی قەسارچی لە کوێیە؟

کابرا گوتی:

. من قەسارچیم. دەتەوێ تازەو سپیت بکەمەوە؟

ژنەکە گوتی:

. بەڵێ.

کابرا پێی گوت:

. پارەکەم بدەرێ!

ژنەکە سێ سەد لیرەی دایێ. کابرا گوتی:

. وەرە بچینە ماڵی ئێمە!

کابرا ژنەکەی بردەوە ماڵی خۆیان. بە مەترەقان وەریگەڕایی و گوتی:

- هەی لە خۆتیێ! مرۆڤ چۆن تازەو سپی دەکرێتەوە؟!

ژنەکە لە ژێر مەترەقان مرد. کابرا ناشتی و پارەکەی بۆ خۆی خەرج کرد. پاشان خوشکەکەی، کە ژنی کوڕی سوڵتان بوو، پرسی داخۆ ژنەکە چی بەسەر هاتووە. گوتیان:

- مردووە.

بووک زۆری پێ خۆش بوو. لەگەڵ مێردەکەی بە خۆشی و بەختەوەری ژیان.

لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

* * *

## ٤٤ـ شێری شێر لە پشتی شێر...

هەبوو نەبوو...

چۆلەگرێك (قوشچییەك) هەبوو، هەموو ڕۆژێ دەچووە سەر گووفەك و زبڵدان و چۆلەکەی دەگرت و یەکی بە پێنج فلسی دەدا. ڕۆژێ، سەر لە بەیانی چووە سەر گووفەك و چۆلەکەیەکی گرت. چۆلەکەکە پێی گوت:

ـ بەرەڵام کە دەوڵەمەندت دەکەم! دەوڵەمەندکەر هەر خودایە! ڕاوەستە پاش دەمێکی دی دوو کۆتر دێن. یەکێ نێرو یەکێ مێ. دێن پەڕێك بەردەدەنەوە. تۆ بڕۆ پەڕەکە هەڵگرەوە و بیبە بیفرۆشە.

چۆلەکەگر دوودڵ بوو. باوەڕی دەکرد و نەدەکرد. چۆلەکەکەی بەرەلا کرد و چوو لە کن دڕووی تانووك ڕاوەستا. دوای نەختێ دوو کۆتر بە لەنجە و لار هاتن کلکیان وەکوو یاقووت دادەییسا. وردە وردە نزیك کەوتنەوە. گەیشتنە سەر سەری کابرا. یەکێکیان پەڕێکی لێ کەوتە خوارەوە. پەڕ چ پەڕ!! گەورەیی بۆ ئەو خودایەی دروستی کردووە!! کابرای چۆلەکەگر پەڕەکەی هەڵگرتەوە، چۆلەکەکە پێی گوت:

ـ بڕۆ تا ماوی ئەوەندەت بەسە!

کابرا گوتی:

ـ خوا لێت بە زیاد کا چۆلەکە!

تومەز ئەو چۆلەکەیە کوڕە جنۆکە بوو. کۆترەکانیش منداڵە جنۆکە بوون. ئامۆزای چۆلەکەکە بوون. کابرای چۆلەکەگر پەڕەکەی بردو چووە بازاڕ. بە جوولەکەیەکی زێڕینگری گوت:

. ئەمەم لێ ناکڕی؟

گوتی:

. با.

جوولەکەکە چاوی بە پەڕەکە کەوت خەنی بوو. بە کابرای گوت:

. بە چەندی دەدەی؟

گوتی:

. بە دووسەد لیرە.

جوولەکەکە ڕازی بوو. دوو سەد لیرەی داو پەڕەکەی وەرگرت. پەڕەکەی بۆ کچی سوڵتان بردو پێی گوت:

. ها، تەماشاکە ئەم پەڕە چەند جوانە لە سەری خۆتی بدەی!

کچەکە کاتێ چاوی بە پەڕەکە کەوت، لە خەنی خۆشییان پێی بە عەردی نەدەکەوت! کچەکە هەر ڕایکرد بۆ لای باوکی و پێی گوت:

. باوکە، دەمەوێ ئەم پەڕەم بۆ بکڕی.

باوکی گوتی:

. باشە.

بە جوولەکەکەی گوت:

. نرخی چەندە؟

گوتی:

. هەزار لیرەیە.

پێیان گوت:

. زۆرە! نرخەکەمان نەختێ بۆ دابشکێنە.

جووە یەك فلسی دانەشکاند. هەزار لیرەی وەرگرت و ڕۆیشت. کچەکە زۆر شادو کەیف خۆش بوو. هەموو ڕۆژێ پەڕەکەی لەسەری خۆی دەدا. حەفتەیەك پێچوو، ڕۆژێ ژنێك هاتە میوانیان، کچەکە پەڕەکەی نیشان داو گوتی:

. چۆنی دەبینی؟

گوتی:

– زۆر نایابە. بەلام خۆزی کۆترەکەی خاوەنی ئەم پەڕەشت هەبوایە. زۆر باشتر بوو!

کچەکە گوتی:

. بە ڕاستیتە؟

گوتی:

. ئەریّ بە خوا، تەکبیر لەوە باشتر نابیّ.

کچەکە چووە لای باوکی و پێی گوت:

. باوکە، کۆترەکەی خاوەنی ئەم پەڕەم دەویّ.

باوکی گوتی:

. باشە.

باوکە کچەکەی خۆی زۆر خۆش دەویست. چونکە تاقانە بوو. لە دوای زێڕینگری نارد. زێڕینگر چووە حزوور سوڵتان و گوتی:

. ئەمر کە سوڵتان!

سوڵتان پێی گوت:

. کۆترەکەی خاوەنی ئەم پەڕەیەم دەویّ.

جوولەکەکە گوتی:

. بەخوا گەورەم نازانم لە کوێیە؟

سوڵتان گوتی:

ڕاست ناکەی!

جوولەکەی زێڕینگر گوتی:

بە عوزێرو بە شەمۆیل نازانم لە کوێیە.

سوڵتان گوتی:

. پێت بڕوا ناکەم. یان کۆترەکەم بۆ دێنی، یان لە سەرت دەدەم.

جوولەکە یەقینی دڵی هات کە نەجاتی نادەن. گوتی:

- باوەڕت بێ نازانم کۆترەکە لە کوێیە. بەڵام ئەگەر دەڵێن ئەو کەسەتان نیشان دەدەم کە پەڕەکەم لێ کڕی. جوولەکەکە هەستا چوو. کابرای چۆلەکە گری هێنا.
چۆلەکەگر چووە حزور سوڵتان و پێی گوت:
- ئەمر کە سوڵتان.
سوڵتان گوتی:
- کۆترەکەی خاوەنی ئەم پەڕەم لە تۆ دەوێ.
گوتی:
- لە کوێ بۆت بێنم؟
سوڵتان گوتی:
- پەڕەکەت چۆن هێنا، کۆترەکەش ئەوها بێنە.
گوتی:
من پەڕەکەم لەو گۆڕە هەڵگرتەوە.
سوڵتان پێی گوت:
- ئێستا گوێت لێبێ: ئەگەر کۆترەکەم بۆ نەهێنی لە سەرت دەدەم.
چۆلەکەگر گوتی:
- تکات لێ دەکەم بەڵکو لەم ئەرکە بمبووری. ئاخر کۆتر لە کوێ بێنم؟
سوڵتان گوتی:
- شتی وا نییە.
چۆلەکەگر گوتی:
- مادام وایە مانگێك مۆڵەتم بدە بەڵکو خوا دەرگایەکم لێ بکاتەوە بتوانم بیهێنم.
بەم جۆرە کابرای چۆلەکەگر بە کزو مەلوولی و بە گریەو زاری چووە دەرەوە. یەکسەر چووە سەر گووفەك. لە دڵی خۆیدا گوتی: بەڵکو خوا بکا چۆلەکەی گۆڕین بگرم. لە پڕ گوێی لە چریکەی چۆلەکەیەك بوو. دەیگوت: هۆ فڵان کەس، ئەوە بۆچی هاتووی؟
چۆلەکەگر گوتی:
- توخوا تۆ بۆچی تووشی ئەم بەڵایەت کردم.
چۆلەکەکە گوتی:

ـ بۆچی؟ چ بووە؟

چۆلەکەگر گوتی:

ـ پەڕەکەم برد بە دوو سەد لیرە فرۆشتمە جوولەکەیەك. جوولەکەکەش بە هەزار لیرە فرۆشتییە کچی سوڵتان. ئێستا کچی جوان کۆترەکەی خاوەنی پەڕەکەی دەوێ. ئەی چۆلەکە ئەگەر خوا تۆی پێشان نەدابام، بۆ خۆم بە ئاسوودەیی دەژیام. ڕۆژێ، ڕاوی خۆم دەکردو پێنج شەش قرۆشم دەهاتە دەست و پێی دەژیام.

چۆلەکەکە گوتی:

ـ هیچ خەمت نەبێ. تۆ چاکەت لەسەر منە. وەرە پێت بڵێم: ئەم دوو کۆترە نێرەو مێیەن. لە ناو ڕکەوێکدان چوار دێویان لە دەورەیە. دەڵە دێوێکیش سەرۆکایەتییان دەکا. دوو کۆترەکە هی ئەو دەڵە دێوەن. ئێستا چ بکەین؟

چۆلەکەگر گوتی:

ـ تۆ چ دەڵێی وا دەکەین! من هیچ نازانم.

چۆلەکەکە گوتی:

ـ وەرە بە یەکەوە بچین. من بە فڕین و تۆ بە پێ تا دەگەینە بەر دەرگای کۆشکەکە. دەبینی دەڵە دێوەکە دەستاڕ لێ دەکا. بە شێنەیی بڕۆ شیری مەمکی بمژەو ئاردەکەی هەڵلوشەو دەستی ماچ کە. بەڵکو دڵی نەرم بێ و یەکێ لە کۆترەکانت بداتێ.

چۆلەکەگر گوتی:

ـ فەرموو، با بچین.

ڕۆیشتن. چۆلەکەکە لە سەرەوە بە فڕین و چۆلەکەگر لە خوارەوە بە پێ ڕۆیشتن تا گەیشتنە کۆشکەکە. چۆلەکەگر چووە ناو کۆشك و چۆلەکەکە لەبەر دەرگا مایەوە. دەڵە دێوەکە دەستاڕی لێدەکرد. چۆلەکەگر بە شێنەیی لە پشتەوە لێی وەرسوڕایەوەو وەك برووسکە پەلاماری داو شیری مەمکی مژی و ئاردەکەی هەڵلووشی. دەڵە دێوەکە گوتی:

ـ ئەوە بۆچی هاتووی؟ لە کوێوە هاتووی؟ لە عاسمانان هاتیتە خواریێ؟ یان لە عاردان هاتیتە دەرێ؟ ئەگەر شیری مەمکی منت نەمژیباو ئاردی منت

هەڵنەلووشییا، هەر ئێستا دەمخواردی. بەڵام تۆ تازە بووی بە کوڕی من. ئینجا لێی پرسی:

- پێم بڵێ بە چ ئیش هاتووی؟

چوڵەکەگر هەقایەتی خۆی بۆ گێڕایەوەو داوای کۆترەکەی لێکرد. دەڵە دێو گوتی:

- ناتوانم بتدەمێ! خۆم بەخێوم کردووەو لە ناو چاوو لە بن ددانی خۆم هەڵمگرتووە.

چوڵەکەگر گوتی:

- تکات لێ دەکەم. لێت دەپاڕێمەوە! ئەگەر نەیبەم، بە کوشتن دەچم.

دەڵە دێوەکە گوتی:

- (إنا لله و إنا إليه راجعون)!

هەستا کۆترەکەی دایێ. چوڵەکەگر کۆترەکەی وەرگرتو دەستی دەڵە دێوەکەی ماچ کردو ماڵاوایی لێکردو ڕۆیشت. چووە لای چوڵەکەکەو پێی گوت:

- هێنام!!

چوڵەکەکە گوتی:

- باشە.

بە دوو قۆڵی ملی ڕێیان گرت. عەردی گەورەو فراوانی خوایان دایە پێش. ڕۆیشتن تا گەیشتنەوە شار. لەوێ چوڵەکەکە گوتی:

- بڕۆ بەرەکەتی خوات لەگەڵدا بێ. هەرچی ویستت من ئامادەم!

ماڵاواییان لە یەکتر کردو چوڵەکەگر چووە دیوانی سوڵتانو کۆترەکەی دەرهێنا. خەڵکەکە هەموو چاویان زەق بووەوە. سەریان لە کۆترەکە سوڕما. دوو هەزار لیرە پاداشتیان دایێ. کاتێ کچی سوڵتان چاوی بە کۆترەکە کەوت، لە خەنی خۆشییان شاگەشکە بوو. بانگی دەستە خوشکەکانی کرد. هەموو بە دیتنی کۆترەکە شادو کەیف خۆش بوون. یەکێ لە دەستە خوشکەکانی کچی سوڵتان گوتی:

- کچی سوڵتان، ئەم کۆترە پێویستی بە ڕکەوێکی زێڕە لە ناوی دابنێی!

کچی سوڵتان چوو بە باوکی گوت:

- باوکە، رکەوێکی زێڕم دەوێ بۆ کۆترەکەم.
باوکی گوتی:
- باشە.
سوڵتان بانگی زێڕینگری کردو پێی گوت:
دەمەوێ رکەوێکی زێڕم بۆ دروست بکەی لە دونیادا وێنەی نەبێ.
زێڕینگر گوتی:
- باشە.
زێڕینگر رکەوێکی زێڕی بۆ سوڵتان دروست کرد. سوڵتان رکەوەکەی پێشکەش کچەکەی کرد. کچەکە کۆترەکەی لە ناو رکەوەکە دانا. کۆترەکە دەستی بە سەماو گۆرانی کرد. کچەکە زۆر کیفخۆش بوو. کچی سوڵتان بەر لەوە حەزی لە مێرد بوو، بەڵام کە کۆترەکەی بۆ هات، سەرقاڵی کۆترەکە بوو. ئارەزووی مێرد کردنی لە بیر چووەوە. خوشکی ئەم کچە ژنی سوڵتانی مەغریب زەمین بوو. ڕۆژێ، بە مێوانداری هاتەوەماڵی باوکی و کۆترەکەی بینی. بە خوشکی گوت:
- ئەم کۆترە مێیە پێویستی بە نێرەکەی هەیە. ئەگەر نێرەکەی لە گەڵدا بێ. زۆر زۆر جوان دەبێ. کچەکە کە ئەم قسەیەی بیست، کەوتە بن بارەکی غەمان، چووە لای باوکی و پێی گوت:
- باوکە، نێرەی ئەم کۆترەم دەوێ بۆ ئەوەی جوانتر بێ!
باوکی گوتی:
- باشە.
سوڵتان لە دوو جوولەکەی ناردو پێی گوت:
- بڕۆ چۆلەکەگرەکەم بۆ بێنە.
چۆلەکەگر هات، گوتی:
- سوڵتان، ئەمر کە!
سوڵتان پێی گوت:
- نێرەی کۆترەکەم دەوێ.
چۆلەکەگر گوتی:
- جەنابی سوڵتان، ئەوەم بۆ ناکرێ.

سوڵتان پێی گوت:

- هیچ قسە مەکە. مادام مێیەکەت هێنا، نێرەکە ماوە، دەبێ ئەویش بێنی.

چۆلەکەگر گوتی:

- ئەی سوڵتان، بکە بۆ خاتری خوا ناتوانم.

سوڵتان گوتی:

- ئەگەر بۆم نەهێنی لە سەرت دەدەم.

چۆلەکەگر گوتی:

- مادام وایە مانگێك موڵەتم بدەرێ. بزانین خوا چ دەکا!

سوڵتان گوتی:

- باشە.

چۆلەکەگر ڕۆیشت. بە کزو داماوی ڕووی کردە گووفەکەکە بەڵکو چۆلەکەی تاین ببینێ. چۆلەکەکە لەوێ بوو. کابرای دیو پێی گوت:

- کووە دیسان هاتی؟

چۆلەکەگر گوتی:

- چۆلەکەی ئازیز، هەر دەردو بەڵایەکی بە سەرم دێ، بە هۆی تۆیە بە سەرم دێ.

چۆلەکەکە گوتی:

- بۆچی؟

چۆلەکەگر گوتی:

- ئەم جارە کۆترە نێرەکەیان لە من دەوێ منیش تێماوم نازانم چبکەم؟!

چۆلەکە گوتی:

- خەم ناکا. هەستە بچینە لای دەڵە دێوەکە. بەشکو کۆترە نێرەکەشت بداتێ.

چۆلەکەگر گوتی:

- با بڕۆین!

عەردی گەورەو هەراوی خوایان دایە پێش. ڕۆیشتن تا گەیشتنە کۆشکەکە. چۆلەکەکە لەبەر دەگا مایەوەو چۆلەکەگرچووە ژوورەوە دیتی دەڵە دێوەکە دەستاڕ لێدەکا. بە بێدەنگی، بەڵام وەك برووسکە، لە پشت دێوەکە سوڕایەوەو شیری مەمکی مژیو ئاردەکەی هەڵلووشی. دەڵە دێوەکە گوتی:

. ها، کوڕم، دەبینم دیسان هاتیتەوە. ئەم جارە چت دەوێ.
چۆلەکەگر گوتی:
. نێرەکەی ئەو کۆترەی داتە من.
دەڵە دێو گوتی:
. هەر کڕ بە کڕ! بە خوا ئەگەر شیری منت نەخواردبا هاژن هاژانم دەکردی.
چۆلەکەگر گوتی:
. ئیشەکەم دایە دەست خۆت! چاوم لە چاکەو دڵ گەورەیی تۆیە!
دەڵە دێوەکە گوتی:
. وەرە لە باتی کۆترەکە تاوسێکت دەدەمێ.
چۆلەکەگر گوتی:
. لە کۆترە نێرەکە بترازێ قەت هیچم ناوێ. چونکە هیچ دادم نادا.
دەڵە دێوەکە گوتی:
. جۆرە باڵندەیەکت دەدەمێ. لە ئاسماندا دەفڕێ و دەخوێنێ.
چۆلەکەگر گوتی:
. کۆترە نێرەکە نەبێ نامەوێ.
دەڵە دێوەکە گوتی:
. خوا تۆی لە کوێ لە من پەیدا کردو لێی کردمییە تاسپ و قاندڕ؟!
هەستا کۆترە نێرەکەی دایێ. چۆلەکەگر دەستی دەڵە دێوەکەی ماچ کردو ماڵاوایی لێ کردو ڕۆیشت. کە چووە دەرەوە، چۆلەکەکە پێی گوت:
. ها، هێنات؟
گوتی:
. بەڵێ هێنام.
چۆلەکەکە گوتی:
. بە ڕاستیتە؟
گوتی:
. ئەرێ بە خوا! ئەوەتانێ.
کۆترە نێرەکەی نیشان داو گوتی:

. با بڕۆین!

عەردی گەورەو هەرای خوایان دایە بەر. (دە) ڕۆژ ڕۆیشتن تا گەیشتنەوە جێ.

چۆلەکەکە بە کابرای گوت:

. ئێستا بڕۆ کۆترەکە بۆ سوڵتان ببەو هەر دەردو بەڵایەکت بە سەر هات وەرە لام.

ئیتر خوا حافیزی کردو فڕیو ڕۆیشت. چۆلەکەگر چووە دیوانی سوڵتان. کۆترە نێرەکەی دەرهێنا بۆ ئەوەی بیبینن.

سوڵتان پێی گوت:

. بە ڕاستی تۆ بە توانای!!

ئەو خەڵکەی لەوێ بوون هەموو گوتیان:

ـ ئافەرین بۆ تۆ چۆلەکەگر. ئەوە چۆن کۆترە مێیەکەو نێرەکەیشت هێنا.

چۆلەکەگر بۆی باس کردن تووشی چ ئازارو ئەشکەنجەیەك هات.

سوڵتان هەستا دوو هەزار لیرەی پاداشت دایێ. چۆلەکەگر خەنی بوو. سوڵتان کۆترە نێرەکەی پێشکەش کچەکەی کرد. کچەکە کاتێ چاوی پێکەوت، لە کەیف خۆشییان وەخت بوو باڵ بگرێ. کۆترە نێرەکەی بەردایە تەك مێیەکەی. دوو کۆترەکە پێك شادبوونەوە. کچەکە نەخۆش کەوت کەس و کاری بردیانە لای تەبیب، سوودی نەبوو. حەیرمان چ بکەن!

ڕۆژێ، کابرایەکی عەجەم هات بانگی ڕادەهێشت:

– تەبیب! تەبیب!

گوتیان:

– بانگی کەن! بیهێنن!

بانگیان کرد. بردیانە سەر کچەکە. تەبیب تەماشای کچەکەی کرد. گوتی:

ـ ئەم نەخۆشە دەرمانەکەی ئەمەیە: (شیری شێر لە مەشکی شێر شیر هەڵیگرێ...). گوتیان:

. ئەمە بە کێ دەکرێو ئەو شیرە بە کێ دێ؟

گوتیان:

. ئەم شیرە بە کەس نایێ ئەو کەسە نەبێ کە کۆترەکەی هێناوە.

سوڵتان لە دوو جوولەکەی ناردو پێی گوت:
. برۆ چوڵەکەگرەکەم بۆ بێنە.
جوولەکەکە گوتی:
. ئە تۆ وەرە تووشی چ بەڵایەك هاتین. ها؟!
هەستا چووە لای چوڵەکەگرەکە.
چوڵەکەگر گوتی:
. ها دیسان چت دەوێ؟
جوولەکەکە گوتی:
. سوڵتان تۆی دەوێ.
چوڵەکەگر گوتی:
. دە بڕۆ!! ئەم جارە چی لە من دەوێ؟
جوولەکەکە گوتی:
. نازانم.
چوڵەکەگر چووە لای سوڵتان و گوتی:
. فەرموو جەنابی سوڵتان، چ ئەمرێکت هەیە؟!
سوڵتان گوتی:
ـ دەمەوێ ئەم دەرمانە بۆ کچەکەم بێنی: (شیری شێر لە مەشکی شێر. شێر هەڵیگرێ...)
چوڵەکەگر گوتی:
ـ هەر ئەوە ما بوو؟! جارێ داوای کۆتری مێیەم لێ دەکەی؟ جارێ داوای نێرەکەی دەکەی. ئێستاش شیری شێرت دەوێ! ئەم جوولەکە بەدفەڕە بۆ من لە کوێ پەیدا بوو؟
ئینجا گوتی:
. جەنابی سوڵتان، من ناتوانم شیری شێرت بۆ بێنم!
پاشان گوتی:

. مادام وای لێهات ئەم شێرە شیرەکە هەڵناگریێ ئەگەر بە سەر قاڵی قەبارە جۆراو جۆردا نەڕوا بە مەرجێ لەم جوولەکەیەی بسەنن و لە هنداو شارەوە تا ماڵی سوڵتان ڕایبخەن.

سوڵتان گوتی:

. زۆر باشە.

(ئەم چۆلەکەگرە بۆ وای گوت؟ چی دەویست؟ دەیەویست جوولەکەکە بفەوتێنێ!)

ئەوسا چۆلەکەگر دیسان مانگێك مۆڵەتی وەرگرت و چووە سەر گووفەکەکە. چۆلەکەکە لەوێ بوو. چۆلەکەکە، کاتێ چاوی پێکەوت، گوتی:

. ئەم جارە بۆچی هاتووی؟

گوتی:

. ئەم جارە سوڵتان داوای ئەم دەرمانەی کردووە: (شیری شێر، لە مەشکی شێر، شێر هەڵیگرێ...).

چۆلەکەکە گوتی:

. عەجایب!

چۆلەکەگر پێی گوت:

. چۆلەکەی ئازیز، چۆن من تۆم ڕزگار کرد، دەبێ تۆیش ئەوها من ڕزگار بکەی!

چۆلەکەکە گوتی:

. تۆ چاکەت هەیە لەسەر من. تۆ منت گرت و بەرەلات کردم. هەستە با بچینە لای دەڵە دێوەکە بەڵکو داواکەت جێ بەجێ بکا.

چۆلەکەگر گوتی:

. با بچین.

ڕۆیشتن. بڕۆ بڕۆ. لێرە چوونە ئەوێ، لەوێ چوونە ئەولای تا گەیشتنە کۆشکەکە. چۆلەکەگر چووە ناو کۆشکەکە دیتی دەڵە دێوەکە دەستاڕ لێدەکا. بە لەزو بەز پەلاماری داو شیری مەمکی خوارد و ئاردەکەی هەڵلووشی. دەڵە دێوەکە پێی گوت:

. ئەوە تۆی؟ چۆنی؟

چۆلەکەگر گوتی:

. لە خوای بە زیادبێ، تۆ چۆنی؟!

دەلەدێو گوتی:

. خۆشی تۆم دەوێ.

ئینجا پێی گوت:

. بڵێ ئەم جاری چت دەوێ؟

چۆلەکەگر گوتی:

. ئەم جارە بۆ دەرمانێك هاتووم. دەرمانەکە ئەمەیە: (شیری شێر، لە مەشکی شێر، شێر هەڵیگرێ...)!

دەلە دێوەکە گوتی:

. ئەم جارە داواکەت ئاسانە. ئەمە چۆنە؟

چۆلەگر گوتی:

. ئەمەیان لێ داواکردووم.

دەلـە دێوەکـە هەسـتا بـانگی هـەموو دێوەکـانی کـرد. سـێ پێسـتە شـێری بـۆ فرێدان و پێی گوتن:

. هەر ئێستا دەچن شیری شێر دەدۆشنە ناو ئەم پێستانەو پڕیان دەکەن.

گوتیان:

. باشە.

بـە ماوەیـەکی کـەم دێوەکـان لـە کارەکـەیان بوونـەوە. دەلـە دێوەکـە دەرکـی پێستەکانی بەست و بـانگی شـێرێکی کـرد. درێـژی دە گـەزو پـانی دە گـەز بـوو. پێی گوت:

ـ هـا، ئەمـە بگـرە لەگـەڵ ئـەم کوڕەمـدا، کـە بنیادەمـە، بـڕۆ و بیگـەیـنـەوە نـاو مـاڵی خۆیان. ئەگـەر تـۆ نەڕۆیشـتی و لێـی دای هـیچ مـەڵێ. ئەگـەر مانـدوو بـوو سـواری پشتت بوو، ڕەتی مەکەوە. خۆتی بۆ لارکەوەو یارمـەتی بـدەو بیگـەیـنـەوە مـاڵێ. ببیستم سەرپێچیت کردووە، سەرت دەبڕم. شێرەکە گوتی:

- ئەمری تۆ لەسەر سەرم. پێستە شێرەکانی هاوێشتە سەر پشتی خۆی و بە پێش چۆلەکەگرەکە کەوت. لە کۆشك چوونە دەرەوە. چۆلە بە چۆلەکەگری گوت:

- ئەوەی دەتەویست پەیدات کرد؟!

گوتی:

- بەڵێ.

چۆلەکەگرو شێرەکە ڕۆیشتن. چۆلەکەکەش لە پێشیانەوە دەفڕی ڕێگای نیشان دەدان. بڕۆ بڕۆ. لێرە بڕۆ ئەوێ، لەوێ بڕۆ ئەولای تا گەیشتنەوە هنداو شار. دیتیان خەڵك کۆبوونەتەوە چاوەڕێی هاتنەوەی چۆلەکەگرەکە دەکەن. خەڵکەکە لەنکاوڕا دیتیان کوڕەکە هاتەوە شێرێکی داوەتە پێش خۆی هەر مەپرسە چ شێرێکە! خەڵکەکە لە ترسان هەمووی هەڵاتن. سەریان سوڕمابوو دەیان گوت:

- ئەوە ئەم کوڕە چەندە ئازاو بە جەرگە. بەخوا ئەمە شایەنی هەموو ماڵی دونیایە.

چۆلەکەگر بە سەر قاڵییەکاندا ڕۆیشت کە لە جوولەکەکەیان سەند بوو. جوولەکەکە لە خەفەتان وەزگیداو مرد. چۆلەکەگر چووە ماڵی سوڵتان و شێرەکەی لەسەر پشتی شێرەکە داگرتە خوارێ. شێرەکە سەلامی بۆ چۆلەکەگر وەرگرت و خوا حافیزی کرد و گەڕایەوە جێگای خۆی. خەڵکەکە هەر یەکە لە جێی خۆی دەیگوت:

- ئەگەر کچێکم هەبوایە دەمدایە ئەم کوڕە. سوڵتان هات. شێرەکەی دی. چۆلەکەگر ویستی بڕوا. سوڵتان پێی گوت:

- وەرە دانیشە مەڕۆ!

شێرەکەیان دەرخواردی کچەکەدا. کچەکە نزیکەی دە ڕۆژ شێرەکەی خواردەوە تا چاك بووەوە. سوڵتان کۆڕێکی گەورەی بەست. لە دوای مەلا و کوێخوای نارد. کچەکەیان لە کوڕەکە مارە کرد. کچەکەیش زۆری کەیف پێهات کە لە کوڕەکەیان مارەکرد چونکە هەرچی داوای کردبوو کوڕەکە بۆی هێنابوو. سوڵتان چووە بازاڕو هەموو پێویستییەکی زەماوەندی شاهانەی بۆ کڕی و کۆشکێکی لە سەر کەناری دەریا بۆ دروست کرد.

ڕۆژی چوار شەممە جیازەکەیان هێناو ڕۆژی پێنج شەممە بووکیان گواستەوەو شەو کوڕەکە چووە پەردە. زۆر بە شادی و گوشادی ژیان. کوڕەکە بوو بە وەزیری سوڵتان و سوڵتان بوو بە مامی.

ڕۆژێ لە ڕۆژان، سوڵتان تووشی نەخۆشییەك هات بە کەس چاك نەبووەوە. کۆچی دوایی کرد. زاواکەی بە ئەرکی سەرشانی هەستا. کفن و دفنی کردو خێرو سەدەقەی بۆ کردو داوای لە خەڵك کرد گەردەنی سوڵتان ئازاد بکەن و دوعای خێری بۆ بکەن. ئەوسا کوڕەکە لە جێی سوڵتانی مامی لەسەر تەخت دانیشت. زۆر بە خۆشی و شادی ژیان.

لای ئێوە بووین و هاتینەوە

* * *

## ٤٥ـ خاڵو خوارزا

هەبوو نەبوو...

بازرگانێك هـەبوو، كوڕێكو كچێكی هـەبوو. كوڕەكـە تەمـەنی پـازدە ساڵ بـوو. كچەكە تەمەنی دە ساڵ بوو. ڕۆژێ، كوڕەكەو كچەكە لەگەڵ باوكیـان لـە شانشین دانیشتبوون مێوژە ڕەشكەیان دەخوارد. كچەكە گوتی:

- ئۆی، ئەم مێوژە ڕەشكە چەند خۆشە!!

باوكی پێی گوت:

- دیارە تۆ حەزلە قووڵە ڕەشێك دەكەی.

ئینجا بە كوڕەكەی گوت:

- هەستە ئەم كچە ببە چۆڵەوانیو سەری ببڕەو خوێنەكەی لە فنجانێك بكەو بۆم بێنە.

كوڕەكە بە باوكی گوت:

- شتی وا چۆن دەبێ؟ خوشكی خۆمە، چۆن سەری ببڕم.

كوڕەكە خوشـكی خـۆی خـۆش دەویسـت. خوشكیشـی ئـەوی خـۆش دەویسـت. بـاوكی كـە دیتـی كوڕەكـەی ڕازی نییـەو مـل بـادەدا، بـە تـوڕەیی تێڕاخـوڕیو گوتی:

- گوێت لێنەبوو چیم گوت؟ هەر ئێستا هەستە بیبە سەری ببڕە؟

كوڕەكە خوشكی بردو گوتی:

- بڕۆ خوشكم، سەرمان هەڵگرینو بڕۆین. خوا كوێی بە نسیب كردووین دەچینە ئـەوێ. خوشـكو بـرا ڕۆیشـتن. هـەر ڕۆیشـتن ڕۆیشـتن تـا گەیشـتنە كۆشـكێك.

کۆشکەکەیان کردەوەو چوونە ژووورەوە. کچەکە لە خوارەوە دانیشت و کوڕەکە چووە سەلال. کۆشکەکە چل ژووری قوفڵدراوی تێدابوو. هەر دەرگایەك کلیلی خۆی لەسەر بوو. کوڕەکە دەرگای هەموو ژوورکانی کردەوە دیتی هەمووی زێڕو ئاوریشم و یاقووت و مەرجانە. تەنیا ژوورێك دێوێکی لێ بەسرابووەوە.

دێوەکە بە کوڕەکەی گوت:

- کۆت و زنجیرم لێ بکەوە.

کوڕەکە گوتی:

- ناتکەمەوە! چۆن دەتکەمەوە؟!

ئەوسا کوڕەکە بە خوشکی گوت:

- خوشکم، هەموو ژوورەکان بکەوە. تەنیا فلانە ژوور نەبێ. ئەو ژوورە مەکەوە!

خوشکی پێی گوت:

باشە.

کوڕەکە هەموو ڕۆژێ دەچووە ڕاو. نزیکەی دوو مانگ بەم جۆرە لە کۆشکەکەدا مانەوە. کوڕەکە ڕاوی دەکردو کچەکەیش چێشتی لێ دەناو دەیانخوارد.

ڕۆژێ، کە کوڕەکە بۆ ڕاووشکار چووە دەرەوە، کچەکە چووە سەلال و دەرگاکانی کردەوە. ئەو ژوورە ما کە برای گوتی نەیکەیتەوە، هەستا ئەویشی کردەوە. دیتی دێوێك بەسراوەتەوە. دێوەکە پێی گوت:

- بمکەرەوە دەتهێنم. دەتکەم بە هاوسەری خۆم. کچەکە دێوەکەی کردەوەو دێوەکە هێنای. کچەکە گوتی:

- ئەدی برام؟

دێوەکە گوتی:

- برات چ ئاگای لە ئێمەیە! کە ئەو چووە دەرەوە بۆ ڕاو ئێمە لێرە بۆ خۆمان خەریکی ئیشی خۆمان دەبین.

کچەکە ڕازی بوو. بەم جۆرە مانەوە تا کچەکە سکی بوو. برای هەر پێشی نەزانی. ڕۆژێ، کاتێ برای چوو بۆ ڕاو، کچەکە کەوتە بەر ژان و کوڕێکی بوو. بە دێوی مێردی گوت:

ـ ئـەم كـوڕە ببـە فڕێـی دە سـەر ڕێگـای بـرام. كـە هاتـەوە دەیبینـیٚ و بۆمـانی دێنێتەوە. دێوەكە ئازا بوو چوو كوڕەكەی فڕیٚ دایە سەر ڕێگا. كاتیٚ برا لـە ڕاو هاتـەوە، گـوێی لـە واقـە واقـی كۆرپەیـەك بـوو. چـووە سـەری دیتـی كـوڕە. هەڵیگرتەوەو بردییەوە ماڵیٚ و بە خوشكی گوت:

ـ خوشكم!

خوشكی گوتی:

ـ بەڵیٚ چاوەكەم.

گوتی:

ئەم كوڕەم هەڵگرتۆتەوە! بەخێوی كە، خێرت دەگاتیٚ.

خوشكی گوتی:

ـ باشـە، بێنـە بمـدەریٚ. منـیش لـە قـاپی خـوا دەپاڕێمـەوە بـەڵكو مـەمكم شـیری بكەوتیٚ و بە شیری خۆم گەورەی بكەم.

برای گوتی:

ـ چاك دەكەی خوشكم.

بەیانی كوڕەكە چووە دەرەوە بۆ ڕاو و شكار. كە هاتەوە، خوشكی پێی گوت:

برام، خوا كردی شیری منداڵەكەم كەوتە مەمكان.

برای گوتی:

– ئەتۆ ئەو خوایە!؟

خوشكی گوتی:

ـ ئەریٚ خوا لەسەر رانی ئاگای لێیە.

منداڵەكەی هێنا لە پێش برای مەمكی خۆی لە زاری ناو شیری داییٚ.

برای گوتی:

ـ خوشكم، باش بەخێوی كە، خێرە!

خوشكی گوتی باشە برام.

ئەم كچە، كە برای دەچووە ڕاوو شكار بە خۆیو بە دێوەكە ڕایاندەواردو كە برای دەهاتەوە دێوەكەی دەشاردەوەو خۆی بەچێشت لێنانـەوە خەریك دەكرد. بەم جۆرە بەردەوام بوون. تا كوڕەكە تەمەنی بوو بە پێنج ساڵی. كوڕەكە بە برای

کچەکەی دەگوت خالۆ. برای کچەکە بچووبایە هەر شوێنێ، کوڕەکە بانگی دەکرد خالۆ. ڕۆژێ، کە برا چووە ڕاو، کچەکە لەگەڵ دێوەکە تەگبیریان کرد گوتیان: چ لەو پیاوە بکەین؟ کچەکە گوتی:

. باشە ناتوانی بیکوژی؟!

دێوەکە گوتی:

. با.

منداڵەکە گوێی لە قسەکەیان بوو.

کچە بە دێوەکەی گوت:

. بە چ شێوەیەك دەیکوژی؟!

دێوەکە گوتی:

. خۆم لە پشت دەرگا دەنێم کە چووە دەرەوە، قەپ لە قاچی دەدەمو دەیکوژم.

منداڵەکە گوێی لە قسەکە بوو. ئێوارێ کە برای لە ڕاو هاتەوە، منداڵەکە( کە خوارزای خۆی بوو و ئەو نەیدەزانی) چووە بەرایی و گوتی:

. خالۆ! خالۆ! چۆنی؟

گوتی:

. لە خوای بە زیاد بێ!

ڕۆژی پاشی دێوەکە چوو خۆی لە پشت دەرگا شاردەوە. منداڵەکە دیتی و چوو بە خالۆی گوت:

. خالۆ، ئەمڕۆ، کە ویستت دەربچی بۆ ڕاو، پێم بڵێ.

گوتی:

. باشە.

خالۆ نانی خواردو دەستی دایە کەلو پەلەکانی بۆ ئەوەی بچێتە ڕاو. خوارزای پێی گوت:

. خالۆ. بە خوا من هەڵت دەگرمو لە دەرگا دەتبەمە دەرەوە.

خالۆ گوتی:

. شتی وا چۆن دەبێ؟

منداڵەکە گوتی:

. یان هەڵت دەگرم؟ یان خۆم دەکوژم.
برا گوتی:
. باشە وەرە هەڵمگرە.
منداڵەکە خاڵۆی هەڵگرت و لە دەرگا بردییە دەرەوە. کە دێوەکە قاچی کوڕی خۆی بینی، نەیتوانی قەپی لێبدا. بە کچەکەی گوت:
. ئەم کوڕەت لێنەگەڕا بیکوژم. تا ئەم منداڵە هۆشیار بێ، ئێمە نابێ قسە بکەین. کە نووست دەبێ ئەوسا قسە بکەین. منداڵەکە گوێی لەم قسانەیش بوو. شەو ڕاکشا و وای پێشان دا خەوتووە. سەیریان کرد. وایانزانی خەوتووە. بەڵام ڕاستییەکەی نەخەوتبوو، بە ئاگا بوو. دێوەکە بە کچەکە گوت:
چۆن بیکوژین؟
کچەکە گوتی:
. خۆت دەزانی. دێوەکە گوتی:
ـ بەیانی دەچمە سەر ڕێی ڕادەوەستم کە هاتە دەرەوە بچێ بۆ ڕاو پەڕی دەدەمێ و دەیخۆم.
کچەکە گوتی:
– باشە!
ـ ڕۆژی پاشی، کە برای کچەکە (خاڵی منداڵەکە) نانی خواردو دەستی دایە کەل و پەلەکانی بۆ ئەوەی دەربچێ بۆ ڕاوو شکار، منداڵەکە گوێی لە قسەکانی ببوو، بە خاڵۆی گوت:
. خاڵۆ! خاڵۆ!
. فەرموو گیانی خاڵۆ.
گوتی:
. دوێنێ من تۆم هەڵگرت، دەمەوێ ئەمڕۆ تۆ من هەڵبگری.
خاڵۆی گوتی:
. بەو پەڕی شادی.

منداڵەکەی هەڵگرت و چووە دەرەوە. کە لە دەرگا چوونە دەرەوە، دێوەکە سەری کوڕی خۆی بینی گوتی: بە ڕاستی شتێکی سەیرە! کە لە دەرگا چوونە دەرەوە، منداڵەکە گوتی:

. خاڵۆ دامنێ، دێمە خوارێ.

خاڵۆ منداڵەکەی دانا و منداڵەکە گەڕایەوە. کاتێ، دێوەکە کوڕەکەی خۆی بینی، پڕی نەدایە کابرا. گەڕایەوە لای ژنەکەی و پێی گوت:

. ئەم کوڕە چەتوونەت لێنەگەڕا پڕ بدەمە خاڵۆی. ئەمە لە سۆنگەی چی وا دەکا؟ ئینجا گوتی:

. ئەم چەلە خۆم دەکەمە دوورپشك و دەچمە ناو ئێمەنی برات. کە ئێمەنی لەپێ کرد، بە پێیەوە دەدەم و دەیکوژم. کچەکە گوتی:

. باشە.

منداڵەکە گوێی لەمەیش بوو. ئێوارێ کە کابرا لە ڕاو هاتەوە. منداڵەکە چووە بەرایی و پێی گوت:

. خاڵۆ! خاڵۆ!

گوتی:

. بەڵێ چاوی خاڵۆ!

گوتی:

. دێوێك هەیە. دایکم حەزی لێدەکا. ڕێککەوتوون تۆ بکوژن!

گوتی:

. مەترسە، ئێمە خوامان لەگەڵە.

بەیانی، برا بە پێ خاوسی چووە ڕاو. دێوەکە هاتە دەرەوە و گوتی:

. چ بکەین؟! چ لەگەڵ ئەم کوڕە بکەین؟

کچەکە پێی گوت:

ئەویش بکوژە و کوڕەکەشت بکوژە.

دێوەکە گوتی:

ـ شتی وا ڕاست نییە. ئینجا گوتی: ئەم جارە لێدەگەڕێم بڕواتە دەرەوە بۆ ڕاو. کە ڕۆیشت بە دوایدا دەچم. لە جێگایەکی چۆڵ خۆم دەکەم بە پەلە هەورێك و خۆمی بە سەردا بەردەدەمەوە و دەیکوژم.

کچەکە گوتی:

ـ باشە وا بکە.

منداڵەکە دیسان گوێی لێبوو.

ڕۆژی پاشی، سبەینێ زوو برا ویستی بچێتە دەرەوە بۆ ڕاو. منداڵەکە گوتی:

ـ منیش لەگەڵت دێم خاڵۆ.

گوتی:

ـ وەرە.

منداڵەکە لەگەڵ خاڵۆی چوو. منداڵەکە هەر دەڕۆیشت و ئاوڕی دەدایەوە. لە پڕ پەڵە هەورێکی پیس و چڵکنی بینی، بە خاڵۆی گوت:

ـ خاڵۆ شیرەکەتم بدەرێ.

گوتی:

ـ فەرموو، ئەمە شیر. دێوەکە بوو خۆی کردبووە ئەم پەڵە هەورە. کە ویستی خۆی بە سەر کابرادا بەر بداتەوە، منداڵەکە شیرێکی لێداو کردی بە دوولەت. دێوەکە قیڕەیەکی لێ هەستا و تۆپی. کچەکە لە ناو کۆشکەکە گوێی لە قیڕەی دێوەکە بوو، زانی کوشتییان. چێشتی لێنا و ژەهری تێکرد. برا و منداڵەکە لە ڕاو هاتنەوە. دیتیان کچەکە دەگری. منداڵەکە پێی گوت:

ـ هەی بەدفەڕ ئەوە بۆ دەگری؟

مەنجەڵە چێشتەکەی بە سەر سەریدا کرد و شمشێرێکی لێداو سەری پەلدا. منداڵەکە و خاڵۆ دەوری دوو مانگێك لە کۆشکەکە مانەوە. ئەوسا خاڵ بە خوارزای گوت:

هەستە بچینەوە لای باوکم، باپیری خۆتە.

منداڵەکە گوتی:

ـ بە ڕاست؟

گوتی:

- ئەرێ بە خوا.

زێڕێکی زۆریان لە ناو کۆشکەکە بردو ڕۆیشتن. چوونەوە ماڵێ. خاڵۆ دیتی باوکی پیر بووە. هەقایەتەکەی بۆ باوکی گێڕایەوە. باوکی گوتی:

- سوپاس بۆ خوای گەورە بە سەلامەتی هاتنەوە.

لای ئێوە بووین‌و هاتینەوە.

* * *

## ٤٦ـ سێ براو خەزنەی ناو بیر

هەبوو نەبوو...

کابرایەکی بازرگان هەبوو، سێ کوڕی هەبوو. ڕۆژێ، نەخۆش کەوتو ئەمری هەقی بە جێ گەیاند. کوڕەکانی شووشتیانو کفنیان کردو ناشتیانو خێرو خێراتیان بۆ کرد.

کە کابرا مرد، کوڕەکانی کەوتنە سەر ئەو ماڵەی بۆی بە جێ هێشتبوون. بە پای پیلان خەرجیان کردو تەخشانو پەخشانیان کرد تا هیچیان نەما. کەوتنە سەر ساجی عەلی. حەزرەتیان پارووە نانێك بوو. ڕۆژێ، چوونە چۆڵەوانی. بە سەر تەپۆڵکەیەك کەوتن. گەیشتنە لای کونە بیرێك. بیست ساڵ بوو کەس ئاوی لێ هەڵنەهێنجابوو. دیار بوو بیستبوویان ئەو بیرە گەنجینەی تێدایە. لە بەینی خۆیانەوە ڕاوێژیان کرد چۆن بچنەناو بیرەکەو کێ بچێ؟ یەکێ گوتی:

- من شۆڕ دەبمەوە ناوی.

یەکێکی تر گوتی:

- نا من شۆڕ دەبمەوە ناوی.

برا بچووکەکە گوتی:

- با برا گەورەکەمان شۆڕ بێتەوە. پەتێکیان لە دەستی بەستو شۆڕیان کردەوە.

کە شۆڕ بووەوە، دیتی دونیایەکی تاریكو تلی چاوە. هاواری کرد:

- برام، هەڵمکێشنەوە! هەڵمکێشنەوە! کوڕە ئەدی برای ئێوە نیم؟ لە ترسان هەترەشم چوو. ترس!

هەڵیانکێشایەوەو هاتە دەرێ. برای پێی گوت:

. ئەی نەمگوت دەترسی؟

برای ناوەنجی گوتی:

. پەتەکە لە دەستی من ببەستن، من شۆڕ دەبمەوە.

پەتەکەیان لە دەستی بەست و شۆڕ بووەوە. کە گەیشتە نیوەی بیرەکە ئەوەندە تاریك بوو زەندەقی چوو. هاواری کرد:

. برام، ئێوەو خودا هەڵمکێشنەوە! کورە، ترس کوشتمی ترس!

هەڵیانکێشایەوە. برای بچووك گوتی:

- ئەم جارە پەت لە دەستی من ببەستن. ئەگەر هاواریشم کرد، یان ترساشم، گوێم مەدەنێ. تا سێ مانگ لێمگەڕێن. ئەگەر پەتەکە هەژایەوە بزانن هێشتا زیندووم، ئەگەر نەهەژایەوە بزانن مردووم.

کوڕەکە شۆڕ بووەوە خوارێ. لە نیوەی بیرەکە هاواری کرد:

برام دەرمبێنن.

گوێیان بە هاواری نەدا. هەر چەندە هاواری کرد بە قسەیان نەکرد. پەتەکەیان پچڕاند. کوڕەکە بەربووەوە، بە لا دیوارەکانی بیرەکە کەوت تا گەیشتە بنی. تەماشای کرد دەرگایەکی بینی. دەرگاکەی کردەوە. چووە ژوورەوە دیتی دوو کچ دانیشتوون دەڵێی مانگن. سەلامی لێکردن. سەلامیان لێ وەرگرتەوەو پێیان گوت:

. ئەوە تۆ لە کوێ هاتووی؟ بنیادەمی؟ ئەجندەی؟ چی؟!

گوتی:

. بەخوا بنیادەمم. لە هەموو کەسیش جسن ترم!

کوڕێکی قۆز بوو دەتگوت مانگە!! کوڕەکە بازرگان بوو. دوو کچەکە کە چاویان پێکەوت ئەشقی بوون. گوتیان:

. تەگبیر چ بکەین؟ پیاوەکەمان بێتەوە دەترسین بتخوا!!

کوڕەکە گوتی:

. شتەکە لە دەستی ئێوەدایە. من خۆم هیچم لە دەست نایە. دوو برام هەبوون تەفرەیان دام.

پێیان گوت:

- براکانت چیان پێ گوتی؟

گوتی:

- گوتیان ئەو بیرە گەنجینەی تێدایە.

لەو قسانە دابوون، پەڵە هەورێك هات. کچەکان گوتیان:

- ئەوەتا هاتەوە. کچە بچووکەکە هەستا فوویەکی لە کوڕەکە کردو کردی بە دەرزییەك و لە پۆتی خۆیدا. دێوەکە وەکوو هەورەتریشقە هاتە خوارێ. یەکەمجار گوتی:

- بۆنی بنیادەمتان لێ دێ (بۆن دێ؛ بۆنی بێگانان دێ، لە عەرد و بانان دێ!)

پێیان گوت:

- بۆنی بنیادەم لێرە چ دەکا؟ کێ دەگاتە ئێرە؟

گوتی:

- ئێوە بنیادەمێکتان لە لایە.

گوتیان:

- شتی وا چۆن دەبێ؟ بنیادەم چۆن دەگاتە ئەم خوارەوەیە؟ ئێمە حەفت تەبەقە لە بن عەردین. بڕوایان پێ هێناو ئەویش نووست. هەموو جارێ کە مێردەکەیان دەڕۆیشت. کچەکان کوڕەکەیان دەکردەوە بنیادەمو لەگەڵی دادەنیشتن و کە دێوەکە دەهاتەوە، دەیانکردەوە دەرزیو لە پۆتی خۆیان دەدا. ڕۆژێ، دوو کچەکە گوتیان:

- تا کەی ئێمە بەو حاڵەوە بژین؟

بە کوڕەکەیان گوت:

- بۆچی نایکوژی؟

گوتی:

– چۆن بیکوژم؟

گوتیان:

- بە شمشێری خۆی نەبێ ناکوژرێ. ئەویش دەبێ بە یەك زەبر بیکوژی، نەك دوو.

گوتی:
- باشە.
پاش ماوەیەك دیسان دێوەکە هاتەوە، هاواری کرد:
- ئێوە بۆنی بنیادەمتان لێدێ.
گوتیان:
- ئەوە تۆ شێت بووی؟ بنیادەم لێرە چ دەکا؟
دێوەکە نووست. ڕەوشتی وا بوو سێ سەعات دەخەوت و هەڵدەستا. شمشێرەکەیشی لە حەفت پارچە پنیر دەپێچا و لەسەرسەری خۆیەوە بە ساپیتەی وەدەکرد.
دوو کچەکە بە کوڕەکەیان گوت:
- بازدەو شمشێرەکە بێنە خوارەوە. ئەگەر بە بازی یەکەم نەیهێنی، دەبێ بە بازی دووەم هەر بیهێنی، نەوەك بە ئاگا بێ هەمووومان دەکوژێ.
کوڕەکە گوتی:
- باشە.
یەکەم جار بازی هە ڵدا دەستی نەگەیشتە شمشێرەکە. دوو کچەکە گوتیان:
- دەترسین ئەم جارەیش دەستت نەگاتێ!
کچە گەورەکە هەستا کوڕەکەی لەسەر شانی خۆی دانا. کوڕەکە دەستی گەیاندە شمشێرەکەو لە کالان دەریکێشا. شیرەکە جەوهەری دەهێنا و دەبریسکایەوە. زەبرێکی کوشتندەی حەواڵەی دێوەکە کرد. دێوەکە هاواری کردو دەستبەجێ تۆپی. کە تۆپی دوو کچەکە ڕایانکێشا و دەرگایەکیان کردەوەو فڕێیان دایە ناو دەریا. ئەوسا بە شادی و کەیفخۆشی گەڕانەوەو بە ئاسوودەیی و دڵنیایی لەگەڵ کوڕەکە دانیشتن.
ئێستا با بچینەوە لای براکانی کوڕەکە:
براکانی کوڕەکە هەموو ڕۆژێ یەکێ چاودێری دەکردو یەکێ دەردەچوو. ئەوەی چاودێری دەکرد، سەیری پەتەکەی دەکرد بەڵکو بهەژێتەوە. دوو مانگ بەم جۆرە تێپەڕی. بێزار بوون. ویستیان چیدی چاوەڕێی نەکەن و بگەڕێنەوە. بەڵام کوڕە بچووکەکە پێی گوتبوون سێ مانگ چاوەڕێم بکەن.

کوڕە بچووکەکە لە خوارەوە بە دوو کچەکەی گوت:
. دەتانەوێ لێرە بچنە دەرەوە؟
گوتیان:
. ئا.
کوڕەکە چووە ناو بیرەکەو پەتەکەی هەژاندەوە. کە پەتەکە هەژایەوە هاواریان کرد:
. ئەوە برامانە!! برا ماوی؟!!
گوتی:
. بەڵێ.
ئینجا پێی گوتن:
. ئێستا پەتەکە لە شتەکان دەبەستم. ئێوە هەڵیکێشنەوە.
کە پەتەکە هاتە خوارێ، کوڕەکە یەکەم جار دوو کچەکەی لە پەتەکە بەستو هەڵیانکێشایەوە. دوو کچەکە چوونە دەرەوە. ئینجا کوڕەکە کەل و پەلەکانی لە ناو سندووقان کردو لە پەتەکەی گرێ دا. لە سبەینێ تا ئێوارێ هەر کەل و پەلی ماڵی ئەو کۆشکەی لە پەت بەستو هەڵیانکێشایەوە. کە هەموو ماڵ و سامانەکەی ڕەوانەی سەرەوە کرد، خۆی بە تەنیا مایەوە. دوو براکە لە بەینی خۆیانەوە ڕێککەوتن پەتەکە بپچڕێنن و دەست بەسەر ماڵ و سامانەکەدا بگرن و زەماوەند لە گەڵ ژنەکان بکەن. کوڕەکە بانگی براکانی کردو گوتی:
. براکانم، تەنیا من ماوم.
گوتیان:
. پەتەکە بگرە.
هەڵیانکێشایەوە تا گەیشتە نیوەی بیرەکە. پەتەکەیان پچڕاندو کوڕەکە بەربووەوە بنی بیرەکە. کە دەچووە خوارێ بە لادیوارەکانی بیرەکە دەکەوت.
گوتی:
. ئای غەدرێکی چەند خراپیان لێکردم!
دوو براکە دوو کچەکەو کەل و پەلەکانیان بردەوە ماڵێ. دوو کچەکە گوتیان:
. بۆچی واتان لەو برایەتان کرد؟ برای گچکە هەمیشە ئازیزو خۆشەویستە!

ئایا ئەمەیە پاداشتی ماندوو بوونی ئەم دوو مانگ‌و نیوەی. دوو کچەکە فوویان لە کەل‌و پەلەکان کرد هەمووی بوو بە خۆڵەمێش‌و خۆیشیان لەبەر چاو بزر بوون. دوو براکە گوتیان:

. ئاخ! ئەگەر ئەوەمان لەگەڵ برامان نەکردایە، ئەمەمان لێ نەدەقەوما. دوو کچەکە خانوویەکیان بە کرێ گرت‌و لە هیوی کوڕەکە مان. بەڵکو خوا بکا بێتەوە. کوڕەکەیش لەولاوە گەڕایەوە چووە ناو کۆشکە بەتاڵەکە. کۆشکەکە تەنیا یەك دارخورمای تێدا بوو. ئەوەیش بزانین دوو کچەکە بەر لەوەی لە ناو بیرەکە بێنە دەرەوە دە تاڵە قژی خۆیان دایە کوڕەکەو پێیان گوت:

. دەترسین دوو براکەت تەفرەت بدەن‌و تووشی بەڵایەکت بکەن. تۆ ئەم تاڵە قژانە هەڵکڕووزێنە ئێمە دەگەینە لات.

کوڕە تاڵە قژەکانی لە ناو جزدانێکی بچووك ناو هەڵیگرت. کوڕەکە چوو لە ناو کۆشکەکە لە ژوورێك دامەزرا. تەنیا تاڵە قژەکان‌و ئەو شمشێرەی مابوو کە مێردی دوو ژنەکەی پێکوشت. بەناو کۆشکەکەدا گەڕا ویستی دەرگایەك بدۆزێتەوە، هیچ نەبوو. چووە ناو ئەشکەوتێك دەرگایەکی تێدا بوو. دەرگاکەی شکاند. دەریا و ئاسمان دەرکەوتن. دار توویەك لەوێ بوو. چوو لە بن دار توەکە نووست. هێشتا خەوی لێ نەکەوتبوو، لە ناو زنجێکی نزیك گوێی لە جووکە جووکی فەرخەکانی هەڵۆیەك بوو. تومەز فەرخەکانی هەڵوکە، کە تەمەنیان دەبوو بە دوو ساڵ، عەزیایەك فێر ببوو دەهات دەیخواردن. کوڕەکە، کە گوێی لە دەنگی فەرخە هەڵۆکان بوو، هەستا دیتی عەزیایەکە دەیەوێ بیانخوا. شمشێری هەڵکێشا و لە عەزیاکەی داو کردی بە دوو لەت‌و گەڕایەوە لە بن دار توەکە نووست. پاش نەختێ، هەڵۆی داکانە هاتەوە دیتی فەرخەکانی کوڕەکە دەلێسنەوە. وایزانی ئەم پیاوەیە هەموو جارێ فەرخەکانی دەخوا. کەورێکی لە چیا هێنا و ویستی بە کوڕەکەی دابدا و بیکوژێ، بەڵام فەرخەکانی چریکاندیان‌و بە دایکیان گوت:

. نەکەی، لێی نەدەی! ئەمە بوو ئێمەی لە دەست عەزیا نەجات دا.

هەڵوکە، کە دیتی عەزیاکە بۆتە دوو لەت، دڵنیا بوو ئەم پیاوە فەرخەکانی ڕزگار کردووە. کە دیتی پیاوەکە هەتاوی گەیشتێ، چووە سەر سەری‌و باڵەکانی لێك

کردەوەو سێبەری لێکرد بۆ ئەوەی هەتاوی پێنەکەوێ. کە کوڕەکە بە ئاگا هات، هەڵوکە پێی گوت:

. ئەوە تۆ بچووکەکانی منت ڕزگار کرد؟

گوتی:

. بەڵێ.

گوتی:

. بخوازەماڵی دونیایێ. چیت دەوێ دەوێ بڵێ!

کوڕەکە گوتی:

. هیچم ناوێ.

کوڕەکە نزیکەی مانگێك لای هەڵوکە مایەوە. تا بێزار بوو. ئەوسا تاڵە قژێکی هەڵکڕووزاند، کچێکی جوانی لەبەردەم پەیدا بوو! کچەکە پێی گوت:

. فەرموو، چت دەوێ؟ ئەمر کە!

گوتی:

. دەمەوێ بچمەوە سەر ڕووی دونیا.

کچەکە گوتی:

. وەرە.

هەڵیگرت و بردییە لای شای ئەجندان!

کچەکە سەلامی لە شا کرد. شا گوتی:

. فەرموو، چت دەوێ؟

گوتی:

. ئەمە برای منە. دەمەوێ لای خۆت قبووڵی بکەی.

گوتی:

. باشە.

ئینجا بە کچەکەی گوت:

. کێ مێردەکەتی کوشت.

کچەکە گوتی:

. ئەمە شتێ بوو ڕۆیشت و بڕایەوە.

ئەوسا شا پێی گوت:
. کوڕەکە جێ بێڵە. خێرو بەرەکەتە.
کچەکە بزر بوو. کوڕەکە لە ماڵی شای ئەجندان مایەوە، خزمەتی دەکرد.
شا دڵنیا بوو کە ئەم کوڕە کوڕێکی ڕەوشتبەرزە.
گوتی:
. ئەم کوڕە شایەنی ئەوەیە زەماوەند لەگەڵ کچێکی من بکا.
بانگی کوڕەکەی کردو پێی گوت:
. دەمەوێ کچێکی خۆمت بدەمێ!
کوڕەکە ڕازی بوو. کچێکیان لێ مارەکرد. جیازێکی بێ وێنەیان بۆ هێنا. بەم جۆرە کوڕەکە کچی شای ئەجندانی هێناو کەوتە خۆشیو شادی.
ئێستایش با بچینەوە لای براکانی کوڕەکە:
ئەوە بوو دوو ژنەکە فوویان لە کەلو پەلو ماڵی دوو برای کوڕەکە کردو هەمووی بە با چوو. ئەو دوو برایە دەسکورت بوون. نەیان بوو پارووە نانێك بکڕن. یەکێکیان لە کەبابخانەیەك بوو بە شاگردو ئەوەی تریش لە دوکانێکی پاچەفرۆشی بوو بە کرێکار. یەکێ ڕۆژانەی (دە) قڕۆش و ئەوەی تر ڕۆژانەی (دوازدە) قڕۆش بوو. کوڕە بچووکەکەیش نزیکەی پێنج ساڵ لای شای ئەجندان مایەوە. کوڕێكو کچێکی بوو. ماوەیەك پێچوو، کوڕەکە بێزار بوو. غەریبی کەسو کارو ماڵەوەی هەستا. چووە لای مامی، کە شای ئەجندان بوو، گوتی:
. مامە، تکایە غەریبی وڵاتی خۆم دەکەم.
شای ئەجندان گوتی:
. هەقی خۆتە.
بانگی هەڵۆکەی کرد. ئەو هەڵۆیەی کوڕەکە بێچووەکانی نەجاتدا بوو!
هەڵۆکە هات خاکی بەر پێی ماچ کردو گوتی:
. ئەمر کە.
شای ئەجندان گوتی:

. دەمەوێ ئەم کوڕە بە خۆو بە ژن و منداڵو کەلو پەلەکانییەوە ببەیتەوە سەر ڕووی دونیا. چ دەڵێی؟

هەڵۆکە گوتی:

. جەنابی شا، پێم ناکرێ من پیر بووم. لە بەر پیری نەبوایە خۆم حەزم دەکرد بیبەمەوە سەر دونیا چونکە چاکەی لە سەر منە، بێچووەکانی منی لە دەست عەزیا ڕزگار کردووە.

شای ئەجندان گوتی:

. هەردەبێ بیبەیتەوە.

هەڵۆکە گوتی:

. مادام وایە دەبێ. (دە) لاشە گۆشتو (دە) کونداوو (دە)دەسکە سلق بێنی. کە شتەکان ئامادە بوون، شای ئەجندان بە کوڕەکەی گوت:

ـ تا دەگەیتەوە سەر ڕووی دونیا (دە) تەبەقەیە. لە هەر تەبەقەیەك لاشە گۆشتێكو کوندە ئاوێكو دەسکە سلقێکی بدەرێ.

کوڕەکە گوتی:

. باشە.

کوڕەکە ئەم شتانەی لەسەر لا باڵێکی هەڵۆکە داناو خۆیشی لەسەر باڵەکەی تری سوار بوو. هەڵۆکە فڕی. کە گەیشتە یەکەمین تەبەقە، کوڕەکە لاشە گۆشتێكو کوندە ئاوێكو دەستە سلقێکی لە ناو دەمی نا. هەڵۆ بەرز بووەوە. دەگەیشتە هەر تەبەقەیەك کوڕەکە خواردنەکەی لە ناو دەمی دەنا. لە هەر تەبەقەیەك لاشە گۆشتێکی دەدایێ تا گەیشتە سە ڕووی زەوی. لەوێ هەڵۆ بە کوڕەکەی گوت:

. تۆ لێرە بوەستە، دەچم ژنەکەت منداڵەکانو کەلو پەلەکانی تریشت دێنم.

هەڵۆ چوو ژنەکەو منداڵەکانو کەل وپەکانی هێنا. کوڕەکە بە خۆو بە ژنو منداڵەوە سواری ئێسترێك بوونو چوونە ناو شار. کوڕەکە خانوویەکی بە کرێ گرت. بە ڕێکەوت خانووەکە لە تەنیشت ماڵی دوو کچەکە بوو. کە دوو کچەکە زانییان ئەوە کوڕەکەیە هاتۆتەوە، چوون بە خێر هاتنەوەیان کردو پێیان گوت:

. ئەمە بوو کردەوەی براکانت!

کوڕەکە زەماوەندی لەگەڵ هەردووکیان کرد. ڕۆژێ، کوڕەکە چووە کەبابخانە نان بخوا دیتی براکەی لەوێ ئیش دەکا ناسییەوەو گوتی:

. برام، ئێوە بۆچی واتان لێکردم؟

هەستا ماچی کردو برای گوتی:

. غەڵەتێك بوو کردمان!

کوڕەکە برای بردەوە ماڵێ‌و لە ماڵەوە کردی بە خزمەتکار. چوو براکەی تریشی هێنا. پارەو سەرمایەی دایە براکانی بۆ ئەوەی بۆ خۆیان ئیش بکەن‌و ببن بە خاوەن کار. هەموو کەوتنە ژیانێکی شادی‌و خۆشی. ڕۆژێ، کوڕەکەو هەر سێ ژنەکەی دانیشتبوون، یەکێ شتێکی فڕێدایە ناویان. گوتیان:

. ئەمە چییە؟

گوتی:

. پارەیە. شای ئەجندان بە دیاری بۆی نارد بوون. گوتی دەترسم پارەیان نەبێ.

وەریانگرت‌و دانیشتن.

بە شادی‌و بەختەوەری ژیان.

لای ئێوە بووین‌و هاتینەوە.

* * *

## ٤٧ـ کچی دارتاش و کچی شای

هەبوو نەبوو...

پیرەژنێکی دەستکورت هەبوو، لە برسان دەمرد! لە زنجێکدا دەژیا. بە تەشیرێسی بەڕێوە دەچوو. ڕۆژێ، پیرەژن لە دڵی خۆیدا گوتی: با گاڵتەیەك بە کوڕی سوڵتان بکەم! پێی دەڵێم کچێکی جوانم هەیە بۆ نایەی بیخوازی؟

پیرەژن چووە لای کوڕی سوڵتان و پێی گوت:

. بۆ نایەی کچی خۆمت بدەمێ؟!

کوڕی سوڵتان گوتی:

. تۆ کچت هەیە؟

گوتی:

. ئەدی! کچێکی زۆر جوانم هەیە!!

کوڕەکە گوتی:

. قەت وە نەبێ!

پیرەژن گوتی:

. ئەرێ بەخوا.

کوڕەکە گوتی:

. باشە دایکم دەنێرم.

پیرەژن گوتی:

- نا..نا..دایکتی پێ ناوێ. من نامەوێ هیچ کەس کچەکەم ببینێ. بە دەستی خۆم دەیرازێنمەوەو بۆتی دێنم.
کوڕەکە گوتی:
- باشە.
پیرەژن گوتی:
- بێنە پەنجا لیرەم بدەرێ.
کوڕەکە پەنجا لیرەی دایێ. پیرەژن بە پەشۆکاوی گەڕایەوە، نەیدەزانی چ بکا. لە دڵی خۆیدا گوتی: پەیکەری کچێك لە دار بە دروستکردن دەدەمو جلی لەبەر دەکەمو بۆی دەبەم. کە گەیشتمە سەر پردەکە، خۆم بەردەدەمەوەو فڕێی دەدەمە ناو ئاو.
پیرەژن چووە لای دارتاش‌و پێی گوت:
- دارتاش، ها، ئەوە لیرەیەکت بدەمێ پەیکەری کچێکم بۆ لە دار دروست بکە.
دارتاش گوتی:
- باشە.
دارتاش پەیکەرێکی بۆ دروست کرد. پیرەژن پەیکەرە دارەکەی بردەوە ماڵێ. چوو جیازی بووکی کڕی‌و بۆ ماڵی سوڵتانی نارد. سەیری کەل‌و پەلەکانیان کرد هی ئەوە بوو بووك کچی پیاوێکی دەوڵەمەند بێ. ژوورێکیان بۆ تەرخان کردو چوارپایەکیان لێدانا. ڕۆژی پاشی، پیرەژن لە دوای کوڕی سوڵتانی ناردو پێی گوت:
- سەد پیاوو تیپێکی مۆسقام بۆ بنێرێ.
کوڕەکە شتەکانی بۆ پیرەژن نارد. پیرەژن سوار بوو. پەیکەرە دارەکەشی لە سواری ماین لە پشتی خۆی دانا. ڕۆیشتن تا گەیشتنە نیوەی پردەکە. پیرەژن پەیکەرەکەی فڕێدایە ناو ئاوو زریکاندی:
- هاوارە کچەکەمیان فڕێدایە ناو ئاو!!
خەڵکەکە غروویان کەوتێ. یەکێکیان چووە ناو ئاو بۆ ئەوەی کچەکە دەربێنێ. بە ڕێکەوت لەو کاتەدا کچی شای ئەجندان بۆ پسمامی خۆی بە بووك دەچوو. ئەو کابرایەی لە ناو ئاو لە دوای بووکە دارینەکەدا دەگەڕا، دەستی گێڕا دەستی

بە کچی شای ئەجندان کەوت. گرتی و هێنایە دەرەوە. هەر وایانزانی ئەمە بووکی خۆیانە. هەموو هاواری خۆشییان لێ هەستا:

. بووکی سوڵتانیان بە سەلامەتی هێنایە دەرەوە. کە پیرەژن چاوی پێکەوت، هەر تاسا. بانگی کرد:

. کچم! کچم!

کچەکەیان دەرهێنا و تارایان بەسەر داداو گەیاندییانەماڵی سوڵتان و لە ژووری کوڕی سوڵتان دایاننا. عیشا داهات کوڕی سوڵتان چووە پەردەو لەگەڵ بووک نووست. پێی گوت:

. کچی دارتاش!

کە پێی گوت کچی دارتاش، کچەکە لێی تووڕە بوو. چیدی قسەی لەگەڵ نەکرد. کوڕەکە پێنج مانگ لەگەڵ ئەو کچەدا بوو، هەر پێی دەگوت کچی دارتاش! کچەکەیش وەڵامی نەدەدایەوە. کابرا دەیقیڕاند کچی دارتاش! کچەکە وەڵامی نەدەدایەوەو دڵی خۆش نەدەکرد. ڕۆژێ، کوڕەکە بیری کردەوەو گوتی: چ بکەم لەگەڵ ئەم کچە؟ هیچ قسە ناکا! بە دایکی گوت:

. دایکە، دەمەوێ یەکێ لە دۆتمامەکانم بۆ بخوازی.

کوڕەکە سێ دۆتمامی هەبوو.

دایکی چوو خوازبێنی دۆتمامی گەورەی بۆ کردو گواستیانەوەو لە ژوورێك دایاننا و کوڕەکە چووە لای. کچی شای ئەجندان. دەیزانی پیاوەکەی، دۆتمامێکی خۆی هێناوە. بەیانی زوو دۆتمامی کوڕی سوڵتان قەرەواشەکەی خۆی نارد. گوتی:

. بڕۆ بزانە ئەو کچە دارتاشە بەدکارە چ دەکا؟ زۆر ئازاری پسمامی منی داوە.

قەرەواشەکە چوو لەوێ ڕاوەستا. کچی شای ئەجندان قەرەواشی هەوێی خۆی دی، بانگی قەرەواشی خۆی کردو پێی گوت:

. بڕۆ ئەو تەندوورە جۆش دە!

قەرەواشەکە چوو تەندووری داگیرساندو جۆشی دا. کچی شای ئەجندان هەستا مەمکی خۆی لە ناو تەندوور نا، کە دەری هێنا ببوو بە قۆزی. مەمکەکەی تریشی لە ناو نا، ئەویش هەروا. لە ناو تەندوور دەریهێنا و لەگەڵ

قەرەواشـەکەی خواردیـان. کـە لێبوونـەوە، قەرەواشـی دۆتمـامی کـوڕی سـوڵتان چوو چی دی بوو بۆ خانمی گێڕایەوە. خانم گوتی:

. تۆیش هەستە تەندوور جۆش دە.

قەرەواشەکە تەندووری داگیرساندو جۆشی دا. دۆتمامی کوڕی سوڵتان مەمکی خۆی لە ناو تەندوور نا. مەمکی سووتاو مرد. قەرەواشەکە لە زریکژنی داو هاواری کرد:

. ژنی کوڕی سوڵتان مرد.

کەس و کاری هاتن. کفن و دفنیان کرد. کوڕی سوڵتان گوتی:

. ئێستا چ لە کچی دارتاش بکەم؟

بانگی کرد:

. کچی دارتاش.

کچە وەڵامی نەدایەوە. کوڕەکە زۆر پەست و غەمبار بوو. زۆر عادزو خەفەتخان بوو. پاش حەفتەیەك، بە دایکی گوت:

. دایکە، هەستە بڕۆ داخوازی دۆتمامی ناوەنجیم بۆ بکە.

دایکە چوو دۆتمامی ناوەنجی بۆ داخوازی کرد. ئاهەنگی زەماوەندیان گێڕا. بووکیان گواستەوەو هێنایان لە ژووره دایاننا. ئێوارە کوڕەکە چووە کنی. بۆ بەیانی هاتە دەرەوە. ژنی کوڕی سوڵتان قەرەواشەکەی ناردو گوتی:

. بڕۆ بزانە ئەو کچی دارتاشە بەدکارە، کە پسمامی منی ئەزیەت داوەو خوشکی منی کوشتووە، چ دەکا؟

قەرەواشەکە چوو. کچی شای ئەجندان چاوی پێکەوت، بانگی قەرەواشی خۆی کردو گوتی:

. وەرە.

ئینجا هاواری کرد:

. مەسینەو لەگەن زوو وەرن!

مەسینەو لەگەن هاتن بە کچەکەیان گوت:

. شازادەخانم، ئەمر کە!

گوتی:

. بڕۆ خۆتان پڕ کەن لە ئاوی ڕووبارو وەرنەوە.
مەسینەو لەگەن بە غار ڕۆیشتن بۆ ئەوەی خۆیان پڕ ئاو بکەن لە نیوەی ڕێگادا لێیان بوو بە دەمەقاڵێ. لەگەن بە گریان هاتەوە. کچەکە پێی گوت:
. ئەوە چیتە؟ بۆ دەگری؟
گوتی:
. مەسینە لێیدام.
مەسینە بەرپەرچی دایەوە، گوتی:
. بەخوا من لێم نەداوە.
کچەکە فووی لێکردن‌و هەردووکی کردن بە خۆڵەمێش‌و بە قەرەواشەکەی گوت:
. ها ئەم کودوو و چەقۆیە بگرە فڕێیاندا ناو بیرو دەریان بێنەوەو کوودووەکە پاك کەوە. قەرەواشەکە هەموو ئیشەکە ی کرد. قەرەواشی ژنی کوڕی سوڵتانیش وا تەماشا دەکا. قەرەواشەکە ئەمەی دی‌و گەڕایەوە. ژنی کوڕی سوڵتان پێی گوت:
. ها، چت دی؟ ئەم سەرەسۆدرەیە چی کرد؟
قەرەواشەکە گوتی:
– ئەوها و ئەوهای کرد.
ژنی کوڕی سوڵتان گوتی:
. تۆیش بڕۆ کودوویەك بێنە.
بووك دەستی بە پاك کردنەوەی کودووەکە کرد. دوای نەختێ، کەوتە ناو بیرەکەو مرد.
قەرەواشەکە لە زریکژنی داو هاواری کرد:
. بووك کەوتە ناو بیر!
گوتیان:
. بۆچی کەوتە ناو بیر؟ کێ فڕێیدایە ناوی؟
گوتی:
ـ لاسای کچی دارتاشی کردەوەو بەربووەوە ناو بیرەکە. کوڕەکە هاتەوە. مەسەلەکەیان بۆ گێڕایەوە. گوتی:

- خوایە کەی لە دەست کچی دارتاش نەجاتم دەبێ؟
کچەکە نە قسەیەکی دەکردو نە دڵی خۆش دەکرد. کوڕەکە بە عادزو دڵتەنگی نووست.
ساڵێك بەم جۆرە ڕابرد. کوڕەکە چووە لای دایکی و پێی گوت:
- دایکە، بۆم بڕۆ هەجبینی دۆتمامی بچووکم.
دایکی گوتی:
- باشە.
دایکی چوو کچە بچووکەکەی بۆ کوڕەکەی خواست. جیازو پێویستی زەماوەندیان ڕێکخست و بووکیان گواستەوە ماڵی سوڵتان. بووکیان لە ژوورێك داناو کوڕی سوڵتان چووە لای. بەیانی کوڕی سوڵتان چووە دەرەوە. ژنەکەی بە قەرەواشەکەی گوت:
بڕۆ لای ئەو بەدکارە. زۆر ئازاری پسمامەکەی داوم، دوو خوشکیشی کوشتووم، سەیر کە بزانە چ دەکا؟
قەرەواشەکە چووە لای کچی شای ئەجندان. کە کچی شای ئەجندان ئەو قەرەواشەی دی، بە قەرەواشەکەی خۆی گوت:
- زەعفەرانە؟!
گوتی:
- بەڵێ.
گوتی:
- هەستە ئەم مافوورە ببە سەر ئەو دارگێوژەو مەکینەی لەسەر دانێ بۆ ئەوەی بچمە سەرێ و نەخشەکانی تێدا بکەم. قەرەواشەکە هەستا مافووری بردە سەر دارگێوژەکەو مەکینەی لەسەر دانا. کچەکە سەرکەوتە سەر دارەکەو دەستی بە نەخش و دوورمان کرد. قەرەواشی دۆتمامی کوڕی پاشا ئەمەی دی و چوو بە خانمی گوت:
- ئەوە ئەم ژنە بەدکارە چییە؟
گوتی:
- چۆن؟

گوتی:

- بانگی قەرەواشەکەی خۆی کردو گوتی: زەعفەرانە، هەستە مافوور ببە لە سەر دار گێوژی دانیٚ و مەکینەی لەسەردانیٚ بۆ ئەوەی نەخشەکاری بکەم.

قەرەواشەکە مافوورو مەکینەی بە سەر خستو کچەکە دەستی بە نەخشەکاری کرد. کە ژنی کوڕی سوڵتان ئەمەی بیست، گوتی:

- تۆش بڕۆ مەکینەو مافوور ببە سەر ئەم دارگێوژە.

قەرەواشەکە بردی و ژنی کوڕی سوڵتان چووە سەر دار گێوژەکەو بەربووەو ئەسکوردی شکا. قەرەواشەکە لە زیرکژنی داو کردی بە هاتو هاوار!

کەس و کاری سوڵتان هاتن سەیریان کرد ژنەکە مردووە. گوتیان:

- ئەوە چ بوو؟ بۆچی چووە سەر ئەو دارە؟

قەرەواشەکەی گوتی:

- زانی کچی دارتاش وا دەکا ئەویش ویستی لاسای بکاتەوە. خوایە، کیٚ لە دەست کچی دارتاش نەجاتمان دەدا؟! ژنی کوڕی سوڵتانیان شووشتو کفنیان کردو ناشتیان و پرسەیان بۆ داناو خەتمیان بۆ کرد. پرسە حەفت ڕۆژ بەردەوام بوو. کوڕی سوڵتان هاتەوە گوتی:

- کچی دارتاش، چیت لێبکەم؟ بە هیلاکت دام! دە قسە بکە!

کچەکە هیچ وەڵامی نەدایەوە.

کوڕەکە گوتی:

- وەختە لەو بێدەنگییەی تۆ شەق بەرم. بەس نییە؟!

کچەکە بە سەر ئاماژەی بۆ کرد. کوڕی سوڵتان لە داخان لە پرمەی گریانی داو چووە دەرەوە بۆ قاوەخانە. برادەرەکانی دیتیان کزو عاجزە. گوتیان:

- ئەوە چ خێرتە؟ بە هەموو دەمیٚ کزو پەستو غەمباری؟

گوتی:

- ژنێکم هەیە کچە دارتاشە. زۆر ئەزیەتم دەدا. سیٚ دۆتمام هەبوو. هەرسێکی کوشتن. قسەم لەگەڵ ناکا! دڵم خۆش بکا، ناتوانم بەرگەی بگرم.

گوتیان:

ـ دەترسین ئەمە کچە دارتاش نەبێ. کچە ئەجندە بێ! کە بانگی دەکەی کچی دارتاش، لێت تووڕە دەبێ. شتێکی وا بکە بیناسی و بزانی کێیە؟

گوتی:

ـ چۆن؟

گوتیان:

بڕۆ لایەوە پێی بڵێ: کچە ئەجندە، دەمەوێ زیافەتێکم بۆ بکەی بایی سێ سەد کەس بکا. ئەوسا قسەت لەگەڵ دەکا. ئەگەر قسەی لەگەڵ کردی ئەوە کچە جنۆکەیەو ئەگەر قسەی لەگەڵ نەکردی، دیارە ڕەسەن نییە. شمشێرێکی لێ دەو بیکوژە.

کوڕی سوڵتان گەڕایەوە ماڵێ. ڕووی کردە کچەکەو گوتی:

ـ چاوی چاوم.، دۆتمامی ئازیزم، ئەمڕۆ سێ سەد سوار بە ئەسپەوە میوانی منن بۆ نان خواردن دەبێ تۆ خواردنیان بۆ بکەی.

کە ئەم داوایەی لێکرد، کچەکە بە دەنگ هات و گوتی:

ـ باشە.

کوڕەکە گوتی:

ـ ئۆخەی خۆ قسەت لەگەڵ کردم!!

کچەکە گوتی:

ـ بڕۆ دەرەوە!

کوڕەکە گوتی:

ـ باشە.

کوڕەکە چووە دەرەوەو خۆی لە جێگایەکی وا شاردەوە کە کچەکەی لێ دیار بێ.

کچەکە هاواری کرد:

هۆ مەسینە هۆ لەگەن!

مەسینەو لەگەن هاتن. گوتیان:

ـ شازادە خانم، ئەمر کە.

گوتی:

ـ بڕۆن خۆتان لە ئاوی ڕووبار پڕکەن و وەرنەوە.

مەسینەو لەگەن فەرمانەکەیان جێبەجیٚ کرد. بەلاّم لە نیوەی ڕیٚگادا مەسینە لەگەلٚ لەگەن بە دەمەقالٚ هاتو شکاندی. لەگەن بە گریان گەڕایەوەو گوتی:

. مەسینە لیٚیدام!

مەسینە گوتی:

. خانم، درۆ دەکا.

لەگەن گوتی:

- خانم، سویٚندم بە شا قەمەری باوکتو شا بانوو ستیٚری دایکت، مەسینە لیٚیدام.

کوڕی سولٚتان گویٚی لەم قسانە بوو. هات گوتی:

. کەواتە تۆ کچی شای ئەجندانیو من بانگت دەکەم: کچی دارتاش!

هەستا باوەشی پیٚداکردو ماچی کرد.

کچەکە گوتی:

ئیٚستا باوکم بە دوامدا دەگەڕیٚ. ئەم پیرەژنە ڕمووزنە درۆی لەگەلٚ کردی. کچیٚکی بۆ لە دار دروست کردبوویو فرێیدایە ناو ئاوو منیان لە باتی ئەو لە ناو ئاو دەرهیٚنا. ویستم چۆن دۆتمامەکانم کوشتی، ئەوها تۆش بکوژم. بەلاّم بەزەییم پیٚتدا هاتەوە. ئیٚستایش لە کویٚ یەکترمان دی، لەویٚ لە یەك جیا دەبینەوە. خوا حافیز!

کچەکە بزر بوو.

لای ئیٚوە بووینو هاتینەوە.

* * *

## ٤٨ـ بەختی سێ خوشکی هەژار

هەبوو نەبوو...

ئافرەتێك هەبوو، سێ کچی هەژارو نەداری هەبوو. دایکە بە تەشیرێسی بە خێوی دەکردن. کچەکان تەوەزەل‌و ئیشنەکەر بوون. ڕۆژێ، دایکیان پێی گوتن:

ـ خۆ ئێوە منتان بە هیلاك دا!! دەبێ هەرچۆن بێ خۆم لە دەست ئێوە ڕزگار بکەم. سەر هەڵدەگرم‌و ڕادەکەم.

بە کچە گەورەکەی گوت:

ـ تۆ بەختت لە ناو بیردایە!

بە کچی ناوەنجی گوت:

تۆ بەختت لە زەماوەنددایە!

بەکچە بچووکەکەیشی گوت:

تۆ بەختت لە پرسەو ماتەمدایە.

دوای دوو ڕۆژ، پیرەژن سەری هەڵگرت‌و ڕایکرد بۆ شارێکی تر. لەوێ بوو بە کارەکەری ماڵی سوڵتان. کچەکان مانەوە، دانیشتن‌و ڕاوێژیان کرد. گوتیان:

ـ بۆچی ئاوا دەستەوەستان دابنیشین؟ با خوری بێنین‌و بیرێسین‌و پێی بژین!

کچە گەورەکە بە دوو خوشکەکەی تری گوت:

ـ من دەچم بە دوای بەختی خۆمدا دەگەڕێم.

عەبای لە خۆی داو ڕۆیشت. گەیشتە بیرێك لە سەری نووسرابوو: ئەمە بەختی کچە گەورەی فلانە ژنە. کچەکە جلی داکەندو لەسەر سەری خۆی بەست‌و خۆی

هەڵدایە ناو بیرەکە. لە تاریکی دەستی کوتا دەرگایەکی دیتەوەو کردییەوە. کۆشکێك بوو کەسی تێدا نەبوو. هەندێ مەنجەڵی دی خواردنیان تێدابوو. هەندێ قاپ‌و قاچاغیش ئامادە کرابوون. چووە ژوورەوە بەڵکو یەکێ ببینێ، کەسی نەدی. نانی خواردو ئاوی خواردەوە. هەستا جل‌و پەشتەماڵەکانی شووشت‌و ماڵی جوان جوان پاك کردەوە. کووپەی ئاوی شووشت‌و پڕ ئاوی کرد. بەرەبەری ڕۆژئاوا، ترسا نەوەك یەکێ بێ خۆی لە ناو تەندوور شاردەوە.

دوای نەختێ چل پەڵە هەور(چل دێو) هاتن‌و دابەزین. گوتیان:

- بۆنی بنیادەم دێ. (بۆن دێ، بۆنی بێگانان دێ، لە عەردو بانان دێ!)

کە دێوەکان هاتنە ژوورەوە، کچەکە چاوی پێکەوتن زۆر ترسا. دێوەکان دیتیان ماڵ پاك کراوەتەوەو قاپ‌و قاچاغ‌و جل‌و بەرگ‌و پەشتەماڵ هەمووی شووراون. گوتیان:

- کێ ئەم ئیشانەی کردووە؟ ببینین خەڵاتی دەکەین!

سبەینەی پاشی، دێوەکان لە شەقەی باڵیان داو فڕین بۆ ئەوەی بنیادەم ڕاو بکەن‌و بیخۆن. کچەکە لە ناو تەندوور هاتە دەرەوە. ماڵی پاك کردەوەو چێشتی لێنا و جل‌و هیرباری شووشت‌و نانی خواردو دووبارە چوو خۆی لە ناو تەندوور شاردەوە. بەرەبەری ڕۆژئاوا دێوەکان هاتنەوە. بۆنی بنیادەمیان کرد دیتییان ماڵ پاك‌و خاوێنەو جل‌و بزگوڕ شووشتراون. سەریان سووڕما و گوتیان:

- بە ڕاستی ئەمە شتێکی چاکە!

دێوەکان بانگیان کرد:

- ئەی ئەو کەسەی ئەم ئیشانەت کردووەو خۆت شاردۆتەوە، وەرە دەرەوە! مەترسە! پەیمان بێ ئەزیەتت نادەین.

کچەکە ترسا بێتە دەرەوە. سێ جار بانگیان کرد. کچەکە هەر وەڵامی نەدایەوە. دێوەکان ڕۆیشتن‌و کچەکە هاتە دەرەوە. ئیشەکانی کرد. بەرەبەری ڕۆژئاوا دیسان چوو خۆی لە ناو تەندوور شاردەوە. دێوەکان هاتنەوە. ڕۆژی پێشوو چییان دی بووو ئەمڕۆیش هەمان شتیان بینی. بانگیان کرد:

- ئەی ئەو کەسەی ئەم ئیشانەت کردووەو خۆت شاردۆتەوە، وەرە دەرەوە. ئەمین‌و ئەمانی!
کچەکە هاتە دەرەوەو باوەشی پێداکردن‌و ماچی کردن دیتیان کچە. پێیان گوت:
- ئەوە لە کوێ هاتی؟ بۆچی هاتی؟
گوتی:
- خوا منی هێنا.
گوتیان: با لای خۆمان بێ خزمەتمان بکا. وەکوو خوشکمان ماڵمان بۆ پاك بکاتەوەو ئیشمان بۆ بکا.
بەم جۆرە کچەکە بوو بە کارەکەر. هەموو خۆشیان دەویست. ساڵێك لایان مایەوە. خزمەتی دەکردن. چێشتی بۆ لێ دەنان و نانی بۆ دەپێژتن. ڕۆژێ، برا گەورەیان گوتی:
- ئەم ژنە لای ئێمە نا مەحرەمە. با یەکێکمان مارەی بکەین‌و بیهێنین.
براکان گوتیان:
- تۆ برا گەورەی ئێمەی. تۆ بیهێنە. گوتی:
باشە.
کچەکەیان لێ مارەکردو ئێواری چووە لای. کچەکە زۆر شادو کەیفخۆش بوو. حاڵ‌و گوزەرانی زۆر باش بوو.
ئێستا دەچینەوە لای دوو خوشکەکەی تر:
ئەو دوو خوشکە کە دیتیان خوشکی گەورەیان ڕۆیشت‌و نەهاتەوە، خوشکی ناوەنجی، گوتی:
- منیش تەبای خوشکم دەچم بە دوای بەختی خۆمدا دەگەڕێم.
عەبای بە سەر سەری داداو بۆی دەرچوو. مایەوە کچە بچووکەکە. ئەویش بۆ خۆی بە تەشیڕێسی دەژیا. خوشکی ناوەنجی کە چووە دەرەوە. دیتی لە ماڵێك زەماوەندە، پێی گوتن:
- ئەمە چییە؟ ئەمە زەماوەندی کێیە؟
گوتیان:

ـ زەماوەندی کوڕی سوڵتانە.

کچەکە چووە ژوورەوە. پێیان گوت:

ـ چت دەوێ؟ بۆچی هاتووی؟

گوتی:

ـ هاتووم لە چێشت لێنان یارمەتیتان بدەم.

گوتیان:

ـ بە خێر بێی، فەرموو وەرە ژوورەوە!

کچەکە دەستی بە چێشت لێنان و هیربار شووشتن کرد. کچێکی ئەوەندە جوان بوو دەتگوت مانگە. کاتێ بەرەبەری ڕۆژئاوا بووکیان بە گالیسکە هێنا بۆ ماڵی کوڕەکە، کچەکە هەستا بووکی لە گالیسکە دابەزاند، بردییە سەلال و لەسەر تەخت داینا. شەو، کوڕی سوڵتان چووە پەردە. ماڵی سوڵتان حاڵیان وا بوو هەرجارەی کوڕێکیان ژنی بهێنایە، دێوێك دەهات، کوڕەکەی دەبرد و دەیخوارد. ئەمجارەیش کوڕەکە، کە چووە پەردە بۆ لای بووك، دێوەکە پڕی پێداکرد و ڕفاندی. کوڕەکە هاواری کرد. کەس و کاری زانییان چ قەوماوە. هەر ڕایانکرد بۆ لای بووك دیتیان کوڕەکە نەماوە و بووك بە تەنیایە. دەستیان بە شین و شەپۆڕ و گریان کرد. بووکیان ڕەوانەی ماڵی باوکی کردەوە. کچەکە لە تەنیشت ژووری بووك نووستبوو. کونە ئەشکەوتێك لەو نزیکانە هەبوو. نیوە شەو، کچەکە گوێی لە ناڵە ناڵێك بوو. چووە ناو کونە ئەشکەوتەکە دیتی دەڵە دێوەکە کوڕەکەی گرتووە و لێیدەدا دەیەوێ بیکوژێ و بیخوا. کچەکە بەو نیوەشەوە لە زیرکژنی داو گوتی:

ـ هۆ خەڵك و عالەمینە! هۆ باوکی زاوا! لە خەو ڕابن. کوڕەکەتانم دۆزییەوە.

هاتن گوتیان:

ـ کوا کوڕەکەمان؟

گوتی:

ـ لەو کونە ئەشکەوتەیە. لای دەڵە دێوەکەیە لێی دەدا. کوڕەکە برایەکی هەبوو لە خۆی گچکە تر بوو. برای دەستی دایە شمشێرو لە دێوەکە بە ژووریێ کەوت. دیتی لە کوڕەکە دەداو دەیەوێ بیکوژێ. شمشێرێکی لە دەڵە دێوەکەداو کردی

بە دوو لەت. برای بە شەکەتی و پرزە لێبڕاوی هاتە دەرەوە. شۆرباو چەلاوێکی سووکیان بۆ لێنا. دوای (دە) ڕۆژ کوڕەکە چاك بووەوە.

باوکی پرسی:

- کێ کوڕەکەی نیشانداون و گوتی: بردوویەتییە فلانە جێ؟

گوتیان:

- ئەم کچە بوو.

باوکی گوتی:

- لە کوڕەکەمی مارە کەن.

دایکی کوڕەکە گوتی:

- ئەرێ بە خوا، ئەمە کچێکی چاکە. بانگی مەلاو کوێخوایان کردو کچەکەیان لە کوڕی سولتان مارەکرد. سولتان جیازو کەل و پەلێکی نایابی بۆ کڕین و ئاهەنگێکی بە تەنتەنەی بۆ سازدان. کچەکەیان بردە ژووری خۆی. شەوی هەینی کوڕە چووە پەردە بۆ لای کچەکە. کچەکە کوڕەکەی زۆر خۆش دەویست. زیافەتێکی خۆشیان بەم بۆنەیەوە کردو هەموو بە خۆشی و شادی ژیان.

ئێستاش با بچینەوە لای خوشکە بچووکەکە:

خوشکە بچووکەکە خوری کڕی و دەستی بە خوری ڕستن کرد. بە تەشیڕێسی دەژیا. ڕۆژێ، لە دڵی خۆیدا گوتی: هەردوو خوشکم چوون و هیچ کامیان نەهاتنەوە. با منیش بچم بە دوای بەختی خۆمدا بگەڕێم. هەستا جلی کردە بەرو عەبای لە خۆی داو پێلاوو گۆرەوی لە پێ کرد. خانووەکەی فرۆشت و پارەکەی وەرگرت و بۆی دەرچوو. ڕۆیشت ڕۆیشت تا گەیشتە ماڵێك. شین و گریان و ماتەم بوو. چووە ژوورەوە وەکوو ئەوان دەستی بە گریان کرد. شەو پێی گوتن:

- لێمگەڕێن ئەمشەو لای ئێوە بخەوم.

گوتیان:

- کەیفی خۆتە.

کچەکە شەو لەوێ مایەوە. لە ماڵەکەی پرسی ئەوە کێتان مردووە بۆی دەگرین؟

گوتیان:

- هەر لێی گەڕێ!... هەر کوڕێکی دەمانبێ کە تەمەنی دەگاتە (دە) سالْ بێ سەرو شوێن دەبێ. کەس نازانێ چی لێ دێ؟ ئێستایش کوڕێکمان هەیە. تەمەنی بۆ (دە)سالْ دەچێ. دەزانین ماوەی بزر بوونی نزیك بۆتەوە، جا پێش ئەوەی بیبەن پرسەی بۆ دادەنێین.

کچەکە پرسی:

. کەی ماوەی بزر بوونیەتی؟

گوتیان:

. پاش دوو ڕۆژی تر.

لە وادەی خۆی نیوەشەو هەموو خەوتبوون. تەنیا کچەکە نەبێ. دیتی سێ دەلْە دێو هاتن. کوڕەکەیان ڕفاندو بۆی دەرچوون. کچەکە بە دوایاندا چوو. گەیشتنە ناوەندی باخ کوڕەکەیان زنجیر کردو لە دارخورمایەکیان بەستەوەو پێیان گوت:

. ئێستا دەچینە ڕاو، کە هاتینەوە دەتخۆین.

دەلْە دێوەکان ڕۆیشتن. کچەکە بە هەلەداوان گەڕایەوەو بە کەس و کاری کوڕەکەی گوت:

. خەلْقینۆ، من دەزانم کوڕەکەتان لە کوێیە! وەرن بچین نیشانتان بدەم.

چوونە ناو باخ دیتیان کوڕەکەیان بەسراوەتەوە. کردیانەوەو هێنایانەوە. کچەکە گوتی:

- دەترسم بەیانی دووبارە بێنەوە سەری. شمشێرێکم بدەنێ و ئێوە خۆتان بشارنەوە بەلْکو بتوانم شتێکی وا بکەم کوڕەکە بە یەکجاری نەجات بدەم.

گوتیان:

. باشە.

دوای نیو سەعات دەلْە دێوەکان هاتنەوە. واقیان وڕما کە دیتیان کوڕەکە نەماوە. کچەکە خۆی شاردبووەوە. گوتیان:

- شێو دەخۆین و دەخەوین، پاشان بە دوای کوڕەکەدا دەگەڕێین. شێویان خواردو نووستن. کچەکە چوو لە خەودا سەری بڕین و گەڕایەوە مالْێ. کوڕەکە بۆی دەرکەوت ئەم کچە کچێکی ئازاو بەوەفایە. باوکی کوڕەکە گوتی:

. ئەم کچە بۆ کوڕی خۆم دێنم.

مەلایان بانگ کردو کچەکەیان لە کوڕەکە مارەکرد. سولْتان جیازو پێویستی نایابی بۆ کڕین و ئاهەنگی زەماوەندی بۆ کردن و زیافەتێکی گەورەی کردو خەڵکێکی زۆری بانگێشت کرد.

بابچینەوە لای دایکی سێ کچەکە:

. دایکە چوو بوو بە کارەکەری ماڵی سوڵتان. ڕۆژێ، ناخۆشییان لێ پەیدا بوو، دەریانکرد. دایکە گوتی:

. با بچمەوە لای کچەکانم بزانم چیان بە سەر هاتووە.

چوو دیتی خانووەکە فرۆشراوە. پرسیاری کچەکانی کرد، گوتیان:

. هیچیان دەرهەق نازانین. یەك لە دوای یەك ڕۆیشتن و نەهاتنەوە.

ژنەکە بڕیاری دا بە کارەکەری لە ماڵێك دابمەزرێ. بە ڕێکەوت چوو بوو بە کارەکەری ماڵی کچە بچووکەکەی خۆی. ئەوەی بەختی لە پرسەو ماتەمدا بوو. کچەکە کاتێ چاوی بە دایکی کەوت، شاگەشکە بوو. لە حاڵ و گوزەرانی پرسی و لە لای خۆی هێشتییەوە. دایکە لای کچەکەی مایەوەو بە شادی و بەختەوەری ژیان.

لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

★ ★ ★

## ٤٩ـ برای بێوەفاو برای لێبووردە

هەبوو نەبوو...

دوو برا هەبوون، یەکێکیان دەوڵەمەندو ئەوەی تر دەستکورت بوو. ڕۆژێ، برا هەژارەکە بە برا دەوڵەمەندەکەی گوت:

- برام، دوو سەد لیرەم نادەیتێ مامەڵەی پێ بکەم؟ بەڵکو خوا بەرەکەتی باوێتێ.

برای گوتی:

- باشە.

دوو هەزار لیرەی دایێو پێی گوت:

- لە باتی دوو سەد لیرە، ها، ئەمە دوو هەزار لیرە.

برای هەژار پارەکەی وەرگرتو بە مافووری داو بردی بۆ هیند. لەوێ دوکانێکی کڕیو پارەکەی خستە مامەڵەو دەستی بە کڕینو فرۆشتن کرد. دوو هەزار لیرەی قازانج کرد. پاش ماوەیەک چوار هەزار لیرەی پەیدا کرد. ڕۆژێ، بە پیاسە چووە جندەخانە. کە چووە ژوورەوە دیتی هەمووی پارچە کارتۆنە. هەر یەکە وێنەی ژنێکی لە سەرەو نرخێکی تایبەتی لەسەر نووسراوە: (دە) ڕووپیە، (بیست) ڕووپیە، (سی) ڕووپیە، (چل) ڕووپیە. چووە لای ئەو ژنەی بە (چل) ڕووپیە بوو. چووە ژوورەوە دیتی ژنێك دانیشتووە. ژنەکە لەبەری هەستا. ئەو شەوە تا سبەینێ لای ژنەکە مایەوە. چەند ڕۆژێك هاتوچۆی ئەو ژنەی کرد. تا پارەکەی هەموو تەواو بوو. قەت هیچی نەما. لە خۆی قەرنتەو هەژار تر نەبوو. سواری کەشتی بوو گەڕایەوەماڵێ بۆ لای برایو پێی گوت:

- برام، زانییان من غەریب و لاییدەم چی پارەم پێبوو هەموویان لێبەردامەوە. ئێستا باشم ناسین. دەبێ ئەم جارەیش هەندێ پارەم بدەیتێ بەڵکو خوا دەرووپەکم لێ بکاتەوە. برای هەندێ پارەی دایێ. پارەکەی وەرگرت و بە خێرایی گەڕایەوە. تامەزرۆ بوو بگاتەوە لای ژنەکە و لەگەڵی ڕابوێرێ. چووە لای ژنەکە. ژنەکە پێی گوت:

- چۆنی؟ ئەوە لە کوێ بووی؟ دوو مانگە دیار نی.

کابرا گوتی:

- ئیشم هەبوو.

نزیکەی دوو مانگ لای ژنەکە مایەوە. دیسان پارەو پوولەکەی تەواو بوو. وای لێهات شێوی شەوی نەبوو. بە ژنەکەی گوت:

- چار چییە؟ لە ماڵەوە هاتووم و هەموو پارەو پوولم تەواو بووە. ئێستا هیچم نەماوە. دەمەوێ تۆ بە نۆکەری خۆت قبوولم بکەی.

ژنەکە گوتی:

- زۆر باشە.

نزیکەی ساڵێك لای ژنەکە مایەوە. برا دەوڵەمەندەکەی خۆشی دەویست، بە دایکی گوت:

- دایکە، برام چوو و نەهاتەوە. دەچم سۆراغێکی دەکەم.

دایکی گوتی:

- چاك دەکەی برۆ سۆراغێکی بکە بزانە چی بەسەرهات.

کابرا ڕۆیشت. سواری کەشتی بوو کەوتە ناو دەریا. مانگێکی پێچوو تا گەیشتە هیند. لەوێ ناسییان و گوتیان:

- ئەوە چۆنە هاتووی؟

گوتی:

- ئیشم هەیە.

چوو ئەوەندە لە برای گەڕا، نەیدۆزییەوە. گوتی: بە ڕاستی سەیرە! ئەدی برام چۆتە کوێ؟ لە کابرایەکی نەناسیاری پرسی:

- ئەرێ فلانی کوڕی فلان ناناسی؟

گوتی:

. ئەمە نۆکەری سەرۆکی جندەو حەشەرییانە!

کابرا، کە ئەم خەبەرەی بیست، لە داخان پەنجەی خۆی گەستو گوتی: ئێستا دەبێ شوێنەکەی لە کوێ بێ؟

گوتی:

. ئەم ڕێگایە بگرەو برۆ. دەگەیتە شوێنەکەی!

ملی ڕێی گرتو ڕۆیشت. چوو شوێنەکەی دۆزییەوە لەسەری نووسرا بوو: ئەمە کۆلآنی جندەو حەشەرییانە. چووە ژوورەوە سەیری وێنەکانی کرد. چووە لای ئەوەی بە (چل)ڕووپیە بوو. (چل) ڕووپیەی دایێ بەڵام هیچی لەگەڵ نەکرد. تا سبەینێ نووست. سبەینێ هەستا چووە دەرەوە دیتی برای نۆکەری ئەم ژنە سۆزانییەیە. زۆر دەهری بوو! چونکە براکەی خۆی زۆر خۆش دەویست. (دە) ڕۆژ هاتوچۆی ئەو ژنەی کرد. هەموو ڕۆژی (چل) ڕووپیەی دەدا هەقی ڕابواردنو ڕاشینەدەبوارد. ڕۆژی دەیەم، نووستبوو ژنەکە چووە لایو گوتی:

. دە هەستە نەختە ڕابوێرین.

ژنەکە هێشتا هەر کچ بوو. دیار بوو حەزی لە کابرا کردبوو. ڕاستی ئەو ژنە فێڵیکی کرد بوو. پارچە لاستیکێکی هێنا بوو شتێکی وەکوو عەورەتی ژنانی لێ دەرهێنا بوو. لە سەر بەرزەهاری، لە بەینی ڕانەکانی خۆی بەستبوو.

ڕۆژێ، کابرا چووە لای ژنەکەو (چل)ڕووپیەی دایێو لێی نووست. ژنەکە لێی قیت بووەوەو گوتی:

. ئەمە چییە؟ تۆ تەنیا بۆ نووستن دێیتە لای من؟!

گوتی:

. نا!

ژنەکە گوتی:

. ئەدی ئەمە چییە؟

کابرا گوتی:

. نازانم.

ژنەکە گوتی:

ـ ئێرە جندەخانەیە. جێی کردنو ڕابواردنە. ئەگەر هیچ ناکەیو ڕانابوێری، لەمەودوا مەیێ!

ژنەکە حەزی لە کابرا دەکردو دەیەویست مێردی پێ بکا. پێی گوت:

ـ دەمەوێ شووت پێبکەم.

کابرا گوتی:

ـ تۆ جندەو سۆزانی! چۆن من دەتهێنم؟ تۆ چوویتە باوەشی هەزار پیاو!

ژنەکە گوتی:

ـ نا وا نییە: من هێشتا کچی سەر مۆرم.

ئەوسا لاستیکەکەی سەر بەرزەهاری نیشان داو باسی فێڵەکەی خۆی بۆ کرد.

دەرچوو هێشتا هەر کچە. ماشاڵڵا گەورەیی هەر بۆ خوای باشە!!

ژنەکە پێی گوت:

ـ ئەم پارەو پوولە هەمووی بۆ خۆت، بەلام دەبێ بمهێنی!

کابرا گوتی:

ـ باشە!

ئینجا لێی پرسی:

ـ ئەدی کوا برام؟

ژنەکە گوتی:

ـ برای چی؟ برات لێرە چ دەکا؟

کابرا گوتی:

ـ با، برام نۆکەری تۆیە.

ژنەکە بانگی کرد:

ـ فلان! هۆ فلان!

نۆکەرەکەی هات. ژنە بە کابرای گوت:

ـ ئەمە دەڵێی؟

کابرا گوتی:

ـ بەڵێ خۆیەتی.

ئینجا کابرا بە برای گوت:

. کورە، تۆ بۆچی وات لە خۆت کرد؟
(دە) لیرەی دایە برایو گوتی:
. برۆ بۆ خۆت بە جلو بەرگی بدە.
برای دەستە بەرگێکی کڕیو چووە حەمام خۆی جوان شووشت. کابرا بە ژنەکەی گوت:
. هەستە بچینە ولاتی ئێمە!
ژنەکە کەلو پەلی خۆی پێچایەوەو چی موڵکی هەبوو هەمووی فرۆشت. سواری کەشتی بوونو بە ڕێ کەوتن. رۆیشتن گەیشتنە ناوەڕاستی دەریا. برای هەژار لە دڵی خۆیدا گوتی: برام چییە ئەو هەموو ماڵەی هەیە؟ فڕێی دەدەمە ناو دەریاو ژنەکەی بۆ خۆم دێنمو پارەکەشی دەخۆم! نیوەشەو، برای گرتو فڕێدایە ناو دەریا. چووە لای براژنیو گوتی:
. تازە من بووم بە مێردی تۆ.
ژنەکە دەری کرد، گوتی:
. برۆ لێرە ڕاناوەستی. تۆ کێی؟
ژنەکە ویستی لێ بدا. بەلام پاشان پێی گوت:
. ڕاوەستە. دەچمە ئەو ژوورە ئیشێکم هەیەو دێمەوە. ژنەکە، کە لەبەر چاوی برای هەژار دوورکەوتەوە، پارچە لاستیکەکەی لە ناو لنگانی خۆی بەستو هاتەوە. کابرا لە ئێوارێ تا سبەینێ ئیشی خۆی لەگەڵ کرد. برای دەولەمەندیش کاتێ کەوتە ناو دەریا، لە خوای بانی سەر پاڕایەوە گوتی: خوایە، نەجاتم بدە! لەم دەریایە دەرم بێنە!
شەپۆلی دەریا هێنای، بردی. تا ئاخیری فڕێی دایە سەر کەناری دەریا. درەختێکی دی. تێرو پڕ بەری درەختەکەی خوارد. کانییەکی دی تێر ئاوی خواردەوەو نووست. لە خەو هەستا دیسان برسی بوو. چووە لای درەختێکو بەرەکەی خوارد. گۆڕاو بوو بە مەیموون. لە دڵی خۆیدا گوتی: سەیرە! ئەمە چی بوو. دوو درەخت هەبوو: یەکەم هەر کەسێ بەرەکەی بخواردبا دەبوو بە مەیموونو دووەم: ئەگەر مەیموونەکە بەرەکەی بخواردبا، دەبووەوە بنیادەم. دیار بوو کابرا جاری یەکەم بەری درەختی بنیادەمی خواردبوو بۆیە هەر بە

بنیادەمی مایەوە. کەچی جاری دووەم درەختی مەیموونی خواردو گۆڕاو بوو بە مەیموون. بەڵام درەختی بنیادەمی بزر کردبوو، نەیدەزانی کامەیانە. لە دڵی خۆیدا واقی وڕماو گوتی: خودایە ئەمە چییە؟ ئینجا گەڕا درەختی بنیادەمی دۆزییەوەو بەرەکەی خواردو وەکوو خۆی لێهاتەوەو بووەوە بە بنیادەم. هەندێ بەری لە دوو درەختەکە کردەوەو بەری هەر درەختێکی بە جیا هەڵگرت. کابرا لە دوورەوە، کەشتییەکی دی. چەفیەی لەسەری کردەوە و هەڵی شەقاندو هاواری کرد:

. ئێرە! ئێرە!

دیتیان و چەند نەفەرێك بە بەلەم بۆی دابەزین و هەڵیانگرت و پێیان گوت:

. ئەوە بۆ کەوتوویتە ئێرە؟ کێ تۆی فڕێ داوەتە ئێرە؟

کابرا سەربووردەی خۆی بۆ گێڕانەوەو پێی گوتن:

. کەی فلانە کەشتی بەلاتاندا تێپەڕی؟

گوتیان:

. دوو ڕۆژە.

چووە لای کەشتیوانەکەو پێی گوت:

. سەد هەزار لیرەت دەدەمێ. پەلە بکەو بمگەیەنەوە ئەو کەشتییە.

کەشتیوان گوتی:

. بە چاوان، بەندەی چاوی تۆم!

کەشتی خێرا هاژوا تا گەیشتنە ئەو کەشتییەی برای هەژاری کابرای تێدا بوو. کەشتییەکان خۆیاندایە پاڵ یەکترو برای دەوڵەمەند چووەوە سەر کەشتی خۆیان و گەڕایەوە لای برای و ژنەکەی. بە برای گوت:

. برام، تۆ بۆچی بەم دەردەت بردم؟

برای گوتی:

. بمبوورە برام، مێشکم تێکچوو بوو.

ئینجا چووە لای ژنەکەی و چاك و چۆنی لەگەڵ کردو بەری درەختی مەیموونی دایە برای و برای خواردی و بوو بە مەیموون. مەیموونەکەی بەستەوە. ڕۆژێ، بیست داری لێدەداو پێی دەگوت:

- چۆن من فڕێ دەدەیتە ناو دەریا؟ قەت نەتگوت: ئەمە برای لە دایكو باوكمە؟! قەت نەتگوت برام چاكەی لەسەرمە؟ پارەیەكی زۆرم پێدای مامەڵەی پێبكەی، چوویو هاتیتەوە بە درۆ گوتت: لێیان سەندم. دووبارە پارەی ترم پێدایت. دیسان چووی پارەكەت فەوتاندو بووی بە نۆكەری قەحپەیەك! پێم ناڵێی بۆچی واتكرد؟ هەستا بیست داری تری لێدا. بەم جۆرە بە كەشتی ڕۆیشتن تا گەیشتنەوە شاری خۆیان. برای دەوڵەمەند ژنەكەیو برای بە مەیوون بووی بردەوە ماڵی خۆیان. چووە خزمەت دایكیو باوەشی پێداكردو دەستی ماچ كردو باسی دەردو بەڵای خۆی بۆ كردو پێی گوت:

- دەمەوێ خانوویەك بۆ خۆم دروست بكەم تەنیا خۆمو ژنەكەم تێیدا بین.

كۆشكێكی ئاوا كرد. لەگەڵ ژنەكەی چووە ناوی. لەسەر دەرگای نووسی: (خۆشیو ڕابواردنمان هەیە. هەر كەسێ لە دەرگای دەرەوە پێ باوێتە حەوشە، بیست دار دەخوا. هەر كەسێ پێ باوێتە ناوماڵێ، سەد دار دەخوا)

ئەم دەنگو باسە بە هەموو كەس گەیشت. سوڵتانی شاریش بیستی. بە وەزیری گوت:

- وەرە بچین بزانین داخۆ ڕاست دەكا. خەڵك داركاریی دەكا، یان نا؟

چوونە ماڵی كابرا. تا بەیانی بەزمو ڕابواردن بوو. كە تەواو بوون، كابرا دەستی دایە دارێكو بیست داری لە مەیموونەكەدا. كە چوونە دەرەوە، داوای هەقیان لێكردن. لە سوڵتانو وەزیریشیان دا. یەكەو سەد داریان لێدان. سوڵتانو وەزیر بە دەم ئازاری لێدانەوە چوونە دەرێ. بە لاكە لاك ڕۆیشتن. وەزیر بە سوڵتانی گوت:

- سوڵتان ئەم پیاوە ئازاری داین! ئەم بەزمو خۆشیو ڕابواردنە یانی چی؟

سوڵتان گوتی:

- نازانم.

بەیانی سوڵتان لە دوو كابرای ناردو پێی گوت:

- ئەم بەزمو خۆشیو ڕابواردنە چییە داتاننـاوە و دەڵێی ئەوەی لە دەرگای دەرەوە پێ باوێتە ناو حەوشە بیست دار دەخواو ئەوەی پێ باوێتە ناو ماڵەوە سەد دار دەخوا؟

کابرا گوتی:

- سوڵتان من پیاوێکی پارێزکارم. ئەم فێڵەم کردووە بۆ ئەوەی پیاوی سەرخۆش نەیێ لە ماڵی من شەراب بخواتەوە.

سوڵتان گوتی:

- ئەی بۆچی بیست دارت لە مەیموونەکە دا؟

کابرا گوتی:

- جەنابی سوڵتان ئەمە ئیشی خۆی هەیە.

سوڵتان گوتی:

- شتی وا ڕاست نییە.

کابرا سەربوردەی خۆی لە سەرەتا تا کۆتایی بۆ سوڵتان گێڕایەوەو پێی گوت: بە کەشتی دەهاتینەوە، لە ناوەندی دەریا، لە کەشتی فڕێی دام. هەرچۆن بوو خۆم گەیاندەوە کەنار. برسی بووم. بەری درەختێکم خوارد شیرن دەتگوت شەکرە. هەندێ ئاوم خواردەوە. دووبارە برسی و تێنوو بووم. چوومە لای درەختێکی تر. بەرەکەم خوارد. ئەمجارە بووم بە مەیموون. لە درەختی یەکەم گەڕام و دۆزیمەوە. بەرەکەم خوارد بوومەوە بنیادەم. هەندێ بەری هەر یەکە لەم دوو درەختەم هێنا و بە جیا لای خۆم هەڵمگرتن. کەشتییەکم دی لە دوورەوە دەهات، هاوارم کردو چەفییەم هەڵشەقاند. هەندێ نەفەر بە بەلەم هاتنە فریام و هەڵیانگرتم. هەزاران لیرەم دایە کەشتیوانەکەو داوام لێکرد بمگەیەنێتەوە ئەو کەشتییەی براکەم و ژنەکەمی تێدا بوو. کە گەیشتمەوە کەشتی خۆمان، چوومە لای برام دیتم ژنەکەی منی بۆ خۆی بردووە. بەری داری مەیموونم دایێ و کردم بەم مەیموونە.

سوڵتان پێی گوت:

- بڕۆ مەیموونەکە بێنە.

چوو مەیموونەکەی هێنایە لای سوڵتان.

سوڵتان گوتی:

- بێنە، بەری درەختەکە بێنە!

سوڵتا بەری درەختەکەی دەرخواردی مەیموونەکەداو مەیموونەکە بووەوە بنیادەم. سوڵتان بەو برایەی گوت کە ببوو بە مەیموون ببووەوە بنیادەم:

. تۆ بۆچی وات لە برات کرد؟ بڕۆ جارێکی تر شتی وا نەکەی!

برای بردییەوە ماڵێ. سەد لیرەی دایێو دوکانێکی قوماشفرۆشی بۆ کردەوە.

برای دەوڵەمەندی پێی گوت:

. دەتەوێ ژن بێنی؟

گوتی:

. بەڵێ!

ژنێکی بۆ خواستو جیازو پێویستی ماڵی بۆ کڕیو ئاهەنگی زەماوەندی بۆ گێڕاو هەموو بە خۆشیو شادی ژیان.

لای ئێوە بووینو هاتینەوە.

* * *

## ٥٠ـ بەختی خەرەکرێس

هەبوو نەبوو...

سێ کچ هەبوون، لەگەڵ دایکیان دەژیان. ڕۆژێ، دایکە بە کچی گەورەو کچی ناوەنجی گوت:

ـ کچی گەورەم، تۆ بەختت سوڵتانەو کچی ناوەنجیم تۆیش بەختت وەزیرە! بڕۆنە بەر دەرگای پردو کە سوڵتانو وەزیر هاتن، کچی گەورەم، تۆ روو بکە سولتانو بڵێ: سوڵتان بەختی منەو کچی ناوەنجیم تۆیش روو بکە وەزیرو بڵێ: وەزیر بەختی منە!

دوو کچەکە چوون لە بەر دەرگای پردەکە راوەستان. سولتانو وەزیر هاتن. کچە گەورەکە رووی کردە سولتانو گوتی: ئەی سولتان، تۆ بەختی منی! کچە ناوەنجییەکش رووی کردە وەزیرو گوتی: ئەی وەزیر، تۆ بەختی!

سوڵتان کچی گەورەی هێناو وەزیر کچی ناوەنجی هێنا. کە ئەم دوو خوشکە شوویان کرد. یەکێ شووی بە سوڵتان کردو ئەوەی تر شووی بە وەزیر کرد، خوشکە بچووکەکە مایەوە. ئەویش چووە لای دایکیو گوتی:

. دایکە، ئەدی بەختی من لە کوێیە؟

دایکی گوتی:

. بەختی تۆ لە شەقی خەرەکی ڕستن دایە.

کچە بچووکەکە، کە ئەمەی بیست، کەرەستەی ڕستنی هێنا و لە داخی دڵ و بەختی خۆی، لە عەردی کوتا. بەڵام برسی بوو. ژیانی لەسەر خەرەکڕێسی بوو. گەڕایەوە لای کەرەستەی ڕستن و هەڵیگرتەوە. تروسکاییەکی لێ دەرکەوت. شوێنەکەی هەڵکۆڵی ئەشکەوت بوو. چووە ناو ئەشکەوتە کۆشکێکی دی کەسی تێدا نەبوو. لەوێ گیرسایەوە. پاکی کردەوە و چێشتی لێنا و دەستی بە خواردن کرد. لەسەر نانخواردن بوو، دەرگا کرایەوە و گەنجێ هاتە ژوورەوە. کە چاوی بە کچەکە کەوت، گوتی:

- ئۆی ئەوە خوا تۆی لە کوێ بۆ ناردم؟ لە عاسمانانم دەویستی لە عاردانم دەستکەوتی.

کچەکەی لە خۆی مارەکرد و چووە لای و لای خۆی هێشتییەوە. ڕۆژێ، گەنجەکە نامەیەکی لە باوکییەوە بۆ هات. گوتی: وەرە دۆتمامەکەتت بۆ دێنم. کوڕە، کاتێ ئەمەی بیست، پەست و نیگەران بوو. دەستەکی کەوتە پێش، دەستەمی کەوتە پاش. ئەگەر ناچێ باوکی عادز دەبێ، ئەگەر دەچێ، ئەدی چ لەم ژنە بکا و لە کوێی دابنێ؟! باسی گرفتاری خۆی بۆ کچەکە کرد. کچەکە گوتی:

- منیش لەگەڵت دێم.

کوڕەکە گوتی:

- شتی وا نابێ.

کچەکە گوتی:

- بەخوا هەر لەگەڵت دێم.

کوڕە دیتی کچە زۆر پێگریی دەکا. گوتی:

- باشە. ئەمشەو لێرە دەبین، سبەی وەکات بە ڕێ دەکەوین.

کچەکە گوتی:

- متمانەم بە تۆ نییە. دەترسم ڕابکەی. قۆڵی کراسی کوڕەکەی لە قۆڵی کراسی خۆی بەست و بەو جۆرە نووستن. کوڕەکە وای پێشان دا نووستووە. بەڵام نەنووست. کە دڵنیا بوو کچەکە خەوی لێکەوتووە، هەستا قۆڵی کراسی خۆی لە قۆڵی کراسی کچەکە کردەوە. خۆی هەڵدایە سەر ئەسپەکەی و تێی تەقاند ڕۆیشت. بەیانی، ژنەکە بە خەبەر هات. سەیری کرد کەس نییە، گوتی: بە خوا

دەستی خۆی وەشاندو ڕۆیشت. هەستا دەستە بەرگێکی پیاوانی کردە بەرو جل وبەرگی ژنانەی خۆیشی لە ناو بوخچەیەك ناو بردی. سواری ماینێك بوو ڕۆیشت. گەیشتە دەروێشێکی پیر. فەرووەکی لەبەر بوو. پێی گوت:

. دەروێش، (دە) لیرەت دەدەمێ جل و بەرگی خۆتم بدەرێ.

دەروێش گوتی:

. فەرموو!

ژنەکە دە لیرەی دایێ و جل و بەرگەکەی لە دەروێش وەرگرت و لەبەری کرد. بوو بە دەروێشێکی تەواو!!

بە دوو مێردەکەیدا چوو. گەیشتە مێردی. مێردی نەیناسییەوە. گوتی:

. ها، دەروێش، لەو ڕێگایەی هاتی چت دی؟ چت نەدی؟

دەروێش گوتی:

هەنارێکی زێڕم بینی،
دەگریاو دەیلاواندەوە، دەیگوت:
خۆشەویستەکەم، خۆشەویستی خەڵك،
خۆشەویستی گوڵ و یاس،
لە خەو بە ئاگای نەهێنام
تا بە سەلامەتی بە ڕێی کەم!

کوڕەکە لەگەڵ ئەم قسەیە دەستی بە گریان کرد. هاواری کرد:

. دەروێش دەچیتە کوێ؟

دەروێش گوتی:

. دەچمە جێگایەك.

. کابرا گوتی:

. کە هاتی چت لەبەر دەمی خۆتدا دی؟

دەروێش گوتی:

هەنارێکی زێڕم بینی،
دەگریاو دەیلاواندەوە، دەیگوت:
خۆشەویستەکەم، خۆشەویستی خەڵك،

خۆشەویستی گوڵو یاس،

لە خەو بە ئاگای نەهێنام

تا بە سەلامەتی بە ڕێی کەم!

کوڕەکە پێی گوت:

- دەروێش، بۆ لەگەڵ من نایەی تەکیەیەکت بۆ دروست دەکەم مانەندی نەبێ.

دەروێش گوتی:

- باشە، دێم بۆ نایەم.

ڕۆیشتن. کوڕەکە دیسان لێی پرسی:

- دەروێش، لە ڕێگادا چت بینی؟

(دەروێش) قسەکەی بۆ دووبارە کردەوە. ڕۆیشتن تا گەیشتنە جێ. کوڕەکە تەکیەیەکی بۆ (دەروێش) دروست کردو (دەروێش)ی لە تەکیەکە دانا. کوڕەکە هەموو ڕۆژێ دەچووە سەردانی و بە بێ ئەو نەدەحەوایەوە. وای دەزانی (دەروێش)ە.

ڕۆژێ، کوڕەکە چووە لای (دەروێش)و پێی گوت:

- (دەروێش).

(دەروێش) گوتی:

- فەرموو!

گوتی:

- دەزانی بەیانی ژنم لێ مارە دەکەن.

(دەروێش) گوتی:

- بە ڕاستیتە؟

گوتی:

- بەڵێ!

(دەروێش) گوتی:

- خێری تێدایە ئیشاڵڵا. تکات لێدەکەم بەیانی مەیە لای من. من دەمەوێ بۆ خۆم گۆشەگیر بم.

گوتی:

. باشە.

کوڕەکە ڕۆیشت. کچە هەستا خۆی شووشت و خۆی خەملاندو زێڕو خشڵی بە خۆیەوە کردو بوو بە کچێکی جوانی وەکوو تریفەی مانگ. عەبای لە خۆی داو چووە ماڵی کوڕەکە. چووە ژووری بووك. ئەوەندە جوان بوو ماڵەکەی بە شەوقی جوانی خۆی ڕووناك کردەوە. کەچی بووك ڕەش ڕەش بوو. کەس و کاری بووك گوتیان. کچەکە، دە وەرە نیو سەعاتێك لە جێگای بووك دانیشە بۆ ئەوەی کەس و کاری زاوا بتبینن و دیاریت پێشکەش بکەن.

گوتی:

. باشە.

چی خشڵ و زێڕ هەبوو هەموویان پێوە کرد. کاتێ کەس و کاری زاوا هاتن و دیتیان ئەوەندە جوانە، زۆر دیاری بە نرخ و بێ وێنەیان پێشکەش کرد. کچەکە دەرفەتێکی وەرگرت و هەموو زێڕو دیارییەکانی ڕفاندو بردی. وەختەك دیتیان کچەکە نەماوە. لە دووی گەڕان. گوتیان:

. ئەو کچە چی لێهات؟ چووە کوێ؟ تەفرەی داین و قوڵی بڕین. لە دووی گەڕان نەیاندۆزییەوە. کچەکە چووەوە جێگای خۆی. جلەکانی داکەندو جلی دەروێشی کردەوە بەر. کوڕەکە هات، پێیان گوت:

. شتێکی ئاوها قەوماوە.

کوڕەکە زۆری خەفەت خوارد. گوتی:

ـ دەچمە لای ئەو پیاوە بە دینە بۆ ئەوەی قسەیەکم بۆ بکاو دڵم نەختێ بحەسێتەوە. کوڕەکە چووە لای (دەروێش)و گوتی:

. (دەروێش)!

(دەروێش) گوتی:

. فەرموو! بە خێر بێی، ژن مارەکردنەکەت چۆن بوو؟ ئەی بۆچی دەسەسرێکت بۆ نەهێنام؟! پیرۆز بێ، پیرۆز!

کوڕەکە گوتی:

. دە وس بە (کابرا)، بیبڕەوە!

(دەروێش) گوتی:

. بۆچی؟
کوڕەکە گوتی:
. جاریٰ، تۆ پێم بڵێ لە ڕێگای خۆتدا چت بینی:
(دەروێش) گوتی:

هەنارێکی زێڕم بینی،
دەگریا و دەیلاواندەوە، دەیگوت:
خۆشەویستەکەم، خۆشەویستی خەڵك،
خۆشەویستی گوڵ و یاس،
لە خەو بە ئاگای نەهێنام
تا بە سەلامەتی بە ڕێی کەم!

ئینجا بە کوڕەکەی گوت:
. ژن مارەکردنەکەت چۆن بوو؟
کوڕەکە گوتی:
. کچێك چوو بووە ماڵی بووك. ماڵی بووك لە جێگای کچی خۆیان لەسەر تەخت دایاننابوو. چ خشڵ و زێڕ هەیە. هەموویان پێوە کردبوو. ئەویش دەرفەتی وەرگرتبوو و ڕایکردبوو. کە کوڕەکە لە قسەکەی بووەوە.
(دەروێش) لە قاقا پێکەنینی دا:
. ها...ها...!
کوڕەکە گوتی:
. (کورە، کابرا)، وس بە! لێم گەڕێ لە خەمی خۆم بتلێمەوە.
(دەروێش) گوتی:
. زەماوەند دەکەیت و ژن دێنی؟
کوڕەکە گوتی:
. دەڵێم وس بە (کابرا). بەم قسانە مەمکوژە و برینم مەکولێنەوە.
کوڕەکە چیدی خۆی پێڕانەگیرا. هەستا چووە دەرەوە و گوتی:
. خوا حافیز!
(دەروێش) گوتی:

. خوات لەگەڵ.
دوای هەفتەیەك، کوڕەکە چووە لای (دەروێش)و پێی گوت:
. ئەمشەو شەوی چوونە پەردەیە.
(دەروێش) گوتی:
. قەت نەبی؟!
کوڕەکە گوتی:
. بەڵێ بە خوای!
(دەروێش) پێی گوت:
. بڕۆ نەیەیتەوە، دەمەوێ بۆ خۆم گۆشەگیر بم!
کە کوڕەکە ڕۆیشت. کچەکە هەستا جلی خۆی گۆڕی. خۆی جوان کرد. بوو بە کچێکی نازداری وا تاکی نەبوو. چووە ماڵی کوڕەکە دیتیان بووك لە چاو ئەو کچە هیچ جوان نییە. کە کچەکە چووە ژوورەوە ئەو ماڵە تاریکە ڕووناك بووەوە. کە دیتیان کچێکی ئەوەند جوانە ڕوویان دایێ‌و شێویان بۆ دانا. شێوی خوارد. داوایان لێکرد لەوێ بمێنێتەوە. تا زاوا دێ‌و دەستی بووك‌و زاوا لە ناو دەستی یەکتر دەنێن، ئەوسا بڕوا. کچەکە ڕازی بوو، گوتی:
. قوربانی چاوتان بم!
ئێوارێ بووکیان بردە پەنایەك‌و ئەم کچەیان هێنا خشڵ‌و زێڕیان پێوەکردو ڕازاندییانەوەو دایاننا. ئەوەندە جوان بوو. دەتگوت یەك پارچە بەفرە. شەو، کوڕەکە هات، بردییانە ژوورەوە بۆ لای کچەکە بۆ ئەوەی دەستیان لە ناو دەستی یەکتر بنێن. کوڕەکە نێوچەوانی کچەکەی ماچ کردو ویستی بچێتە دەرەوە. کچەکە بەربینگی گرت‌و گوتی:
. تا دیاریم نەدەیتێ، لێناگەڕێم بچیتە دەرەوە.
کوڕەکە گوتی:
. ئێستا. نا! بەرم دە بچمە دەرەوە. برادەرەکانم ماچ بکەم.
کچەکە گوتی:
. هەر ئێستا دیاریم دەوێ.
ئینجا سەعاتی لە بەرۆکی کوڕەکە ڕاپسکاندو کوڕەکە چووە دەرەوە.

هـەر هێنـدە کوڕەکـە چـووە دەرەوە، کچـەکە ڕایکـردو چـووەوە جێگـای خـۆیو جلو بـەرگی خـۆی داکەنـدو جلـی دەروێشـی کـردە بـەرو دانیشـت. کوڕەکـەش برادەرەکـانی مـاچ کـردو گەڕایەوە ژووریٚ بـۆ لای بـووك دیتـی دەم وچـاوی ئـەو کچە نییە کە پێش نەختیٚ لەویٚ بوو. سەری سوڕما، پێی گوت:

. تازە چیم پێشکەش کردی؟

گوتی:

. چی؟

کوڕە شاش ما! نەختیٚ پێش ئێستا دیتی ژوورەکە ڕووناك بوو، ئێستا تاریك داهاتووە! بە کچەکەی گوت:

. دەڵێم پێش نەختیٚ چین پێشکەش کردی؟!

بە تووڕەیی ئەم قسەیەی دووبارە کردەوە. کچەکە نەیزانی کوڕەکە چی داوەتیٚ. کوڕەکە چووە دەرەوە. بانگی کەسو کاری خۆی کرد. هاتن گوتیان:

. ها؟ چ بووە؟ ئەوە چیتە؟

گوتی:

. پێش نەختیٚ لە کاتی دەست لەناو دەست ناندا کچێکم بینی دەتگوت مانگە تا سـەعاتێکم بـە دیـاری نـەدایێ لێنەگـەڕا بێمـە دەرەوە. ئێسـتاش کـە چـوومە ژوورەوە، دەم وچاوێکی تـرم دیم دی. ئـەوە نـەبوو کـە پێش نـەختیٚ دیـم. ئەمـە یانی چی؟!!

کوڕەکە وەرگەڕایە سەروگوێلاکی خۆیو گوتی:

. هەر ئێستا تەڵاقی دەدەم. من ئەم کچەم ناویٚ!

بەیانی کوڕەکە چووە لای (دەروێش)و بانگی کرد، گوتی:

. پێم بڵیٚ چیت لە ڕێگای خۆت بینی؟

کچەکە، کە کوڕەکەی بینی، زانی غەمبارە، گوتی:

. بە خێر بێی! زەماوەندت کرد؟ ئەوە بۆچی هیچت لەگەڵ خۆت نەهێناوە؟

کوڕە گوتی:

. (کابرا) وس بە. پێم بڵیٚ چت لە ڕێگای خۆتدا دی؟

کچەکە گوتی:

. تۆ پێم بڵێ: زەماوەندت کرد؟

کوڕەکە گوتی:

. یەکەم جار تۆ پێم بڵێ: چت لە ڕێگای خۆتدا دی. کچەکە گوتی:

هەنارێکی زێڕم بینی،
دەگریاو دەیلاواندەوە، دەیگوت:
خۆشەویستەکەم، خۆشەویستی خەڵك،
خۆشەویستی گوڵو یاس،
لە خەو بە ئاگای نەهێنام
تا بە سەلامەتی بە ڕێی کەم!

کوڕەکە نەختێ سوکنایی دڵی هات. کچەکە پێی گوت:

. چت کرد؟

کوڕەکە گوتی:

. (کابرا) وس بە، هاتم بچمە پەردە لەگەڵ بووك دەستمان لە ناو دەستی یەکتر نا. کچێکی ئەوەندە جوان بوو دەتگوت مانگە. تا دیارییەکی لێ نەسەندم، لێنەگەڕا بچمە دەرەوە. سەعاتەکەی بردمو منیش زۆرم پێخۆش بوو. چوومە دەرەوە بۆ ئەوەی برادەرەکانم ماچ بکەم. کە هاتمەوە ژووری دیتم کچەکە کچێکی ترە. شێت بووم!! پێم گوت: چیم بە دیاری دایە تۆ؟ وەڵامی پێ نەدرایەوە. گوتی: هیچت نەدامێ. هەستام تەڵاقم داو هاتمە دەرەوە. ئەوەتا لای تۆم. (دەروێش) لە قاقای پێکەنینی دا. کوڕەکە واقی وڕما. لە دڵی خۆیدا گوتی:

. دیارە ئەم (پیاو)ە بە ئیشەکە دەزانێ. بە (دەروێش)ی گوت:

. (کابرا) ڕاست بڵێ، نەوەك لێت دەدەم!

(دەروێش) گوتی:

. ئەوە تۆ شێت بووی؟

کوڕەکە گوتی:

. پێم بڵێ بە چ پێدەکەنی؟

(دەروێش) دیسان لە قاقای پێکەنینی دا. کوڕەکە گوتی:

- بە هیلاکت دام. دیارە شتێ دەزانی. دە بە ئاشکرا قسە بکە!

(دەروێش) گوتی:

- هێشتا نامناسی!! من فلاّنە کەسم. کە تۆ ڕۆیشتی خۆم گۆڕی‌و بە دواتدا هاتم.

ئەوسا جلە ساختەکانی دەروێشی داکەندو جل وبەرگی خۆی کردەبەر. کوڕەکە پێی گوت:

- ئەی بۆچی پێت نەگوتم؟!!

کچەکە گوتی:

- هەستە با بچینەوە سەر جێ‌و ڕێی خۆمان.

کوڕەکە گوتی:

- باشە!

یەك مانگی ڕەبەق شت‌و مەکیان لە بازاڕ کڕی. شتەکانیان لە ئێستران بار کردو سوار بوون. چوونەوە جێگای خۆیان. کچە دەرگای کردەوە. ماڵی خاوێن کردەوە. شتەکانیان بردە ژوورەوەو ئیتر بە یەکەوە ژیان.

ئێستا با بچینەوە لای کەس‌و کاری کوڕەکە:

بەیانی هەستان دیتیان کوڕەکەیان دیار نییە. ڕۆژێك پێچوو، دوو ڕۆژ پێچوو، سێ ڕۆژ پێچوو. باوکی کوڕەکە گوتی:

- لەوانەیە گەڕابێتەوە جێگای پێشووی.

سواری ئەسپ بوو. دوو سەد سواری بەگەڵ خۆیدا. ڕۆیشتن تا گەیشتنە ئەوێ. کوڕەکەو کچەکە دانیشتبوون نانیان دەخوارد. باوکی لە دەرگای داو گوتیان:

- کێیە؟

گوتی:

- منم.

کوڕەکە دەرگای کردەوە دیتی باوکیەتی.

گوتی:

- باوکە، ئەوە چۆنە هاتووی؟

باوکی گوتی:

- ئەوە بۆچی وات لێکردین؟ ئەوە ئیش بوو تۆ کردت؟

گوتی:

- دەمەوێ لێرە بژیم. خوا ژنێکی بە نسیب کردووم. هەزار جار لە دۆتمامی خۆم جوانترو خاتووتترە. زۆر بە حەیا و بە ئەدەبە. باوکی گوتی:

- کەیفی خۆتە.

باوکی کوڕەکە لەگەڵ دوو سەد سوارەکە بیست ڕۆژ لەوێ مانەوە. ئەوسا بە کوڕەکەی گوت:

- کوڕم، ئێستا ئێمە دەڕۆین. تۆش مادام وات حەز لێیە لێرە لای ژنی خۆت بمێنەوە. کوڕەکە بە شادیو کامەرانی لەگەڵ ژنەکەی ژیا.

لای ئێوە بووینو هاتینەوە.

* * *

## ١٥ـ زڕدایك و زڕ كچ

هەبوو نەبوو...

دارکەرێك هەبوو، کچێکی بچکۆڵەی هەبوو. کچەکە گەورە بوو. دایکی نەخۆش کەوت و عەمری خوای کرد. پاش مردنی دایکی، قەیرە کچێکی دراوسێیان هەبوو شووی نەکردبوو. منداڵێکی ساوایان هەبوو کچەکە دەچوو منداڵەکەی بەخێو دەکرد. کچەکە وردە وردە خۆشەویستی قەیرە کچەکەی کەوتە دڵ و هۆگری بوو. ڕۆژێ، قەیرە کچەکە بە کچی کابرای گوت:

ـ دایکت مرد. تۆ ئێستا بێ دایك ماویتەوە. بە باوکت بڵێ من مێردی پێ دەکەم. با بمخوازێ!

کچەکە گوتی:

ـ باشە. کە باوکم هاتەوە پێی دەڵێم.

ئێوارێ، کە کابرا لە ئیش هاتەوە، کچەکە پێی گوت:

ـ باوکە، فلانە کچی دراوسێمان منی زۆرخۆش دەوێ و زۆرخزمەتم دەکات، بۆچی نایخوازی ؟

باوکی گوتی:

ـ کچم، دەترسم پاشان ئازاری تۆ بدا!

کچەکە گوتی:

ـ نا، باوکە، منی زۆر خۆش دەوێ

باوکە گوتی:

ـ مادەم وایە تۆچۆنت دەوێ با وابێ.

کچەکە چووە لای قەیرە کچی دراوسێیان و پێی گوت:

- باوکم ڕازی بوو. قەیرە کچەکە گوتی:
- بە ڕاست؟! بە ڕاست؟!
کچەکە گوتی
- ئەریّ بە خوا !

ڕۆژی پاشی، چوونە داخوازیی و مەلاو کێخوایان هێنا و کابرا ژنەکەی مارەکرد. شەوی هەینی گواستییەوەو شەو چووە پەردە. کچەکە زۆر پێی شادو دڵخۆش بوو. تا مانگێك ڕیزی یەکتریان دەگرت، چەند ڕۆژێ دوای ئەوە، ژنەکە گۆڕا، لەگەڵ کچەکە سارد بوو. پاش ماوەیەك، زڕدایك کچێکی بوو. ئیتر کچەکە خوشکێکی بۆ پەیدا بوو! کچەکە گەورە بوو. تەمەنی بوو بە (دە) ساڵی و زڕخوشکەکەیشی بوو بە پێنج ساڵی. ڕۆژێ، ئەم دوو کچە خەڕەکیان دەرست، کچە بچووکەکە هەندێ خوری لە کچە گەورەکە دزی. کە چوونەوە ماڵێ، زڕدایك بینی ڕیسی کچی خۆی زۆرەو ڕیسی زڕکچەکەی کەمە. زۆری لە زڕکچەکە دا. ڕۆژی پاشی، مانگایەك و هەندێ خوری دانیّ و پێی گوتن:
- بڕۆن ئەم مانگایە لە دەشتێ بلەوەڕێنن و ئەم خورییە بڕێسن.

بە کاری خوا بای هات و خورییەکی برد. زڕکچەکەی ترسا بێ خوری و ڕیس بچێتەوە، کەوتە دوای خورییەکەو خورییەکە کەوتە ناو ئەشکەوتێك. کچەکە بە دوای خورییەکە داچووە ناو ئەشکەوتەکە. کە چوو دەڵە دێوێکی دی. دەڵە دێوەکە پێی گوت:
- وەرە سەرم بدۆزە. کچەکە ترسا، سەری دۆزی دیتی پڕە لە ئەسپێ، هەر ئەسپێیەکی بە قەدەر زەرگەتەیەکە. دەڵە دێوەکە لێی پرسی:
- سەرم چۆنە؟
کچەکە ترسا پێی بڵێ پاك نییە، گوتی
- ئەڵلا سەرت چەند پاك و خاوێنە. پڕ مروارییە! گوڵاوی لێ دەتکێ! دەڵە دێوەکە سێ جار پرسیاری لە کچەکە کرد. دەیەویست بە غەلەتی ببا، کچەکە هەموو جارێ دەگوت:
- سەرت دەڵێی گوڵە !
دەڵە دێوەکە گوتی
- ئەوەندە بەسە !
ئینجا پێی گوت:
- بڕۆ خۆت لەم جۆگایە بشۆ.

کچەکە چوو خۆی شووشت. لە ناو ئاوەکە هاتە دەریّ ئەوەندە جوان بوو. گەورەیی بۆ ئەو خوایەی دروستی کردووە!!
پێلاوێکی یاقووتی لە پێ‌و بازنێکی زێڕی لە دەست‌و خڕخاڵێکی زمڕووتی لە پێدا بوو!!
با بچینەوە لای کچی باوەژنەکە:
کچەکە دیتی زڕ خوشکی بە دوای خورییەکەدا ڕایکرد. چاوەڕێی کرد تا دێتەوە. کچەکە هەر نەگەڕایەوە. بە گریان گەڕایەوە لای دایکی‌و پێی گوت:
. دایکە خوشکم جێی هێشتم‌و ڕایکردو ڕۆیشت.
کچەکە حەفتەیەك لە لای دەڵە دێوەکە مایەوە. لەو حەفتەیەدا باوکی کۆچی دوایی کرد. کچە بە دەڵە دێوەکەی گوت:
. دەمەویّ بچمەوە لای کەس‌و کاری خۆم.
گوتی:
. بڕۆ خوات لەگەڵ کچم!
کچەکە دەستی دەڵە دێوەکەی ماچ کردو گەڕایەوە بۆ لای کەس‌و کاری. کە زڕدایکی چاوی پێکەوت بە سەری داقیڕاند:
. هەی دێڵە سەگی سەگباب، ئەوە کێ ئەوها جوانی کردی؟
کچەکە گوتی:
. دەڵە دێو!
باوەژن گوتی بڕۆ کچەکەی منیش ببەو جێگاکەی نیشان بدە.
کچەکە زڕخوشکی برد. خورییەکەی دانا. با خورییەکەی برد. خورییەکە کەوتە ناو ئەشکەوتەکە. کچی باوەژن بە دوای خوریەکەدا چووە ناو ئەشکەوتەکە، دەڵە دێوەکەی بینی. دەڵە دێوەکە هەر چاوی پێکەوت، بانگی کرد:
. وەرە سەرم بڕۆنە!
سەری خۆی کۆت کردو لەبەر دەستی کچەکەی نا. کچەکە سەری ڕۆنی دیتی پڕ ئەسپێیە. گوتی:
. ئەمە چییە؟ سەرت پڕ ئەسپێیە! زۆریش پیسە!
دەڵە دێوەکە گوتی:
. بەسە بڕۆ خۆت لەم جۆگایە بشۆ.
کچەکە چووە ناو جۆگاکەو خۆی شووشت. کە لە ناو جۆگاکە هاتە دەرەوە، ببوو بە قەرەواشێکی ڕەشی پیس‌و ناشیرین. نەدەوێرای تەماشای بکەی!

دەعبای کەرێکی بە دەمەوە بوو دەیجووی. کچەکە بە گریان گەڕایەوە لای دایکی و دایکی کە بەم شێوەیەی بینی، گوتی:
. ئەمە چییە؟ بۆ وات لێهاتووە؟
کچەکە هەقایەتی خۆی بۆ گێڕایەوە. باوەژن لە زڕ کچەکەی قیت بووەوەو تێرو پڕی لێدا. گۆزەیەکی دایێ و گوتی:
. بڕۆ ئاو لە ڕووبار بێنە!
کچەکە گۆزەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت. چووە سەر ڕووبار. کوڕی سوڵتان چاوی پێکەوت و ئەشقی بوو. خۆی لێ نزیك کردەوە دیتی پێڵاوێکی زێڕی لە پێدایە. کە کچەکە گۆزەکەی پڕ ئاو کردو هەڵیگرت و گەڕایەوە، کوڕی سوڵتان قەرە بە قەرەی چوو بۆ ئەوەی ماڵی پێبزانێ. کوڕەکە گەڕایەوە لای دایکی و گوتی:
دایکە هەستە بەگەڵم کەوە!
دایکە گوتی:
. بۆ کوێ کوڕم، ئەوە تۆ چیت بەسەر هاتووە؟ شێت بووی؟.
کوڕەکە گوتی:
ـ لەسەر ڕووبار ڕاوەستا بووم. کچێکم بینی گەورەیی هەر بۆ ئەو خودایە کە ئەوها جوان خەڵقی کردووە!! پێڵاوێکی زێڕی لە پێدابوو. ئەوەندە جوان بوو دەتگوت کافوورە! قەرە بە قەرەی چووم و ماڵم پێزانی. هەستە بۆم بڕۆ داخوازی.
دایکی هەندێ ژنی لەگەڵ خۆی بردو چووە ماڵی کچەکە. دیتیان باوەژن لێی دەدا. گوتیان:
. بۆ لێی دەدەی؟
ژنەکە گوتی:
. بێزاری کردووم!
گوتیان:
. ئێمە بۆ کوڕی خۆمان، بۆ کوڕی سوڵتان هاتووینە داخوازی.
ژنەکە گوتی:
. بە شووی نادەم.
پێیان گوت:
ـ قسەی وا نییە. چاویان گێڕا دیتیان قەرەواشێکی ڕەشی پیس دەعبایەکی کەری لە دەمدا بوو دەیجوی. بە ژنەکەیان گوت:

. ها بڕیارت لە سەر چ دا؟
گوتی:
. باشە، ڕازیم.
ژنەکە پێی گوت:
. نەختو مارەیی هەزار لیرەیە!
دایکی کوڕەکە ڕازی بوو چونکە کچەکەی زۆر کەوتبووە بەردڵ. ئەوان ڕۆیشتن و دایکە زڕکچەکەی گرتو تێرو پڕی لێداو پێی گوت:
ـ هەی ناجسن، تۆ شوو بە کوڕی سوڵتان بکەی و کچی منیش ئەوها بمێنێتەوە؟!! دەبێ زەبرێکی وەهات لێبدەم نەبێتەوە. ئینجا گوتی:
. هەستە نان بکە.
ڕۆژی پاشی، پارەی نەختو مارەیی و شیرناتی و دەسەسڕو دیاری لە ماڵی سوڵتانەوە هات. مارەییان بڕی و جیازیان بۆ کردو کەل و پەلەکانیان ناردە ماڵی زاوا.
بۆ سبەینێ، بووکیان بە گالیسکە هێنا. بردیان لە ژووری خۆی دایاننا. شەو کوڕەکە چووە لای و لەگەڵیا نووست. دوای ماوەیەك، کچەکە هەستی کرد پێویستی بە چوونە حەمام هەیە. کە چووە دەرەوە بە کاری خوای یەك پارچە زێڕ بوو. پێویستی بە چوونە سەر دەستاو بوو. بە مێردی گوت:
. پسمام سکم ژان دەکا دەمەوێ بچمە سەر پێشاو.
کوڕەکە دەسەسڕی خۆی بۆ ڕاخست. کچەکە پێویستی خۆی لەسەر دەسەسڕەکە جێبەجێ کرد. یاقووتو زمڕووتی دانا. کوڕەکە چاوی لە دیار ئەم دیمەنە زەق بووەوە. چوو ئەمەی بۆ دایکی و بۆ کەس و کاری گێڕایەوە. هەموو شادو گوشاد بوون. زیافەتیان کردو هەموو خەڵکیان داوەت کرد. بە خێرا ئەو کچە هەموو شادو بەختەوەر بوون.
لای ئێوە بووین و هاتینەوە.

* * *

## ٥٢ـ کوڕە هەژارو کچە سوڵتان

هە بوو نەبوو...

کوڕە هەژارێك هەبوو، دایكو باوكی مرد بوون، بەڵام خوێی کوڕێکی زۆر قۆز بوو. ڕۆژێ، چووە دەرەوە. بە بن کۆشکی سوڵتاندا تێپەڕی. کچی سوڵتان لە شانیشین دانیشتبوو. کوڕەکە چاوی بە کچەکە کەوت، دڵی کەوتە سەرو ئەشقی بوو. کچەکەیش ئەوی دیو ئەشقی بوو. لە پەنجەرەوە ئاماژەی بۆ کرد، گوتی:

. بەم دەرگایەدا وەرە ژوورەوە!

کوڕەکە چووە سەلال بۆ ژووری کچەکە. کچەکە پێی گوت:

. نازانم چ بکەم؟ تۆم زۆر خۆش دەوێ!! بڕۆ لای باوکم قسەی لەگەڵ بکە بەڵکو ڕازی بێ زەماوەند بکەین.

کوڕەکە گوتی:

. باشە.

کوڕەکە تا بەیانی لای کچەکە مایەوە. دەست گەمەی لەگەڵ کرد. بەیانی ڕۆیشت چووە بەر دەرگای ماڵی سوڵتانو ویستی بچێتە ژوورەوە. دەرگەوان لێنەگەڕان.

کوڕەکە گوتی:

. دەمەوێ قسەیەك لەگەڵ سوڵتان بکەم.

گوتیان:

. ڕێت نادەین!

لەم قسەیەك و لەوان قسەیەك، لێکیان توند کرد. یەکێ هات پێی گوتن:

. چییە؟ ئەوە چیتانە؟

پێیان گوت:

. ئەمە دەیەوێ بچێتە لای سوڵتان.

پێی گوتن:

. ڕاوەستن بچم بە سوڵتان بڵێم!

چووە لای سوڵتان و پێی گوت:

. یەکێ لەبەر دەرگایە دەیەوێ بێتە ژوورەوە. گوتی:

. بانگی کەن.

کوڕەکە چوو سەلامی کرد.

سوڵتان سەلامی لێ وەرگرتەوە و پێی گوت:

. ها، چت دەوێ؟

گوتی:

ـ بە خوا تۆ سوڵتانێکی گەورەی! هاتووم داوایەکم لە تۆ هەیە دەمەوێ بە گەورەیی خۆت بۆم جێبەجێ بکەی.

سوڵتان گوتی:

. بڵێ داواکەت چییە؟!

کوڕەکە گوتی:

. دەمەوێ کچی خۆتم بدەیتێ.

سوڵتان گوتی:

ـ ڕازیم، کچی خۆمت دەدەمێ، بەڵام بڕۆ خۆت فێری هونەرو زانستێك بکە.

کوڕەکە گوتی:

. باشە.

خوا حافیزی کردو ڕۆیشت. گەڕایەوە لای کچەکەو پێی گوت:

. چووم پێم گوت.

کچەکە گوتی:

. ئێ، چی وەڵام دایەوە؟

کوڕەکە گوتی:

. دوای لێکردم گوتی: بڕۆ خۆت فێری هونەرو زانستێك بکەو وەرەوە!

کچەکە گوتی:

ـ ئەمە هەر زۆر ئاسانە. دەستی پێ کرد دەرزی بە کوڕەکە گوت. یەکەم جار فێری نوسینی کرد. کوڕەکە فێری خوێندنەوەو نووسین بوو. ئینجا زانستەکان. کوڕەکە لە خوێندن بەردەوام بوو. دەچووە لای کچەکەو کچەکە دەرزی دەدایێ. کوڕەکە هەموو زانستێکی تەواو کرد. بوو بە زانایەکی گەورەو بێ وێنە. ڕۆژێ، چووە لای سوڵتان و گوتی:

. خۆم فێر کرد.

سوڵتان گوتی:

. بە ڕاستیتە؟

گوتی:

. ئەرێ بەخوا.

سوڵتان دوو پرسیاری لێکرد، کوڕەکە وەڵامی دایەوە. سوڵتان کە دیتی کوڕەکە بەم جۆرە خۆی فێرکردوەو خۆی پێگەیاندووە. گوتی:

. کچەکەت مسوگەر کرد!

کوڕەکە گەڕایەوە لای کچەکەو گوتی:

. باوکت ڕازی بوو.

کچەکە چووە لای باوکی. باوکی پێی گوت:

. کچم، بە شووم دایت!

کچەکە گوتی:

ـ کەیفی خۆتە.

ڕۆژی پاشی، سولتان لە دوای کوڕەکەی ناردو پێی گوت:

ـ نەختو مارەییم بۆ بێنە.

کوڕەکە گوتی:

ـ تەنیا عەباو دار عەسای دەستم هەیەو خوای گەورەم هەیە!!

سولّتان شیرناتیو دەسەسڕو دیاری کڕیو خەڵکی بانگێشت کرد. مەلاو کوێخوایان هێناو کچەکەیان لە کوڕەکە مارە کرد. کوڕەکە چووە لای کچەکەو گوتی:

ـ نازانم چ بکەم؟! پارەی مارەییم نییە.

کچەکە بازنێکی زێڕی دایێو گوتی:

ـ ها، ئەمە ببە لە خانی چۆغان بیفرۆشە.

کوڕەکە چوو بازنەکەی پیشانی دەلاّلێکی جوولەکە دا. جوولەکە گوتی:

ـ ئەمەت لە کوێ بوو؟

گوتی:

ـ هی کچی سولّتانە.

گوتی:

ـ کچی سولّتان بۆچی بازنی خۆی دەفرۆشێ؟

گوتی:

ـ پێویستی پێیەتی.

کوڕەکە بازنەکەی بە پێنج سەد لیرە دا. پارەکەی وەرگرتو جیازو شتو مەکی نایابی کڕیو کەلو پەلەکانی ڕەوانەی ماڵی سولّتان کرد. بۆ بەیانی بووکیان هێنا. کۆمەڵێ ژنی لەگەڵدا بوو. بردیانە ژوورەوە. شەوی هەینی بوو. کوڕەکە چووە پەردە. بۆ سبەینێ سولّتان زیافەتی زەماوەندی کرد. هەموو عالەمێ داوەت کرد. سولّتان کوڕەکەی کرد بە وەزیر. کوڕەکە لە خزمەت سولّتان دەستی بە کار کرد.

ڕۆژێ، سوڵتان نەخۆش کەوت. کوڕەکە تەبیبی هێنایە سەر سوڵتان. ئەوندەی دەرمانیان کرد چاك نەبووەوە. دوای چەند ڕۆژێ کۆچی دوایی کرد. کوڕەکە دابی وەفاتی بۆ جێ بەجێ کرد. ناردی هێنایان قورئانیان لە سەر جەنازەی خوێند. تازیەی بۆ دانا و خێرو سەدەقەو سەلاتو ئیسقاتی بۆ کرد. ئینجا کوڕەکە لە جێی سوڵتان لە سەر تەخت دانیشتو هەموو خەڵکەکە دەنگیان بۆ دا. بەم جۆرە کوڕەکەو کچەکە بە خۆشیو شادی ژیان.

لای ئێوە بووینو هاتینەوە.

* * *

وەرگێڕانی تەواو

بەحرکە

٢٠١٠/١٠/٢١



